چاپی سێیەم

بەشێك لە نووسراوە زێڕینەكانی د. محەمەد عەریفی







# شەیدا



وەرگێڕانی

هێمن محەمەد عەلی

نارین




- ناوی کتێب: شەیدا.
- نووسینی: د. محەمەد عەریفی.
- وەرگێڕانی: هێمن محەمەد عەلی.
- دیزاین: قەیدار ڕەحیم.
- چاپ: سێیەم ٢٠١٢.
- ژمارەی سپاردن: ١٤١١ی ساڵی ٢٠٠٩.
- شوێنی چاپ: بەیروت - لبنان.




---


نارین

هەولێر- چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی.

تەلەفۆن: ٠٠٩٦٤٦٦٢٥١١٩٨٢

مۆبایل: ٠٠٩٦٤٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

Website: www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com


---





بەشێك لەنوسراوە زێڕینەکانی د. محەمەد عەریفی

# شەیدایەک لە ژوورەی نەشتەرگەریدا



وەرگێڕانی

هێمن محەمەد عەلی



٭ بــە هەڵــەداوان ڕایان دەکــرد.. پەشــۆکابوون.. دەیان وت: کوا پزیشــك؟ نەشــتەرەکان بێنن.. خێرا کــەن بەنجەکە بێنن.. هەموو دەیان وت: مەترســە، نەشــتەرگەرییەکی ســووکە! ئێستا دڵی شــەیدایەك لەت دەکەن، کە ئارەزوو یاری بە شــادەمارەکانی کردووە، شــەهوەت موولوولە خوێنەکانی وروووژاندووە، دونیا لە کــون و قوژبنی دڵیدا ڕەگی داکوتــاوە.. گەورەترین تارماییش کە لێی دەترسێت، دێوەزمەی مەرگە..

٭ دڵێکــی تریــش لەت دەکرێت، بەڵام ئەم دڵەیان پەیوەســتە بە خوداوە، لێوانلێوە لە خۆشەویســتی خــودا، هەموو هیوایەکی نزیکبوونە لە خودا، ڕووی داواکارییەکانی تەنها دەکاتە خودا، بە هەموو قەزاو قەدەرێکیشی ڕازییە..

٭ ئــەم کتێبە گەشــتێکە لە نێوان ئەم دوو دڵــەدا.. نیگایەکە ڕووەو جیهانــی نەخۆشــخانەکان و حاڵ و هەواڵی نەخۆشــەکان.. پێکەوە تەماشــای حاڵیان دەکەین.. لــە گەورەیی بەڵاو جیاوازی نارەحەتییەکانیان ڕادەمێنین..

٭ ئەم کتێبە چەند پەیام و وشــەیەکە بۆ نەخۆش و پزیشك و ئەو کەسانەی کە نەخۆشیان هەیە.. چەند ئاداب و ڕەوشتێکە، بە خوێنی دڵم نووســیومن و هەناســەی ڕۆحمی تێکەڵە، تەنها وەکو خۆشەویستی و میهرو سۆزێك بۆ ئێوەی ئازیز..



د. محەمەد عەریفی
arefe@gawab.com

# پێشەکی

## بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگار، درودو سڵاو بۆ سەر گیانی پێغەمبەری سەروەرو نازدار..

پاشان: لە دێر زەمانەوە زاراوەی نەخۆشی و ناخۆشی و بەڵاو موسیبەت، پێکەوە لکێنراوە.. بۆیە ئەم فەهمە دەرگای لە ڕووی ئیجابی بوونی نەخۆشیدا داخستووە.. ئەمە دەکرێت ڕاست بێت بۆ کەسانێك، کە ئایەو مایەیان تەنها ژیانی دونیا بێت، بۆیە ناکرێت هیچ ئاستەنگێك لە چێژەکانی دونیا دایانبڕێت..

بەڵام ئەگەر هاتوو پێناسی تاقیگەمان دا بە دونیاو ئادەمیزادەکانیش وەك قوتابی، ئەو کات دەکرێت نەخۆشی وەك پرسیارێکی قورسی بێتەرك هەژمار بکرێت..

بەدیهێنەری بوونەوەر خودایەکی داناو دادپەروەرە، ئاگاداریشە بە ختورەی دڵی بەندەکانی.. بۆیە لە کاروانی پێغەمبەراندا، ئەیوب ﵇ دەبینرێت، تا هیچ کات گومانی خراپ بە نەخۆشەکان نەبەین و خەیاڵمان دوور نەڕوات، چونکە ئەگەر نەخۆشی سزا بووایە، نەدەکرا پێغەمبەرێکی وەکو ئەیوب ﵇ پێوەی گیرۆدە بووایە، نەخێر.. دەبووایە دڵتەنگیەکیش ڕووی تێنەکردنایە.. بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەبێت ئەیوب ﵇ سەرمەشق و پێشەوای نەخۆشەکان بێت، چونکە ئەم جۆرە کەسانە مەدالیای ڕێزداری بە سەر سنگیاندا هەڵواسراوە..

لە ڕووی فەسلەجیشەوە، لاشە لە کاتی نەخۆشیدا لە هەموو کاتێك چوست و چالاکترە و ئامادەی پارێزگاریە، دواتریش خوێن و ماسولکەو بەشە زیان لێکەوتووەکانی تر، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرتر نۆژەن دەکرێنەوە، چاکتر لە پێش نەخۆشیەکە، هەر وەك عەرەب دەڵێت: (الضربة التي لاتسقطك تقويك). واتە: (ئەو لێدانەی کە ناتخات و لەناوت نابات، بەهێزترت دەکات)، لە نمونەی هەڵامەتێکەوە کە ساڵانە لانی کەم دوو تا سێ جار هێزەکانی بەرگری ناوخۆی لاشە ڕادەچڵەکێنێت، نەبادا پشتێن شل بن بەرامبەر بە مەترسیە دەرەکیەکان..

بە لایەکی تر، هەر کات پەروەردگار بەندەیەکی ئاڵتون ئاسا زاخاو بدات،





عەیارەکەی بەرز دەکاتەوە بۆ بیست‌و چوار، کە نەدەکرا بە بێ ئەو ئاگرو کورەی نەخۆشیە پێی بگەیشتایە..

هەر کاتێکیش نیعمەتێکی لە بەندەیەکی سەندبێتەوە، لە لایەکی ترەوە بۆی قەرەبوو کردۆتەوە، بۆیە سەیر نیە کە ببینین کەمئەندامان، یاخود خاوەنی نەخۆشیە درێژخایەنەکان، لە زۆر بواری تردا دەست ڕەنگین‌و بەهرەداربن، بە مەرجێك بێهیوا نەبوو بێتن‌و لە مەیدانێکی تردا ئەسپی خۆیان تاودابێت، تەنانەت زانایانی بەرزو پێشەوایانی کەم وێنەیان لێدەرچووە..

بۆ پزیشکانی بەڕێزیش، کە ڕێزی چارەسەری ئەم گرۆهە هێژایەیان پێ سپێردرا، دەبێت هەست بە گەورەیی‌و قورسی ئەرکی سەر شانیان بکەن، لە ڕێزگرتن‌و دڵسۆزی‌و بایەخ‌و بەدەمەوە چوونیاندا، تەنانەت فێرکردنیان لە کاروباری حەڵاڵ‌و حەرامی ئاینەکەیان، هەروەها یادی خودایان بیر بهێننەوە، هەر لە سەرەتای پشکنینیانەوە تاوەکو کۆتا ساتەکانی گیانەڵاو گیان سپاردنیان..

بۆیە ناکرێت بەندەیەکی لاوازی نەخۆش یان ساغ، بە هەڵسەنگاندنی ئەقڵی کەمتەرخەمی خۆی، هەموو حیکمەتەکانی پەروەردگاری لە لا ئاشکرا بێت، بەڵکو دەبێت ویردی سەر زمانی (لاحول ولا قوة إلا بالله) بێت، چونکە دەبێت دڵنیا بین ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ ﴿٢١٦﴾﴾ البقرة..

نوسەری کتێبی (شەیدایەك لە ژووری نەشتەرگەریدا) بە شێوەیەکی جوان‌و سەردەمیانە، توانیوویەتی ئەم بیرو بۆچوونە جوانانە دابڕژێتەوە، لەگەڵ نمونەو چیرۆکی زیندوودا، هەروەها برای وەرگێڕیش (کاك هێمن محمد)یش بە زمانێکی کوردی ڕەسەن‌و بە زاراوەی زۆر جوان‌و پڕ پێز دایڕشتۆتەوە.. داواکارم پەروەردگاریش پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە..

د. عبدالواحد محمد صالح
پسپۆری نەشتەرگەری گشتی‌و
مامۆستای کۆلیژی پزیشکی
لە زانکۆی سلێمانی





## لە سوید..

ڕۆژێك زەنگی تەلەفونەکەم لێیدا.. پەیوەندیەکە لە سویدەوە بوو..

سلام علیکم.. شێخ محمدیت؟!

وعلیکم السلام.. بەڵێ..

یاشـێخ من پزیشکمو لە خوێندنی باڵا دەخوێنم لە ( مالمۆ – سوید )و ماوەی پێنج ساڵە لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی سویددا کار دەکەم.. لێرە لەم نەخۆشخانەیەدا، کاتێك نەخۆشێك دەهێنن، کە نەخۆشـییەکی ترسناکی هەبێتو هیوای ژیانو چاکبوونەوەی کەم بێت، ئەوا ماددەیەکی ئازارشکێنو ئارام بەخشی دەدەنێ، لەگەڵ ماددەیەکی بکوژ.. نەخۆشەکە ماوەی دوو ڕۆژ ئەوپەڕی سێ ڕۆژ دەمێنێتەوەو دەمرێت.. پاشان دەدرێتەوە بە کەس‌وکاریو ئەوانیش وادەزانن مردنەکەی بە شـێوەیەکی ئاساییو سروشتی بووە، بەڵام لە ڕاستیدا کوژراوە..

وتم: پەنا بە خودا..

قسەکانی پێ بڕیمو وتی: ببورە یاشێخ پرسیارەکەم تەواو نەبووە.. یاشێخ ئەمڕۆ لە بەشی فریاکەوتنی کت‌وپڕ بووم، نەخۆشێکی موسڵمانیان هێنا، کە سویدی بە ڕەچەڵەك پاکستانی بوو.. ئەو نەخۆشە بە دەست یەکێك لە نەخۆشیە ترسناکەکانەوە ئەیناڵاندو شـوێنەواری نەخۆشیەکە بە لاشەیەوە دیاربوو.. پێش کەمێك بردیانە ئەو بەشەی کە تایبەتە بەو نەخۆشیانەو ئەو دەرمانە بکوژەیان پێدا..

چی لە سـەر من پێویسـتە یاشێخ؟ ئایا کەس‌وکاری نەخۆشـەکە ئاگادار بکەم؟ یان نا؟ باسـی چەندان کەسـی کرد، کە بەو شـێوەیە کوژرا بوون، هەروەها باسـی ئازارو نارەحەتیەکانی دەکرد، کەسـەکەش خۆی کەسێکی سـۆزدارو دڵ ناسك بوو.. چەندان ڕووداوی لەو شێوەیەی گێڕایەوە..

★ بـەڵام مـن بیرو ئەندێشـەم بۆ دوور ڕۆیشـت، بیرم کردەوە ژیان لـەلای ئەمانە چـی دەنوێنێت؟! پەرداخـی عارەقو گۆرانیو ڕابـواردنو.. کاتێکیش یەکێکیان لەبەر نەخۆشـیو ئازار توانای ئەو کارو تاوانانەی نامێنێت، وادەبینن کە پێویست ناکات ئیتر ئەو کەسە بە زیندوویی بمێنێت!! ئەی بۆچی دەژین؟!

بەڵێ.. بۆچی دەژین؟!

جیاوازی بکە لە نێوان ئەو کەسـەی دەخوات بۆئەوەی بژیت، لەگەڵ ئەو کەسـەی دەژیـت بۆئـەوەی بخوات.. نازانن کە مانەوەی ئەو کەسـە بـە زیندوویی، هەرچەندە

نەخۆش‌و پەککەوتەش بێت، خودای گەورە پلەی پێ بەرزدەکاتەوە..

هەر (سبحان الله)یەك كە دەیڵێت، خێروچاكەیە بۆی.. بە وتنی هەر (الحمدلله)یەك خێری دەســت دەكەوێت.. هەر ئازارێك كە توشــی دەبێت، تەنانــەت درکێکیش ئازاری بدات، ئەوا خودای گەورە گوناهو تاوانەكانی پێدەسڕێتەوە..

⋆ چەنــدان كەس نەخۆشــی‌و ئازار بۆیان بــووە بەو دەرگایەی کــە لێوەی دەچنە بەهەشتەوە.. تاقیكردنەوەو ناڕەحەتی‌و نەخۆشیش بەردەوام توشی ئیمانداران دەبێت، هەتا ئەو كاتەی كە خودای گەورە وازی لێدێنێ‌و بەســەر زەویدا دەڕوات‌و هیچ تاوان‌و گوناهێكی پێوە نامێنێت..

⋆ ئیمامــی ئەحمەد (ڕەحمەتی خودای لێبێــت) دەفەرموێت: ئەگەر تاقیكردنەوەو ئازارو ناڕەحەتی نەبووایە، ئەوا بە ڕەنجەڕۆیی‌و دەست بەتاڵیەوە دەچووینەوە بۆ لای پەروەردگار..

⋆ پێغەمبــەری خــودا ﷺ فەرمویەتی: (مایصیب المؤمن مــن وصبٍ ولاهمٍ ولاحزنٍ ولاأذى، حتى الشــوكة يُشــاكها، إلا كفَّرالله بها مِن خطاياهُ). رواه البخــاري. واتە: (ئیماندار توشــی هیچ ماندووبوون‌و غەم‌و خەفەت‌و ئازارێــك نابێت، هەتا دڕکێکیش بە قاچیدا بچێت، ئەوا خودا لەبری ئەم شتانە هەندێك لە گوناهەكانی دەسڕێتەوە)..

⋆ هەروەها دەفەرموێت: (ولایزال البلاء بالمؤمنِ فی أهلِهِ ومالِهِ وَوَلدِهِ، حتی يُلقی الله وماعلیه خطیئة). رواه الترمذي. واتە: (ئیماندار بە بەردەوامی لەڕووی كەس‌وكارو ماڵ‌و منداڵــەوە تاقیدەكرێتەوە، هەتا بە دیداری خودای پەروەردگار دەگات‌و هیچ گوناهێكی پێوەنامێنێ)..

⋆ هەروەها پێغەمبەری خــودا ﷺ دەفەرموێت:(يَوَدُّ الناس یومَ القیامةِ أنَّ جُلودَهُم كانــت تُقــرض بالمقاریــض في الدنیا لما یرونَ مِن ثــوابِ أهلِ البــلاء). رواه الترمذي. واتە: (خەڵكی لە ڕۆژی دوایدا كاتێك پاداشــتی ئەو كەســانە دەبینن كە بە بەڵاو ناڕەحەتی تاقیكراونەتەوە، حەزیان دەكرد پێستی لاشەیان بە مقاش لێبكرایەتەوە)..

⋆ ئەنــەس ﷺ لە پێغەمبــەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوەكە فەرمویەتــی:(إنَّ عَظُمَ الجزاءِ مــن عظُــم البلاء، وإنَّ اللهَ إذا أَحَبَ قوماً إبتلاهُمْ، فَمَن رضيَ فَلَهُ الرِّضا، ومن ســخَطَ فلهُ السخط). واتە:(گەورەیی پاداشت لە گەورەیی تاقیكردنەوەدایە، خودا كاتێك نەتەوەیەكی خۆشویســت تاقیان دەكاتەوە، ئەوەی ڕازی بێت ڕەزامەندی خودای دەســت دەكەوێت‌و ئەوەش كە توڕە بێت‌و ناڕازی بێت، ئەوا توڕەیی خودای لەسەرە)..



★ هەروەهــا لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبــەری خودا ﷺ دەفەرمویت: (عجباً لأمر المؤمــن، إن أمــره كله خير، وليس ذلك لأحد إلا للمؤمن، إن أصابته ســراء فشــكرالله فله أجر، وإن أصابته ضراء فصبر فله أجر، فكل قضاءالله للمسلم خير). رواه مسلم. واتە:(کاری ئیماندار جێگەی سەرســورمانە، هەموو کاروبارێکــی خێروچاکەیە، ئەمەش تەنها بۆ ئیمانداره، کاتێك کە توشــی خۆشــی دەبێت، سوپاســگوزاری خودا دەکاتو پاداشتی بۆ هەیە، وە کاتێکیش کە توشی ناخۆشی دەبێت ئارام دەگرێتو پاداشتی بۆ هەیە، هەموو فەرمانێکی خودا بۆ موسڵمان خێروچاکەیە).

★ پێش ئەوەی بچمە ناوەرۆكو قوڵایی ئەم کتێبەوە، بە هەموو نەخۆشــێك دەڵێم: نەخۆشــیەکەت هەرچیەك بێت، رازیبە بەو بەشــەی خودای گەورە پێی بەخشیویت.. وە بزانە ئەگەر ئارام بگریت لە ســەر نەخۆشــیو نارەحەتیەکەت، ئەوا ئەو نەخۆشیو نارەحەتیە دەبێتەهۆی سڕینەوەی گوناهەکانت.. هەروەها دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەوپایەت..

لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا، کە سەردانت دەکەن ڕەزامەندی دەربڕە، بۆئەوەی بزانن کە خــودای پەروەردگار بەندەی وای هەیە کە خودای خۆیــان خۆش دەوێت، هەروەها رازین بە بەشی خوداو ئارام دەگرن لەسەر نارەحەتیەکانیان.. خوداش لە لای دانیشتوانی ئاسمان شــانازی بەم کەسانەوە دەکاتو دەیانکات بە پێشەنگو پێشەوا بۆ خەڵکی سەر زەوی.. ئایا تۆ لەو کەسانەی؟!





## ئێمە بینیمان ئارامگر بوو..

پێغەمبەر ئەیوب ﷵ خاوەنی ماڵو سامانو منداڵو چەند خێزانێك بوو.. پیاوێك بوو خودای گەورە پلەوپایەو ڕێزی بەرز ڕاگرتو کردی بە پێغەمبەر.. لە کتوپڕێکداو لە کاتی شەوێك یان ڕۆژێکدا ماڵو منداڵو سەروەتو سامانەکەی لە دەست چوو.. تەنها یەکێك لە خێزانەکانی بۆمایەوە..

پاشــان بەڵاو تاقیکردنەوە لە سەری زیادی کردو توشی نەخۆشیەکی کوشندە بوو.. ســەری سوڕما لە نەتەوەکەی کاتێك ترسان نەخۆشیەکەی بڵاوببێتەوەو لە ناوخۆیاندا دەریــان کــرد.. لە بیاباندا و لە ڕەشــماڵێکدا ژیا.. نەخۆشــیەکەی زیــادی کرد.. بەڵاو نارەحەتیەکەی زۆر گەورە بوو.. خەڵکی وازیان لێهێناو لێی نزیك نەدەبوونەوە..

پرســیار کرا لە (موجاهید)ی شــیکەرەوەی قورئانی پیرۆز، کە ئەو نەخۆشیەی کە توشی پێغەمبەر ئەیوب هات چی بوو؟! ئایا ئاوڵە بوو؟!

وتی: نەخێر.. بەڵکو لە ئاوڵە ترســناکتر بوو.. شــتێك لە شێوەی مەمکی ئافرەت لە ســەر لاشەی دروست بوو.. پاشان کرایەوەو تەقیو کێمو زوخاوی لێهات.. چەندان ساڵ بەم نەخۆشیەوە مایەوە.. بەڵام وەکو شاخ خۆڕاگر بوو..

لە ڕۆژێکی ئارامو لەســەرخۆدا، خێزانەکەی لە لای ســەری هاوسەرەکەیەوە دەستی کرد بە گریان..

ئەیوب ﷵ پرسیاری لێکردو وتی: بۆچی دەگریت؟!چی دەتگرێنێت؟!

خێزانەکــەی وتی: بیری ئەو هەموو نازو نیعمەتو بــەرزیو بەرێزیەم کردەوە کە تیایدا بووین.. پاشان کە سەیری ئەم حاڵەی ئێستامانم کرد، گریام..

ئەیوب ﷵ پێی فەرموو: چەند ساڵ لە نازو نیعمەتدا بووین؟!

خێزانەکەی وتی: حەفتا ساڵ.. فەرموی ئەی چەند ساڵە لەم تاقیکردنەوەیەداین؟!

خێزانەکەی وتی: حەوت ساڵ..

فەرموی: دەی ئارام بگرە هەتا حەفتا ساڵیش لەم تاقیکردنەوەیەدا دەبین، هەروەك حەفتا ساڵ لە خۆشیو کامەرانیدا بووین، پاشان دڵتەنگیو نارەزایی خۆت دەربڕەو لە خودا بپاڕێوە..

کات تێپەڕی.. ئەیوب ﷵ لە ســەر جێگەو بە نەخۆشیەوە هەر ئەمدیوو ئەودیوی دەکرد.. بەڵام پاڵەوان بوو.. خۆڕاگرو بە ئارام بوو.. لە کاتی نەخۆشــیەکەیدا ئەگەر بە لایدا تێپەڕیتایە.. دەتبینی کە گۆشتی لاشەی هەڵدەوەری.. بەڵام وەك دارخورمایەك کە



له‌ سه‌ر شاخێك بێت، ئاوا خۆڕاگرو به‌هێز بوو..ڕه‌شه‌باو تۆفان نه‌یانده‌توانی هه‌ڵیكێشن.. ته‌نانه‌ت نه‌یانده‌توانی بشی جوڵێنن.. زمانێكی هه‌بوو به‌رده‌وام یادی خودای پێده‌كرد.. خاوه‌ن دڵێكی سوپاسگوزار بوو.. جه‌سته‌ی ئارامگر بوو.. چاوی به‌ ئه‌سرین بوو.. له‌ ترسی خودا ده‌گریا.. به‌رده‌وام ده‌پاڕایه‌وه‌و نه‌یده‌هێشت شه‌یتان پێی دڵخۆش بێت..

ڕۆژێك دوو پیاو به‌ نزیكیدا تێپه‌ڕین.. كاتێك ئازارو نه‌خۆشیه‌كه‌یان بینی، یه‌كێكیان به‌وی تریانی وت: گومانم وانیه‌ كه‌ خودا ئه‌یوبی توشی ئه‌م تاقیكردنه‌وه‌یه‌ كرد بێت، ته‌نها به‌هۆی سه‌رپێچیه‌كه‌وه‌ نه‌بێت، كه‌ ئێمه‌ نایزانین..

له‌م كاته‌دا ئه‌یوب عليه السلام ده‌ستی به‌رز كرده‌وه‌و فه‌رمووی: ﴿وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ الأنبياء/ ٨٣ واته‌:(یادی ئه‌یوب بكه‌ كاتێك هاناو هاواری بۆ په‌روه‌ردگاری بردو وتی: په‌روه‌ردگار به‌ ڕاستی من ئازارو ناخۆشیم توش بووه‌، تۆش له‌ هه‌موو كه‌س میهره‌بانتری)..

كاتێك په‌روه‌ردگار بینی.. سه‌یری چاوی پڕ فرمێسكی كرد.. ئه‌و چاوانه‌ی كه‌ سه‌یری حه‌رامی پێنه‌كردبوون.. ئه‌و ده‌ستانه‌ی كه‌ حه‌رامی پێ ئه‌نجام نه‌دابوون.. ئه‌و زمانه‌ی كه‌ سوپاسگوزار بوو.. ئه‌و سه‌ره‌ی كه‌ به‌رده‌وام له‌ كڕنوشدا بوو.. كاتێك پاڕانه‌وه‌ی ئه‌یوب عليه السلام ده‌رگاكانی به‌هه‌شتی له‌رزاند.. خودای گه‌وره‌ فه‌رمووی: ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ﴾ الأنبياء/ ٨٤ واته‌:(جا ئێمه‌ش نزامان گیرا كردو به‌ هاواریه‌وه‌ چووین، هه‌موو ناخۆشیو نه‌خۆشیه‌كمان له‌ كۆڵ كرده‌وه‌، هه‌موو ماڵو منداڵیمان پێبه‌خشیه‌وه‌و ئه‌وه‌نده‌ی تریش له‌گه‌ڵیاندا، ئه‌وه‌ ڕه‌حمه‌تێكی تایبه‌تی بوو له‌ لایه‌ن ئێمه‌وه‌، یاده‌وه‌ریشه‌ بۆ به‌نده‌ خوداپه‌رسته‌كان)..

هه‌روه‌ها له‌ ئایه‌تێكی تردا خودا باسی ده‌كاتو ده‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾ ص/ ٤٤ واته‌: (ئێمه‌ بینیمان به‌ ڕاستی خۆڕاگرو ئارامگر بوو، به‌نده‌یه‌كی چاكو ڕێكوپێك بوو، بێگومان ئه‌و ته‌وبه‌كاره‌و هه‌میشه‌ دڵی له‌ لای په‌روه‌ردگاره‌)..

چه‌ند جوانه‌ ئه‌گه‌ر خودای گه‌وره‌ سه‌یرت بكاتو توشی نه‌خۆشی بیتو ئارامگرو سوپاسگوزاربی.. هه‌تا ئه‌و كاته‌ی پله‌ت به‌رزده‌كاته‌وه‌و ده‌بیت به‌ باشترین به‌نده‌ی په‌روه‌ردگارت..





## عورووەی کوڕی زوبێر..

لە گەورە تابیعینەکان بوو.. کوڕی هاوەڵی بەڕێز زوبێری کوڕی عەوام بوو.. قاچێکی توشــی نەخۆشی خۆرە بوو.. ئێسقانەکانی قاچی خۆرە لێیدانو گۆشتەکەی لێدەبۆوەو هەڵدەوەری..

کاتێك کە پزیشــکەکان بینیان، بڕیاری بڕینەوەی قاچیاندا، بۆئەوەی ئەو نەخۆشیە بە لاشەیدا بڵاونەبێتەوە..

کاتێك دەســتیان کرد بە بڕینەوەی قاچی لە هۆش خۆی چوو.. قاچیان بڕیەوەو لە تەنیشــتیەوە دایاننا.. توشی خوێن بەربوونێکی زۆر بوو.. زەیتیان قرچاندەوەو پاشان دەمارەکانی قاچیان خســتە ناوی، بۆئەوەی خوێنەکەی بگیرسێتەوەو پاشان بەستیان.. لە لای سەریەوە وەستانو چاوەڕێیان دەکرد..

کاتێــك بە هۆش هاتەوە.. ســەیری قاچە بڕاوەکەی کرد، کە لە ناو تەشــتێکداو لە خوێنی خۆیدا مەلەی دەکردو وتی: خودا دەزانێت کە هەرگیز هەنگاوم پێت نەناوە بۆ ئەنجامدانی هیچ خراپەو تاوانێك..

خەڵکی دەستە دەستە دەهاتنە سەردانیو سەرەخۆشیان لێدەکرد سەبارەت بە قاچە بڕاوەکەی..

کاتێك قســەیان زۆر بــۆ کرد.. چاوەکانی بۆ ئاســمان بەرزکــردەوەو وتی: خودایە چــوار پەلت پێداوم .. دوو قاچو دوو دەســت.. پەلێکت لێســەندومەتەوەو ســیانت بۆ هێشتومەتەوە.. سوپاست دەکەم کە سێ پەلت لێنەسەندومو پەلێکم بۆ بهێڵیتەوە..

حەوت کوڕیشی هەبوو.. بە دەوریەوە بوونو خزمەتیان دەکرد.. یەکێك لە کوڕەکانی لەبەر پێویســتیەك دەچێتە تەویلەی ئەســپەکانەوەو بەدوای یەکێك لە ئەســپەکاندا تێدەپەڕێتو ئەسپەکە هەڵدەچێتو تورە دەبێتو بە سمەکانی لە کوڕەکە دەداتو بەر سکی دەکەوێتو دەیکوژێت.. خەڵکی دەیکەن بە هاوار هاوارو هەڵیدەگرن..

کاتێــك دەیشــۆنو کفنی دەکەن، باوکــی دێتو خۆی دەدات بە ســەر گۆچانەکەیدا بۆئەوەی نوێژی لەســەر بکات.. کاتێك جگەرگۆشەکەی بینی وتی: ئەی پەروەردگار من حەوت کوڕم هەیە.. یەکێکیانت بردەوەو شەشیانت بۆ هێشتومەتەوە.. سوپاست دەکەم کە شەشیانت نەبردەوەو یەکێکیانم بۆ بهێڵیتەوە..

چ ڕەزامەندیەك ئەوەندە جوانە؟! چ ئارامگریەك ئەوەندە بەرزە؟!

کەســی وا هەیە ســکی ژان دەکات، هاوار دەکاتو بێزاری دەردەبڕێت.. بەڵام ئەوەی

بیرچووە کە سەرو قاچی ساغە.. کەسی وا هەیە چاوی نەخۆشە.. بەڵام بیری چووە کە دەمو زمانو گوێی ساغە..

سوپاسی خودا بکە کە توشی نەخۆشیەکی کردویتو بە چەندان نەخۆشی تاقینەکردویتەتەوە..

سوپاسی پەروەردگارت بکە کە ئەو هەموو فەزڵو نازو نیعمەتەی بە سەردا ڕژاندویت..

سوپاسی بکە.. سوپاسی بکە.. هەرئەوەندە بەس نیەو هیوای زیاترمان بە تۆی بەڕێز هەیە.. دەمانەوێت سەر مەشقو پێشەنگو ڕێنیشاندراوو ڕێگە نیشاندەر بیت بۆ خەڵکانی تر.. کاتێك نەخۆشێکی دڵشکاو دەبینیت، دەبێت دڵی شکاوی چاك بکەیتەوەو دڵتەنگیەکەی نەهێڵی.. کاتێك کەسێك دەبینیت کە زۆر سکاڵای حاڵی خۆی دەکات، دەبێت ئامۆژگاری بکەیتو دڵی خۆش بکەیت.. تۆ ئەگەر نەخۆشیت.. ببە بە خێرو ئامۆژگاری کار بۆ خەڵکی.. پشتیوان بە خودا تۆی بەڕێز شیاوی ئەو کارەی..

## هۆکارەکانی نەخۆشی دووانن..

هاوڕێیەکم بەناوبانگە لە خوێندنی دوعاو پاڕانەوەی شەرعیدا، بە سەر ئەو کەسانەدا کە توشی نەخۆشی دەروونی بوون.. هەندێك جاریش دوعا بە سەر ئەو کەسانەشدا دەخوێنێت کە توشی چاوو جادو بوون..

ئەو هاوڕێیەم پێی وتم: ڕۆژێك یەکێك لە گەورە بازرگانەکان هات بۆ لامو سکاڵای ئازارێکی بەهێزی دەکرد لە دەستی چەپیدا.. شوێنەواری ئەو ئازارە بەهێزەی بە ڕوونی پێوە دیار بوو.. ڕوخساری چرچولۆچ ببوو.. چاوەکانی لار ببوون.. لە بەردەستمدا دانیشتو پاشان وتی: یاشێخ دوعام بە سەردا بخوێنە..

وتم: هاوارو سکاڵای چی دەکەیت؟!

وتی: ئازارێکی بەهێز.. هۆکارەکەشی نازانم.. سەردانی چەندان پزیشکم کردووەو شیکاریی زۆریشم ئەنجامداوەو هەموویان پاكو بێ کەموکوڕین.. نازانم توشی چی بووم.. بەڵکو چاو بێت.. دوعام بە سەردا خوێندو بۆی پاڕامەوە..

ڕۆژی دووەمیش هاتەوەو دوعام بە سەردا خوێند.. بۆ ڕۆژی سێیەمو چوارەمیش بە هەمان شێوە درێژەی کێشاو ئازارەکەشی هەر زیادی دەکرد..

ڕۆژێك بە سەریدا هاوارم کرد: ئەی فڵانەکەس لەوانەیە ئەو ئازارەی توشت بووە،

هۆكارەكەی دوعای ســتەم لێكراوێك بێــت كە ئازارت دابێت.. ســتەمت لێكردبێت، لە ماڵیدا یان لە دەرونیدا یان لە هەر شتێكی تردا..

ڕەنگی گۆڕاو هاواری كرد: ســتەم!! بۆچی ستەم؟! من پیاوێكی چاكم.. من.. من.. لە تورەییەكەی ئارامم كردەوەو داوای لێبوردنم لێكردو پاشان ڕۆی..

لەدوای دە ڕۆژ هاتەوە بۆ لام.. لە تەندروســتیەكی زۆر باشدا بوو.. زۆر سور بوو لە ســەر ئەوەی كە سەرم ماچ بكات.. دەیویســت دەستم ماچ بكاتو پاشان وتی: سوێند بە خودا لەدوای بەزەیی خودا تۆ هۆكاری شــیفای من بــووی.. وتم: چۆن؟! خۆ دوعاكانم ئازارەكانــی كەم نەكــردی!! وتی: لەدوای ئەوەی لە لای تۆ ڕۆیشــتم.. ئازارەكەم زیادی كردو وشەكانی تۆ لە گوێمدا دەزرنگایەوە..

بەڵێ لەوانەیە ســتەمم لە كەسێك كرد بێت.. یان ئازاری كەسێكم دابێت.. بیرم لەو كاتە كردەوە كە ویســتم كۆشكەكەم دروست بكەم.. زەویەك بە تەنیشت زەویەكەمەوە بوو.. ویستم بیكڕم بۆئەوەی بیكەم بە باخچە بۆ كۆشكەكەم.. ئەو زەویەش هی چەند بێباوكێــكو دایكیــان بوو.. داوام كرد كە دایكیان پێم بفرۆشــێت.. بەڵام ڕازی نەبوو.. وتی: ئەگەر بیفرۆشــم پارەكەی چی لێبكەم؟ واز لە زەویەكە بێنە با وەك خۆی بێت، هەتا منداڵەكانم گەورە دەبنو خۆیان شتێكی لێدەكەن.. ویستم ڕازی بكەم.. پارەی زۆرم خستە بەردەست.. ڕازی نەبوو. بەڵام زەویەكە بۆ من زۆر گرنگو بە بایەخ بوو..

وتم: ئەی چیت كرد؟

وتی: زەویەكەم لێســەند بە ڕێگەی تایبەتی خۆم.. مۆڵەتی دروستكردنی بیناشم بۆ دەرهێنا، ئەمەشیان هەر بە ڕێگەی تایبەتی خۆمو بینام تیایدا دروست كرد..

وتم: ئەی منداڵەكان؟ ئەی دایكیان؟

وتی: هەواڵم پێگەیشــت دایكیان دەهاتو ســەیری كرێكارەكانــی دەكرد كە كاریان دەكرد لە زەویەكەیداو قســەی پێدەوتنو دەگریا.. كرێكارەكانیش وایان دەزانی شێتە.. لە بیرمە كە دەســتەكانی بەرز كردەوەو دەپاڕایەوەو دەگریا، ئا لەو كاتەدا ئازارەكە لە دەستمدا دەستی پێكرد.. بە شەو خەوم لێنەدەكەوت.. بە ڕۆژ ئاسودە نەدەبووم..

وتم: باشە.. چیت بۆ كرد؟!

وتــی: چووم بــۆ لایو داوای لێبوردنم لێكردو گریام.. لە شــوێنێكی تردا زەویەكی باشتر لە زەویەكەی خۆیم پێدا.. ئەویش ڕازی بوو.. دوعای بۆ كردمو داوای لێخۆشبونی لە خودا بۆ كردم.. لە لای ئافرەتەكە هاتمە دەرەوەو پەنام بۆ خودا بردو لێی پاڕامەوە،

هەتا ئازارەکەم بەرە بەرە کەم دەبۆوەو نەما.. سوپاس بۆ خودا ئازارەکەم نەما..

چیرۆکەکـە کۆتایـی هات.. ئەمە مانای ئەوە نیە، کە هەموو نەخۆشـییەك سـزای خودایە بۆ بەندەکانی.. نەخێر.. پێغەمبەران‌و پیاوچاکانیش نەخۆش کەوتوون.. بەڵام ئەوەی من مەبەستمەو دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە، کە خودای گەورە بەهۆی نەخۆشییەوە خۆ بەگەورەزانین‌و شانازی کردنمان لە دڵدا دەردەکات..

ئەگـەر مرۆڤ هەموو شـتێکی هەبوو.. ماڵ.. لەشـی سـاغ.. منـداڵ.. ئەوا یاخی‌و سـەرکەش دەبێت.. لەخۆبایی دەبێت.. بەڵام خودای گەورە نەخۆشـی بە سـەردا زاڵ دەکات.. برسی دەکات.. بۆئەوەی بەندەکان بزانن کە توانای زەرەرو سودیان بۆ خۆشیان نیە.. توانای مردن‌و ژیان‌و کارو کۆششیشیان نیە بەبێ ویستی خودای پەروەردگار..

هەندێك جار مرۆڤ دەیەوێت لە شتێك تێبگات، بەڵام ناتوانێت‌و نەزانە.. دەیەوێت بیر لە شـتێك بکاتەوە، بەڵام بیری دەچێتەوە.. یان حەزی لە شـتێکە، بەڵام بە هیلاکی دەبات.. رقی لە شتێکە، کەچی دەبێت بە ژیان بۆی.. مرۆڤ پێویستە لە هیچ کات‌وساتێکی شـەو یان رۆژدا دڵنیا نەبێت، کە خودا ئەو شـتانەی لێناسەنێتەوە کە پێی بەخشیوە.. وەك چاوو گوێچکەو ئەندامەکانی تری جەسـتەی.. ئەی ئەگـەر خودا ژیری‌و عەقڵی لێبسەنێتەوە ئەوا حاڵی چۆن دەبێت؟! ئایا کێ لە مرۆڤ لاوازو بێدەسەڵات ترە، ئەگەر بێت‌و خۆی بناسێت؟!

لێرەوە خودای بە بەزەیی ناخۆشـی‌و نەخۆشـی بە سـەر بەندەکانیدا زاڵ دەکات، بۆئـەوەی رووبکەنە خوداو لێی نزیك ببنەوە.. نهێنـی گیرابوونی نزاو پارانەوەی ئەم کەسانەش (نەخۆش، ستەم لێکراو، رێبوار، رۆژووگران) ئەوەیە کە ئەمانە لە نارەحەتی‌و ماندوبوونـدان‌و لە خودای پەروەردگارەوە نزیکن‌و لە کەسـانی تـر زیاتر یادی خودا دەکـەن.. رێبوار غەریب‌و نامۆیـە.. رۆژووگر هیلاك‌و ماندوە.. سـتەم لێکراو زەلیل‌و داماوە.. نەخۆش ئازاری هەیەو نارەحەتە.. پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە بەزەیی بەو کەسانەدا دێتەوە کە تاقییان دەکاتەوە..

# لە نەخۆشخانەی دەروونیدا..

لە گەشتێکمدا بۆ یەکێک لە وڵاتەکان.. بۆئەوەی چەند وتارو ئامۆژگاریەك پێشکەش بکەم.. ئـــەو وڵاتەش بەناوبانگ بوو بەوەی کە نەخۆشـــخانەی زۆر گەورەی تێدایە بۆ نەخۆشییە دەروونیەکان.. ئەو نەخۆشییانەی کە خەڵکی بە (شێتی) ناوی دەبەن..

بەیانییەکـــەی دوو وتارم پێشـــکەش کرد.. هێشـــتا کاتژمێرێکی مابـــوو بۆ نوێژی نیـــوەڕۆ. عبدالعزیزم لەگەڵ بوو، کە یەکێك بوو لـــە بانگخوازە بەناوبانگو دیارەکان.. ئێمە لە ئوتومبیلدا بووین.. لام کردەوە بە لایداو وتم: مادام کاتمان بەدەستەوەیە حەز دەکەم بچم بۆ شوێنێك..

وتی: بۆ کوێ؟

وتم: نەخۆشخانەی نەخۆشییە دەروونیەکان..

پێکەنیو وتی: بۆچی؟! دەتەوێت لە عەقڵو ژیریت دڵنیا بیت!!

وتـــم: نا.. بەڵام ســـودی دەبێت بۆمـــان.. پەندو ئامۆژگاری لـــێ وەردەگرین.. زیاتر نیعمەتەکانـــی خودای پەروەردگارمان بۆ دەردەکەوێت.. عبدالعزیز بێدەنگ بوو.. بیری لە حاڵی ئەو نەخۆشانە دەکردەوە.. هەستم کرد زۆر غەمبار بوو.. چونکە کەسێکی زۆر نەرمونیانو بەسۆز بوو.. زیاد لە پێویست کەسێکی سۆزدار بوو..

چووویـــن بۆ ئـــەوێو ڕوومان کردە بینایەك کە وەك ئەشـــکەوت وا بوو.. بە درەخت چواردەور درا بوو.. وەکو شێوەی تارماییو شەبەحێك دەردەکەوت.. یەکێك لە پزیشکەکان پێشوازی لێکردین.. بەخێرهاتنی کردینو پاشان بە نەخۆشخانەکەدا گێڕاینی..

پزیشکەکە دەستی کرد بە قسەکردن دەربارەی ناڕەحەتیو ناخۆشی نەخۆشییەکان.. پاشان وتی: ئەوەی من بۆتانی باس دەکەم، وەك ئەوە نیە کە بە چاوی خۆتان ببینن.. بردمانـــی بۆ یەکێ لـــە ڕاڕەوەکان.. لێرەو لەوێ گوێ بیســـتی چەنـــدان هاوارو دەنگ بووین..

ژووری نەخۆشەکان بەمبەرو ئەوبەری ڕاڕەوەکەدا دابەشکرا بوو.. لە لای ڕاستدا بە لای ژوورێکدا ڕۆیشتین.. سەیری ژوورەکەم کردو زیاتر لە دە جێگەی چۆڵی تێدا بوو.. تەنها جێگەیەك نەبێت، پیاوێکی لە ســـەر ڕاکشـــا بوو، دەستو قاچی دەجوڵاند.. ڕووم کردە پزیشـــکەکەو لێم پرســـی: ئەمە چیە؟ وتی: شـــێتە.. توشی پەرکەمیش دێت.. لە ماوەی پێنج یان شـــەش کاتژمێرێکدا پەرکەم لێی دەدات.. وتم: لاحول ولاقوة إلاّ بالله.. لەکەیەوە بەم شێوەیەیە؟! وتی: دە ساڵ زیاترە.. هەستو سۆزم لە دەروونمدا شاردەوە..

به بێدەنگی هەنگاوم ناو ڕۆیشتم..

لەدوای چەند هەنگاوێك بە لای ژوورێکی تردا ڕۆیشتین و دەرگاکەی داخرا بوو.. له دەرگاکەیـدا کرانەوەیەك، یان پەنجەرەیەکی بچوك هەبـوو.. پیاوێك لە ژوورەوە دیار بوو.. هەندێك ئاماژەی بۆ کردین کە لێی تێنەدەگەیشـتین.. چاوم بە ژوورەکەدا گێڕا.. زەوی و دیوارەکانی ڕەنگێکی کاڵی هەبوو..

پرسیارم کرد ئەمەیان چیە؟

وتی شێتە..

وتم: ئەزانم شێتە.. ئەگەر شێت نەبوایە لێرە نەمان دەبینی.. چیرۆك و بەسەرهاتی ئەمە چیە؟

وتی: ئەم پیاوە کاتێك دیوار دەبینێ، تورە دەبێت و بە دەسـت و قاچی لە دیوارەکان دەداو جاری واش هەیە سەری بە دیوارەکاندا دەکێشێت.. ڕۆژێك پەنجەکانی دەشکێت.. ڕۆژێـك قاچـی.. ڕۆژێك سـەری.. ڕۆژێـك... نەمانتوانی چاری بکەیـن.. لەم ژوورەدا بەندمان کردووەو هەروەك دەیبینی.. زەوی و دیوارەکانیشمان بە ئیسفەنج داپۆشیوە.. چۆن دەیەوێت با بە دیوارەکاندا بکێشێت..

پاشـان پزیشـکەکە بێدەنگ بوو وە لە پێشمانەوە ڕۆیشـت.. بەڵام من و عبدالعزیز وەسـتابووین و لەبەرخۆمانەوە قسـەمان دەکردو دەمان وت: (الحمدلله الذي عافانا مما إبتلاك به)..

پاشـان ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ژوورێك زیاتر لە سـێ پیاوی تێدا بوو.. هەریەکە بە شـێوازێك.. هەبوو بانگی دەدا.. هەبوو گۆرانی دەوت.. ئەوی تریان سەمای دەکرد.. ئەوی تر هەر ئاوری دەدایەوە.. لە نێوانیاندا سـێ کەس هەبوون، کە لە سـەر کورسـی دایان نیشـاندبوون و دەست و قاچیان بەسترابوونەوەو سەیری ئەملا و ئەولایان دەکردو هەوڵی کردنەوەی خۆیان دەداو نەیان دەتوانی..

سـەرم سـورماو لە پزیشـکەکەم پرسـی: ئەمانە چین؟! بۆچی تەنها ئەم سـیانە بەسـتراونەتەوە؟! وتی: ئەمانە هەر شتێك لە پێشـیانەوە بێت لێی دەدەن.. پەنجەرەو دەرگا دەشکێنن.. لەبەرئەوە لە بەیانیەوە تا ئێوارە بەم شێوەیە دەیان بەستینەوە..

وتم: ماوەی چەنێکە وان؟

وتی: ئەوەیان دە ساڵە.. ئەوی تر حەوت ساڵە.. ئەوی تریان تازەیە پێنج ساڵە..

هەر بیرم دەکردەوە.. سـوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئێمەی پاراستووە لەوەی کە

ئەوان توشی بوون..

پرسـیارم کردو وتـم: دەرگای چوونە دەرەوە لە نەخۆشـخانە لـە کوێوەیە؟ وتی: ژوورێك ماوە.. پەندو ئامۆژگاری تازەی تێدایە.. وەرە.. دەستی گرتمو بردمی..

ئەوەی بینیم هاوشـێوەی ژوورەکانی تر بوون.. کۆمەڵە نەخۆشـێك، هەریەکەی بە شێوازێك.. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو.. پیاوێك بوو تەمەنی زیاتر لە پەنجا ساڵ دەبوو.. سەری سپی ببوو.. بە چیچکانەوە لە سەر زەوی دانیشت بوو.. خۆی کورژ کردبۆوە.. بە چاوێکی لارو بە تیلەی چاو سەیری دەکردین.. بە ترسو لەرزەوە ئاوڕی دەدایـەوە.. ئەمانە هەمووی ئاسـایی بوون.. بەڵام ئەوەی ترسـاندمیو بەلامەوە نامۆ بوو.. بە تەواوی وروژاندمی.. ئەوە بوو کە پیاوەکە ڕوتوقوت بوو.. هیچ جلوبەرگێکی لەبەردا نەبوو.. تەنانەت عەورەتیشی بە دەرەوە بوو.. ڕەنگم گۆڕا.. یەکسەر لام کردەوە بە لای پزیشـکەکەدا.. کاتێك بینیمی چاوم سور هەڵگەڕاوە.. پێی وتم: ئارام بە.. بۆت باس دەکەم بۆچی ئاوایە..

ئەم پیاوە هەرکاتێك جلوبەرگمان لەبەردەکرد، بە ددانەکانی دەیدڕاندو دەیویست فوتیان بدات.. ڕۆژانە زیاتر لە دە دەست جلوبەرگمان لەبەر دەکرد بەڵام دەیدڕاندو بەم شێوەیە دەمایەوە کە دەیبینی.. ئێمەش بەم شێوازە وازمان لێهێناوە بە هاوینو زستان.. ئەو کەسانەش کە بەدەوریەوەن شێتنو عەقڵیان پێناشکێت کە بۆچی ئاوایە..

هاتمە دەرەوە.. نەمتوانی زیاتر ئارام بگرم.. بە پزیشـکەکەم وت: دەرگاکەم پیشـان بـدە بۆئەوەی بچمـە دەرەوە.. وتی: هەندێك بەشـی تر ماوە.. وتم: ئـەوەی بینیمان بەسە..

پزیشکەکە ڕۆیشـتو منیش لە تەنیشـتیەوە.. بە بێدەنگی دەڕۆیشتین.. لەپڕ لای کـردەوە بـە لامدا، وەك ئـەوەی بیری شـتێکی بکەوێتەوە کە بیری چـوو بێتو وتی: یاشـێخ لێرە پیاوێك هەیە لە بازرگانە گەورەکان.. سـەدان ملیۆن پارەی هەیە.. توشی نەخۆشـییەکی عەقڵی بووە.. ماوەی دوو ساڵە منداڵەکانی هێناویانە بۆ ئێرە.. پیاوێکی تری لێیە ئەندازیارە لە کۆمپانیای.... کەسێکی تری لێیە کە....

پزیشکەکە دەڕۆیشتو هەر قسـەی بۆ دەکردین دەربارەی هەندێك کەس کە زەلیل بـوون لەدوای ئەوەی خاوەن پلەوپایە بوون.. هەندێکی تر لەدوای دەوڵەمەندی هەژار بوون.. دەڕۆیشـتمو هەر بیرم دەکردەوە.. پاكو بێگـەردی بۆ خودا کە ڕزقو ڕۆزی لە نێوان بەندەکانیدا دابەش کردووە..

بەوەی کە بیەوێت دەبەخشێت.. یان لێی دەگرێتەوەو پێی نابەخشێت.. هەندێك جار خودای گەورە ماڵو سەروەتو سامانو پلەوپایەو ناوبانگ بە کەسێك دەبەخشێت، بەڵام ژیریو عەقڵی لێوەردەگرێتەوە.. دەبینێت لە زۆربەی کەس دەوڵەمەندترە.. لە زۆربەی کەس جەستەی زۆر بەهێزترە، بەڵام لە نەخۆشخانەی دەروونی یان لە شێتخانە بەند کراوە.. کەسی واش هەیە پلەوپایەی بەرزی هەیە.. ماڵو سامانی زۆر.. عەقڵو ژیریەکی گەورە.. بەڵام لەشی ساغ نیەو نەخۆشە.. جاری وا هەیە کەسانێك دەبینی بیست یان سی ساڵە لە سەر جێگە کەوتووەو ماڵو سامانو پلەوپایە هیچ سودێکی پێناگەیەنن..

﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ القصص/ ٦٨ واتە:(هەر پەروەردگاری تۆیە هەرچیەکی بوێت دروستی دەکاتو هەڵیدەبژێرێت، خەڵکی ئەو دەسەڵاتەیان نیەو سەرپشك نەکراون، پاکیو بێگەردیو بڵندی بۆ خودایە لە بەرامبەر ئەو شتانەدا کە نەفامان دەیکەن بە شەریكو هاوەڵ).

بۆیە ئەو کەسانەی کە توشی تاقیکردنەوەو بەڵایەك هاتوون، زۆر بە خێرایی پێویستە بزانن کە لە لایەن پەروەردگارەوە دیاریەکیان پێبەخشراوە.. ئەگەر ماڵو سامانی زۆری پێنەبەخشیوی، بە دڵنیاییەوە لەش ساغی پێبەخشیوی.. ئەگەر لەش ساغی پێنەبەخشیوی، بە دڵنیاییەوە ژیری پێبەخشیوی..

لە هەموو نیعمەتەکانیش گەورەتر ئەوەیە کە ئیسلامەتی پێبەخشیوی.. دەی پیرۆزت بێتو خۆشی بۆ خۆت، کە لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەژیتو لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەمریت.. دەی پڕ بە دەنگو بە بەرزی هاوار بکەو بڵێ: سوپاس بۆ خودا.. سوپاس بۆ خودا..

## شیرینی پاداشت..

لە بیاباندا دەڕۆیشتمو ڕێگەم لێ ون بوو.. لە لای ڕەشماڵێکی کۆن وەستام.. سەیری ناو ڕەشماڵەکەم کرد، پیاوێك لە سەر زەویەکە زۆر بە ئارامی دانیشت بوو.. هەردوو دەستی بڕابۆوە.. چاوەکانیشی لە دەست دابوو.. هیچ کەسێکی نزیکیشی لەلا نەبوو.. لەبەرخۆیەوە بە چەند وشەیەك ورتەورتی دەکرد.. لێی نزیك بوومەوە زانیم کە دەڵێت: الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً.. واتە: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە پلەوپایەی منی بەرزکردەوە بە سەر زۆرێك لە دروست کراوەکانیدا)..

سـەرم سـوڕما کە ئەم وشانەی دەوت!! سـەیری حاڵیم کرد زۆربەی هەستەکانی لە دەسـت دابوو.. هەردوو دەسـتی بڕاونەتـەوە.. هەردوو چاوی نابینایـە.. خاوەن هیچ شـتێك نیە.. سـەیری دەوروبەریم کردو گەڕام تا کەسـێك ببینم کە خزمەتی بکات.. یان خێزانێك کە لەگەڵیدا بژێت.. کەسـم نەبینی.. بەرەو لای ڕۆیشـتمو هەنگاوم نا.. هەستی پێکردمو پرسیاری کرد کێیە؟ کێیە؟

وتم: السلام علیکم.. من پیاوێکم ڕێگەم ون کردووەو لە ڕەشماڵەکەی تۆدا ڕاوەستاوم.. ئەی تۆ کێی؟ بۆچی بە تەنها لێرە نیشتەجێی؟ کەس‌وکارت لە کوێن؟ ئەی منداڵەکانت؟ کەس‌وکارە نزیکەکانت؟

وتی: من پیاوێکی نەخۆشـم.. خەڵکی وازیان لێهێناومو زۆربەی کەس‌وکارەکانیشم مردوون..

وتم: گوێم لێت بوو هەر ئەم وشـانەت دوبارە دەکردەوە (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً).. بۆ خاتری خودا کام فەزڵو نیعمەت؟!! تۆ نابینای.. هەژاری.. دەست بڕاوی.. بە تەنهای..

وتـی: بۆت بـاس دەکەمو تێت دەگەیەنم، بـەڵام داواکاریەکم لێـت هەیە، ئایا بۆم جێبەجێ دەکەیت؟

وتم: وەڵامم بدەرەوەو بۆم باس بکە، داواکاریەکەت جێبەجێ دەکەم..

وتـی: دەمبینی خودای گـەورە بە چەندان تاقیکردنەوە تاقیکردومەتەوەو توشـی چەنـدان بـەڵاو نارەحەتی کردووم، بەڵام (الحمدلله الـذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً).. ئایـا خودا ژیریو عەقڵی پێنەبەخشـیوم؟ تێدەگەمو بیردەکەمەوە بەهۆی عەقڵو ژیریمەوە..

وتم: بەڵێ..

وتی: چەند کەس دەبینی کە شێتو کەم عەقڵن؟

وتم: زۆر زۆر..

وتی: (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً)..

وتـی: ئایا خودا بیسـتنی پێنەبەخشـیوم؟ گوێم لە دەنگی بانگ دەبێتو لە قسـە تێدەگەمو دەزانم چ لە دەوروبەرم ڕوودەدات..

وتم: بەڵێ..

وتی: چەند کەس هەیە کە کەڕنو هیچ نابیستن؟



وتم: زۆر زۆر..

وتی: (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً)..

وتی: ئایا خودا زمانی پێنەبەخشیوم؟ یادی خودای پێدەکەم.. پێویستیەکانی خۆمی پێداوا دەکەم..

وتم: بەڵێ.. وتی: چەندان کەس هەیە کە لاڵن‌و ناتوانن قسە بکەن؟

وتم: زۆر زۆر.. وتی: (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً)..

وتی: ئایا خودای پەروەردگار ئیسلامی پێنەبەخشیوم‌و منی نەگێڕاوە لە موسڵمانان؟ خـودا دەپەرسـتم‌و پاداشتیشـم لـە لای خودایە.. لە سـەر بـەڵاو ناڕەحەتیش ئارام دەگرم..

وتم: بەڵێ..

وتی: چەند کەس هەیە بت دەپەرستن؟ یان خاچ پەرستن؟ نەخۆشیشن..

بە دڵنیایشەوە ڕەنجەڕۆو زەرەرمەندی دونیاو دوارۆژیشن؟!

وتم: زۆر کەس..

وتی: (الحمدلله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلاً)..

پیاوەکە هەر نیعمەتەکانی پەروەردگاری دەژمارد کە پێی بەخشیبوو.. سەرم سوڕما لـە باوەڕی بەهێزی ئەم پیاوە.. زۆر ڕەزامەند بوو بە بەشـی خودا.. چەندان نەخۆش هەن کە بە قەد چواریەکی ئەم پیاوە نەخۆش نین.. وەك ئەو کەسانەی کە توشی شەلەل بـوون.. یان کەڕ بوون.. یان نابینا بوون.. یان ئەندامێکی جەسـتەیان لە دەسـتداوە.. ئەگـەر بێت‌و بـەو پیاوە پیرەیان بـەراورد بکەین، ئەوا وەکو لەش سـاغ وان.. لەگەڵ ئەوەشـدا بێتاقەت‌و غەمبارن‌و زۆر سـکاڵای حاڵی خۆیان دەکەن.. نائارامن.. دەگرین.. لە پاداشتی تاقیکردنەوەکانیان دڵنیا نین.. بە ڕاستی ئەگەر ناڕەحەتیەکانی ئەم پیاوە پیرە بە سەر نەتەوەیەکدا دابەش بکرایە بەشی دەکردن..

هـەر بیرم دەکردەوە، هەتا پیاوە پیرەکە وتی: ها.. داواکاریەکەمت لە بیرە؟ ئایا بۆم جێبەجێ دەکەیت؟

وتم: بەڵێ.. پێویسـتی‌و داواکاریەکەت چیە؟ کەمێك سەری داخست‌و پاشان سەری بەرزکردەوەو وتی: کەسم لەگەڵ نیە تەنها کوڕێکی چواردە ساڵانم نەبێت.. هەرئەوە کە نان‌و ئاوم پێدەدات.. دەست نوێژم بۆ دەشوات.. بە کارەکانم هەڵدەسێت.. لە بەیانیەوە ڕۆیشـتووە بۆئەوەی خواردنم بۆ پەیدا بکات، تاوەکو ئێستا نەگەڕاوەتەوە.. نازانم ماوە

یـــان مردووە.. هەروەك دەمبینی من پیاوێكی پیری نابینام‌و ناتوانم بەدوایدا بگەڕێم.. هەواڵیم بۆ بپرسەو ئاگادارم بكە..

پاشـــان هاتمە دەرەوەو نەمدەزانی بۆ چ لایەك بڕۆم‌و كوێی بۆ بگەڕێم؟! دەمویست كەسـێك ببینم‌و پرسیاری لێبكەم.. ئاوڕمدایەوە نزیك ڕەشماڵی پیاوەكە گردۆڵكەیەكم بینی.. كۆمەڵە قەلەڕەشێكی بە سەرەوە بوو، وەك ئەوەی بە سەر شتێكەوە كۆبووبێتنەوە.. لە دڵی خۆمدا وتم: ئەو باڵندانە لە سـەر لاشەیەك یان خواردنێك نەبێت كۆنابنەوە.. بە سەر گردۆڵكەكەدا سەركەوتم‌و بەرەو لای باڵندەكان ڕۆیشتم.. باڵندەكان هەڵفڕین‌و كاتێك سەیرم كرد كوڕێكی منداڵكاری لێبوو.. مرد بوو.. جەستەی پارچە پارچە ببوو.. وەك ئەوەی گورگ وای لێكردبێت‌و پاشـــان بۆ باڵندەكانی جێ هێشتبێت.. ئەوەندەی بۆ پیاوە پیرەكە غەمبارو دڵتەنگ بووم، ئەوەندە بۆ مردنی كوڕەكەی دڵتەنگ نەبووم..

لـــە گردۆڵكەكە دابەزیم‌و هەنگاوم نـــا.. لە نێوان دڵتەنگی‌و سەرسـوڕماندا بووم.. ئایـــا بڕۆم‌و پیاوە پیرەكە بەجێ بهێڵم‌و بـــە تەنیا بمێنێتەوە، یان بگەڕێمەوەو هەواڵی كوڕەكەی پێرابگەیەنم؟!

بەرەو ڕەشـــماڵی پیاوەكە چووم.. گوێم لێبوو یادی خودای دەكرد.. (سـبحان الله) و (الحمدللـــه)ی دەكرد.. ئا لەم كاتەدا ئەیوب پێغەمبەرم بیرهاتەوە.. چوومە ژوورەوە بۆ لای.. چۆن بەجێم هێشتبوو، هەر وابوو..

سـلاوم لێكرد.. ئەو هەژارە زۆر بە تاســەوە بوو، بۆ هەواڵی جگەرگۆشەكەی‌و وتی: كوا كوڕەكەم؟

وتم: سەرەتا وەڵامم بدەرەوە.. تۆ لە لای خودا خۆشەویست تری یان ئەیوب عليه السلام..

وتی: ئەیوب.. دەی بە دڵنیاییەوە تاقیكردنەوەكەی ئەیوب عليه السلام لە تاقیكردنەوەكەی تـــۆ گەورەترەو وای دابنێ كە كوڕەكەت لە لای خودایە.. لە پاڵ چیایەكدا بە مردوویی بینیم.. گورگ لاشەكەی خوارد بوو..

بە ئاهو حەســـرەتەوە هاواری دەكردو هەردەیـــوت: لاإله إلا الله.. منیش هەر ئارامم دەكردەوە.. پاشـــان هاوارەكانی زیادیان كردو لەبەر دەســـتمدا گیانی سپاردو مرد.. بە ڕاخەرەكەی ژێری دامپۆشـــی‌و چووم بۆ ئەوەی كەسێك بدۆزمەوە، تا یارمەتیم بدات‌و كارێك بكەین‌و بینێژین..

ســێ پیاوم بینی بە ســـەر ئاژەڵەكانیانەوە وەك ڕێبوار وابوون.. بانگم كردن‌و هاتن بۆ لام‌و پێم وتن: ئایا دەتانەوێت پاداشـــتتان دەســـت بكەوێت؟ لێرە پیاوێكی موسڵمان

مردووەو کەسیشی لێ نیە.. دەتوانن هاوکاری یەکتر بکەین بۆ شۆرینو بە خاك سپاردنی؟

وتیان: بەڵێ.. چوونە ڕەشماڵەکەوە بۆئەوەی لاشەکەی هەڵگرن.. کاتێك ڕوخساریان بینی هاواریان کرد: ئەبو قەلابە!! ئەبو قەلابە!! کەسێك بوو لە زانا بەناوبانگەکانیان.. کاتو زەمانو دونیا بۆ کەس هەتا سەر نامێنێو بەڵاو نارەحەتیەکان ددانی تیژیان لێی گیرکردو هەتا بە تەنهاو دوور لە خەڵکی لە ڕەشماڵێکدا ژیاو دوور لە خەڵکیش گیانی سپارد.. بە ئەرکی سەر شانمان هەستاینو ناشتمانو لەگەڵ ئەو سێ کەسەدا ڕۆیشتم بۆ شار..

کاتێك شەو خەوتم ئەبو قەلابەم بینی شێوەیەکی زۆر جوانی هەبوو.. جلوبەرگێکی سپی لەبەردابوو.. جەستەی تەواوو بێ کەموکوڕی بوو.. بە زەویەکی سەوزایی جواندا دەڕۆیشت..

وتم: ئەی ئەبو قەلابە چی وای لێکردیت کە بەم شێوەیە بتبینم؟!

وتی: خودای پەروەردگار بەهەشتی پێبەخشیمو لە بەهەشتیشدا پێیان وتم: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾ الرعد/٢٤ واتە: (سڵاوتان لێبێت بەهۆی ئارام گرتنتانەوە، کەوابوو ئای چەندە جێگەو ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد)..

## هەڵوێستەیەک لەگەڵ سەردانی نەخۆشدا..

بۆچی سەردانی نەخۆش دەکەین؟ لەبەر ماڵو سەروەتو سامانەکەی؟

نەخێر..

ئەوەی سەردانی هەژاران دەکات، لەبەر هێزو تواناکەیەتی؟

نەخێر..

ئەی ئەوەی سەردانی لاوازو لێقەوماوان دەکات، لەبەر پلەوپایەو جوانیەکەیەتی؟

نەخێر..

کەسانی دڵسۆزو خودا ویست لەبەر ئەم هۆکارانە سەردانی ئەم کەسانە ناکەن، بەڵکو لە پێناو بەدەست هێنانی پاداشتدا سەردانیان دەکەن.. بۆئەوەی بەشداری ئازارو نارەحەتی خوشكو برا موسڵمانەکانیان بکەن..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (من عاد مريضا لم يزل في خرفة الجنة، قيل يارسول الله وماخرفة الجنة؟ قال جناها). رواه مسلم. واتە: (هەرکەسێك سەردانی

نەخۆشێك بكات بەردەوام لە چنینەوەی میوەی بەهەشتدایە)..

هەروەهـا ئیمامی عەلی ﷺ لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمویەتی: (مامن مسلم يعود مسلما غدوة إلا صلى عليه سبعون الف ملك حتى يمسي، وإن عاد عشية إلا صلى عليه سـبعون الف ملك حتى يصبح، وكان لـه خريف في الجنة -الثمر المخروف أو المجتنـي-). رواه الترمذي. واتە: (هەر موسـڵمانێك لە بەیانیدا سـەردانی نەخۆشـێكی موسـڵمان بكات، ئەوا حەفتا هەزار فریشتە هەتا ئێوارە دوعای بۆ دەكەنو سەڵاواتی لە سـەر دەدەن، وە ئەگەر ئێوارە سـەردانی كرد، ئەوا حەفتا هەزار فریشتە هەتا بەیانی دوعای بۆ دەكەنو سـەڵاواتی لە سـەر دەدەن، هەروەها كۆمەڵە میومیەكی زۆریشی بۆ هەیە لە بەهەشتدا)..

هەروەها عائیشـە دایكی ئیمانداران (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: هەر كاتێك پێغەمبەری خودا بچووایە بۆ لای نەخۆشـێك یان نەخۆشەكە بهاتایە بۆ لای، ئەوا ئەم دوعایەی بۆ دەخوێند: (أذهب البأس، ربَّ الناس، إشفِ أنت الشافي، لاشفاء إلا شفاؤك شفاءً لايُغادرُ سقماً). متفق عليه.

## ئەحمەد..

ئەحمەد منداڵێكی بچوك بوو لە باوەشی باوكیدا.. هەركات بتبینیایە یان پێدەكەنی یان یاری دەكرد.. ئازارێك لە سەریدا دروست بوو.. بەڵام ئارامگر بوو.. پاشان ئازارەكەی زۆر زیادی كرد.. زۆر هەوڵیاندا چارەسـەری بكەن، بەڵام چارەسەری نەبوو.. بەرەبەرە سـەری هەڵدەئاوسـاو گەورە دەبوو.. هەتا وای لێهات لە نێوان پێسـتی سەریو كاسەی سەریدا كێمو زوخاو دەهاتە دەرەوە.. هیچ چارەسەرێكیشی نەبوو.. هەتا سەری قورس بوو.. ئاگای لە خۆی نەماو لە سـەر جێگە كـەوت لە خانوویەكی كۆندا كە دیوارەكانی قوڕ بوون، سەری خانووەكەش بە پەڵكو داری خورما داپۆشرا بوو.. چاوەڕێی مەرگیان دەكرد.. چەند ڕۆژێك تێپەڕیو ئەحمەدیش بەم حاڵەوە مایەوە.. جوڵەی نەما بوو..

لە شـەوێكی تاریكـدا كە چرایەك لە ژوورەكەدا دەسـوتاو برایەكی ئەحمەدیش لە نزیك سەری دانیشتبوو، چاودێری دەكرد..

لەپڕ دووپشـكە ڕەشـەیەك لە نێوان دارەكانی سـەرەوەدا دەرچوو.. بە دیوارەكەدا دەڕۆیشـت، هەروەك ئەوەی بەرەو لای ئەحمەد بێت.. براكەشـی سەیری دەكرد، بەڵام هیچ كارێكی نەكرد، بۆئەوەی دووپشكەكەی لێ دووربخاتەوە.. هیوای دەخواست پێوەی بداتو ئەمانیشو ئەحمەدیش بحەسێنەوەو ڕزگاریان بێت..

دووپشـــکەکە لە ئەحمەد نزیك بۆوە، هەتا گەیشتە سەر سەری ئەحمەدو پێوەیدا.. براکەی ئەحمەد دوورکەوتەوەو لە دوورەوە سەیری دەکرد.. دووپشکەکە کەمێك جوڵاو جارێکی تریش پێوەیدا.. بە شـــوێنێکی تری سەریەوە دایەوە.. کێمو زوخاوێکی زۆر لە هەموو بەشەکانی سەریەوە هاتەخوارەوە.. براکەشی بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکردو واقی وڕما بوو..

پاشان دووپشکەکە بە شوێنی خۆیدا گەڕایەوە.. براکەی بانگی باوك و براکانی کرد.. بەردەوام کێمو زوخاویان لە ســـەری دەســـری، هەتا ئاوسانەکەی سەری نەما.. ئەحمەد چاوەکانی هەڵهێناو پاشان لەگەڵیان هەڵسا..

* ئەم چیرۆکە (التنوخي) لە کتێبی (الفرج)دا باسی کردووە..

چەنـــدان ناخۆشـــی هەیە لـــە ناو خۆیدا خۆشـــی هەڵگرتـــووە.. زۆرجار پاداشـــتی کەســـێکی ئارامگر ڕزگاربوونە.. باشـــترین خوداپەرســـتیش چاوەڕێکردنی ڕزگاربوونو دەرووکردنـــەوەی خودای پەروەردگـــارە.. لەبەرئەوەی وا لە بەندەی موســـڵمان دەکات، کە دڵی پابەندو پەیوەســـت بێت بە خودای گەورەوە.. ئەمەش شـــتێکی ســـەلمێنراوەو هەست پێکراوە لە لایەن ئەو کەسانەوە کە نەخۆشن یان غەمو نارەحەتییان هەیە، بە تایبەت کاتێك کە نەخۆشـــەکە بێ هیوا دەبێت لە دروســـتکراوەکانی خوداو لە هەموو هۆکارەکان..

هەروەها خەڵکیش بێ هیوا دەبن لە چاکبوونەوەی نەخۆشەکە.. ئەو کاتەی نەخۆشەکە دڵی بە تەنها پەیوەست دەبێت بە خودای گەورەوەو دەڵێت: ئەی پەروەردگار هیوام بە کەس نەماوە تەنها تۆ نەبێت، پشـــتیوان بە خودا شیفای بۆ دێت.. پاڕانەوەو پەیوەست بوونیش تەنها بە خوداوە، لە گەورەترین هۆکاری شیفاو ڕزگاربوونی نەخۆشن..

## پلەیان پێ بەرزدەکاتەوە..

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ دەچێتە ژوورەوە بۆ لای دایکی ئیمانداران عائشـــە (خودا لێی ڕازی بێت)و دەبینێت سەری بەستووەو لە تاو ئازار دەناڵێنێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ پێی دەفەرموێت: ئەوە چیتە ئەی عائشە؟

عائشەش (خودا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: تام لێهاتووە، بەرەکەتی خودای لێنەبێتو خودا لە ناوی بدات..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: (لاتسبي الحمّى، فإنها تأكل خطايا إبن آدم كما تأكل

النار الحطب). رواه مسلم. واتە: (جنێوو قسە بە تا مەڵێن، بە دڵنیاییەوە تا هەڵەو تاوانو گوناهی مرۆڤەکان لەناودەبات هەروەك ئاگر دار لەناودەبات)..

جاری وا هەیە خودای پەروەردگــار پلەوپایەی بەندەکانی ئەوەندە بەرز دەکاتەوە، کە هەرگیز بە کردارەکانی خۆیان ئەوەندە بەرز نابێتەوە، بەڵام خودای گەورە بەهۆی تاقیکردنەوەی بەندەکانیەوە ئەو پلەوپایەیان پێدەبەخشێت..

پێغەمبــەری خودا ﷺ دەفەرموێــت: (إن الرجل ليكون له عندالله المنزلة، فما يبلغها بعمــل، فمايزالُ يبتليه بمايكرَهُ حتــى يبلُغهُ إياها). رواه إبن حبـان. واتە: (مرۆڤ لە لای خودا شوێنو پلەوپایەیەکی هەیە، کە هەرگیز بە کردەوەکانی خۆی پێی ناگات، خودای گەورە بەردەوام بە ناڕەحەتیو ناخۆشــی تاقی دەکاتەوە هەتا دەیگەیەنێت بەو شوێنو پلەوپایەیە)..

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: هیچ نەخۆشــییەکم بە قەد نەخۆشی تا لەلا خۆش نیە کە توشــم بێــت.. لەبەرئەوەی تا دەچێتە هەموو ئەندامو جومگەکانی جەســتەی مرۆڤەوە کە ٣٦٠ جومگە لە لەشی مرۆڤدا هەیە..

## پاڵەوان..

ئەبو عبدالله زۆر جیاواز نەبوو لە هاوەڵەکانی ترم، بەڵام خودا شایەدە لە هەموویان زیاتر ســور بوو لە ســەر ئەنجامدانی کاری خێر.. چەندین چالاکی بانگخوازی هەبوو.. لە دیارترینیان ئەوە بوو کە لە کاتی کارەکەیدا پێی هەڵدەســتا، کە لە پەیمانگای کەڕو لاڵەکان وەرگێڕ بوو..

ڕۆژێك پەیوەندی پێوە کردمو وتی: پێت چۆنە دوو کەس لە کەڕو لاڵەکانی پەیمانگە ئامادە بکەم، بۆئەوەی لە مزگەوتەکەتدا ئامۆژگاری نوێژخوێنەکان بکەن..

ســەرم سوڕما!! وتم: کەڕو لاڵ ئامۆژگاریو قســە بۆ کەسانێك بکەن کە دەبیستنو قسە دەکەن؟! وتی: بەڵێ.. ڕۆژی یەکشەممە دەیان هێنم..

چاوەڕێی ڕۆژی یەکشــەممەم دەکــرد.. ئارامم لێبڕا بوو.. ڕۆژی یەکشــەم هاتو لە دەرگای مزگەوت وەســتامو چاوەڕێم دەکردن.. ئەبو عبدالله بە خۆیو ســەیارەکەیەوە هــات.. لــە نزیك دەرگای مزگەوت وەســتا.. دابەزیو دوو پیاوی لەگەڵ بوو.. ســەیری یەکەمیانم کرد کەڕیشو لاڵیش بوو.. نەدەیبیستو نەقسەی دەکرد.. بەڵام چاوی ساغ بــوو.. دووەمیان کەڕ بوو.. لاڵ بوو.. کوێریش بوو.. نەدەیبیســتو نەقســەی دەکردو

نەدەیبینی!! دەستم درێژ کردو تەوقەم لەگەڵ ئەبو عبدالله کرد.. زانیم ئەوەی تەنیشتی ناوی ئەحمەدە.. بە زەردەخەنەو ڕوویەکی خۆشـــەوە سەیری دەکردمو تەوقەم لەگەڵ ئەویشدا کرد.. ئەبو عبدالله ئاماژەی بۆ نابیناکە کردو وتی: سڵاو لە فایزیش بکە.. وتم: السلام علیکم.. ئەبو عبدالله وتی: دەستی بگرە، چونکە ئەو نە گوێی لێتەو نەدەتبینێ.. دەستم خستە ناودەستیو دەستمی گوشی..

خەڵکــی چوونـــە ژوورەوە بۆ ناو مزگـــەوتو لەدوای نوێژی عیشـا ئەبو عبدالله لە ســـەر کورسیەك دانیشتو ئەحمەد لە لای ڕاستیو فایزیش لە لای چەپیەوە دانیشتن.. خەڵکەکە بە سەرســوڕمانەوە ســـەیریان دەکردو نەیان بینیبوو کە کەڕو لاڵ لە ســـەر کورسی ئامۆژگاریکار دابنیشێت..

ئەبـــو عبـــدالله لای کردەوە بە لای ئەحمـــەدداو ئاماژەی بۆ کرد.. ئەحمەد دەســـتی پێکردو دەســـتەکانی بەکاردەهێناو دەیجوڵاندن.. خەڵکیش هەر سەیریان دەکردو هیچ تێنەدەگەیشتن..

ئەبو عبـــدالله لە مایکرۆفۆنەکە نزیـــك بۆوەو وتی: ئەحمەد چیرۆکـــی گەڕانەوەو هیدایەتدانـــی خـــۆی دەگێڕێتەوەو پێتـــان دەڵێت: بە کەڕی لە دایك بووم.. لە شـــاری جەددە گەورە بووم.. کەس‌وکارم پشـــت گوێیان خســـتبوومو بە هیچ شێوەیەك ئاوڕیان لێنەدەدامـــەوە.. خەڵکیـــم دەبینـــی دەچوون بۆ مزگـــەوت، بـــەڵام نەمدەزانی بۆچی دەچوون!! هەندێك جار باوکمم دەبینی بەرماڵەکەی ڕادەخستو کڕنوشی دەبرد، بەڵام من نەمدەزانی چی دەکات.. کاتێکیش پرسیارم لە کەس‌وکارم دەکرد لێم توڕە دەبوونو وەڵامیان نەدەدامەوە..

پاشـــان ئەبو عبدالله بێدەنگ بوو، ئاوڕی بۆ لای ئەحمەد دایەوەو ئاماژەی بۆ کرد.. ئەحمـــەد بەردەوام بوو لـــە گێڕانەوەی ژیانی خۆی.. بە دەســـتەکانی ئاماژەی دەکرد.. پاشان ڕوخساری گۆڕا، وەك ئەوەی کاریگەری شتێکی لە سەر بێت.. ئەبو عبدالله سەری داخستو پاشان ئەحمەد دەستی کرد بە گریان.. بە کوڵ گریا.. گریانەکەی کاریگەریەکی زۆری لە سەر خەڵکەکە هەبوو.. بەڵام نەیاندەزانی بۆ دەگریەت..

ئەبو عبدالله وتی: ئەحمەد باســـی ئەو کاتەتان بۆ دەکات، کە چۆن خودای ناســـی.. چۆن نوێژی کرد.. بەهۆی کەســـێکەوە کە لە ســـەر شـــەقام بینیویەتیو سۆزی بۆ لای جوڵاوەو فێری کردووە..

کاتێك کە سەرەتا دەستی کردووە بە نوێژ کردن هەستی بە نزیك بوونەوەی لەگەڵ

خودادا کردووە.. هەستی کردووە لە سەر ئەم تاقیکردنەوەیەی خودای پەروەردگار پاداشتی دەداتەوە.. باسی ئەوەی کرد کە چۆن هەستی بە تامو شیرینی باوەڕ کردووە.. ئەبو عبدالله پاشماوەی چیرۆکی ئەحمەدی بۆ دەگێڕاینەوە.. زۆربەی خەڵکیش کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەحمەدەوە.. بەڵام من سەرقاڵ بووم.. جارێك سەیری ئەحمەدم دەکردو جارێك سەیری فایز.. لە دڵی خۆمدا دەموت: ئەوە ئەحمەد دەبینێو زمانی ئاماژەش دەزانێتو (ئەبو عبدالله)ش لێی تێدەگات.. ئەی چۆن لە فایز تێبگات؟! چونکە نەدەبینێو نەدەبیستێو نەقسە دەکات!!

ئەحمەد تەواو بوو.. فرمێسکەکانی دەسڕی.. ئەبو عبدالله لای کردەوە بە لای فایزدا.. لە دڵی خۆمدا وتم: ها.. دەبێت چی بکات؟!

ئەبو عبدالله بە پەنجەکانی دەستی کێشای بە ئەژنۆی فایزدا.. فایزیش وەکو تیر لە کەوان دەرچێت، باسێکی زۆر کاریگەری پێشکەش کردین..

دەزانن چۆن؟

بە قسە؟!

نەخێر.. چونکە لاڵ بوو، قسەی نەدەکرد..

ئەی بە ئاماژە؟

نەخێر.. چونکە نابینا بوو.. زمانی ئاماژەی نەدەزانی، بەڵکو بەهۆی هەستی دەست لێدانەوە، ئەبو عبدالله دەستی لەبەردەم دەستەکانی فایزدا دادەناو بەهۆی چەند دەست لێدانێکی تایبەتەوە تێیدەگەیاندو پاشان ئەبو عبدالله بۆ ئێمەی باس دەکردو تێیدەگەیاندین.. نزیکەی چارەکێکی پێچوو..

فایز کەسێکی ئارامو لەسەرخۆ بوو.. نەیدەزانی کە ئەبو عبدالله لە قسەکانی تەواو بووە یان نا.. لەبەرئەوەی نەدەیبیستو نەدەیبینی.. لەبەرئەوە کاتێك ئەبو عبدالله لە وەرگێڕانەکەی تەواو دەبوو، بە پەنجەکانی دەستی دەیکێشا بە ئەژنۆی فایزداو پاشان دەستەکانی لە نێوان دەستی فایزدا دادەناو فایزیش بە چەند دەست لێدانێك تێیدەگەیاند..

خەڵکەکە چاویان لە نێوان فایزو وەرگێڕەکەیدا دەگێڕا.. سەریان سوڕما بوو.. فایز خەڵکەکەی هان دەدا بۆئەوەی تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە.. جارێك گوێچکەی دەگرت.. جارێك زمانی.. جارێك دەستەکانی لە سەر چاوەکانی دادەنا.. فرمانی بە خەڵکەکە دەکرد کە گوێو چاوو زمانیان لە حەرام بپارێزن..

سەیری خەڵکەکەم دەکرد.. هەندێکیانم دەبینی لەبەرخۆیانەوە دەیان وت: (سبحان الله).. هەندێکی تریان بە چرپە لەگەڵ یەکدا قسەیان دەکرد.. هەندێکیشیان زۆر بە تامەزرۆوە هەستیان ڕاگرتبوو.. هەندێکیان دەگریان..

بەڵام هەستو دەروونی من زۆر دوور ڕۆیشت.. بەراوردی توانای فایزم کرد لەگەڵ توانای ئەو هەموو خەڵکەدا.. پاشان بەراوردی خزمەتکردنی فایزم کرد بۆ ئاینەکەی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا.. ئەو خەمەی کە کەسێکی نابینای کەڕو لاڵی وەك فایز داویەتی بە سەر شانیدا، لەوانەیە زۆر زیاتر بێت لە خەمی هەموو ئەو خەڵکانەی کە بۆ ئاینەکەیان هەیانە.. هەزار کەس لە خەڵکی وەك فایز نابنو فایزیش وەك هەزار کەس وایە لە خەڵکی.. کەسێك کە تواناکانی دیاریکراون، بەڵام لە پێناو ئاینەکەیدا وەکو مۆم دەسوتێت.. هەست دەکات کە سەربازێکە لە سەربازەکانی ئیسلام.. خۆی بە بەرپرس دەزانێت لە بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەدا کە یاخیو سەرپێچیکەرن.. زۆر بە گەرمی دەستەکانی دەجوڵاند.. وەك ئەوەی بڵێت:

ئەی ئەو کەسەی نوێژەکانت ناکەیت، تاکەی؟!

ئەی ئەو کەسەی بە چاوەکانت سەیری حەرام دەکەیت، تاکەی؟!

ئەی ئەو کەسەی کەوتویتەتە زەلکاوی سەرپێچیەوە، تاکەی ناگەڕێیتەوە؟!

ئەی ئەو کەسەی حەرام دەخۆیت..

ئەی ئەو کەسەی کەوتویتەتە ناو هاوەڵ پەیداکرنەوە بۆ خودای گەورەو تاكو تەنها.. هەموو ئەو کەسانە.. تاکەی؟! ئایا دوژمنایەتی دوژمنەکانمان بۆ ئاینەکەمان بەس نیە؟! ئێوەش دوژمنایەتی ئاینەکەتان دەکەن؟!

فایز دەیویست ئەوەی لە دڵیدا هەیە بیخاتە ڕوو.. خەڵکەکە زۆر پێی کاریگەر بوون.. گوێم لە گریانو دەنگی (سبحان الله) بوو.. فایزیش تەواو بوو، هەستاو ئەبو عبدالله بە دەستەکانی گرتی.. خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوەو سڵاویان لێدەکرد.. ئەویش سڵاوی لە خەڵکەکە دەکرد.. هەستم دەکرد خەڵکی لە لای فایز هەموو یەکسانن.. سڵاوی لە هەمووان دەکرد.. جیاوازی لە نێوان کەسدا نەدەکرد.. گەورەو بچوك.. بەهێزو لاواز.. دەوڵەمەندو هەژار.. هەمووان لە لای یەکسان بوون.. ئەبو عبدالله دەستی فایزی گرتو بەرەو دەرەوەی مزگەوت ڕۆیشتنو فایزو وەرگێڕەکەی لە کامەرانیەکی گەورەدا بوون..

ئای لەم دونیایە.. چەندان کەس هەن بە قەد چوار یەکی فایز لە نارەحەتیو ئازاردا

نین، بەڵام ناتوانن بە سەر خەمو نارەحەتیەکانیاندا سەرکەونو زاڵ بن.. کوان ئەو کەسانەی نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە.. ئازارو سستی گورچیلە.. شەلەل.. جەڵتە.. بۆچی خۆشی لە ژیانیان وەرناگرن؟! بۆچی خۆیان لەگەڵ ژیاندا ناگونجێنن؟! چی لەوە جوانترە کاتێك خودای گەورە بەندەیەکی توشی نارەحەتیو نەخۆشی دەکاتو پاشان سەیری دڵی بەندەکەی دەکات، دەبینێت ڕەزامەندو ئارامگرە؟! ڕۆژەکان تێپەڕینو بەردەوام وێنەی فایز لە پێش چاوم بوو..

دوای ئەوە ڕۆژێك بە ئەبو عبدالله گەیشتمو پرسیاری فایزم لێکرد.. وتی: ئەو پیاوە نابینایە شتی زۆر سەیر لە ژیانیدا هەیە.. وتم: چۆن؟! وتی: لە ژیانمدا کەسم نەبینیوە بە وێنەی فایز لە سەر نوێژەکانی سور بێت.. فایز لە ناوچەیەکی دەرەوەی شاری ڕیازە.. ژوورێکمان لە پەیمانگاکەدا بۆ نیشتەجێ بوونی ئامادەکردووە.. کارگوزارێکیشمان داناوە بۆئەوەی ئاگای لێبێتو خواردنی بۆ ئامادە بکاتو بۆ نوێژەکانی خەبەری بکاتەوەو بە پێویستیەکانی هەڵبستێت.. کارگوزارەکە لە کاتی نوێژەکاندا دێت بۆ لایو دەرگاکە دەکاتەوە، فایزیش دەست نوێژ دەگرێتو چاوەڕێی کارگوزارەکە دەکات کە دەستی بگرێتو بیبات بۆ نوێژی جەماعەت بۆ مزگەوت..

هەندێك جار کارگوزارەکە دوادەکەوت، فایز بە پەلە لە دەرگاکەی دەدا لە ترسی ئەوەی نوێژەکەی بە جەماعەت نەچێت.. لە نێوان فایزو مزگەوتەکەشدا دوو شەقامی ڕووبەڕووی یەك هەبوون.. فایز دەڕۆیشتو دەستەکانی دەجولاند، بۆئەوەی ئەگەر ئوتومبیلی لێبوو شۆفێرەکان بیبینن.. چەندان ئوتومبیلیش بەهۆی فایزەوە لێکیان دابوو..

فایز شتی سەیری هەیە.. جارێك لەدوای عەسر چووم بۆ پەیمانگە.. کۆمەڵێك لە کەرو لاڵەکان لەبەردەم دەرگای پەیمانگە چاوەڕێیان دەکردو ئاماژەیان دەکرد کە فایز گرفتێکی هەیە.. چووم بۆ لایو کاتێك بینیم، سەیرەکەم زۆر تووڕەیەو دەستەکانی دەجولێنێتو ئەوانەی دەوروبەریشی لێی تێناگەن.. کاتێك دەستم خستە ناو دەستیەوە، ناسیمیو بە توندی دەستی گرتم.. چەند دەست لێدانێکی دیاریکراوی لێدامو منیش بە هەمان شێوە دەستم لێدایەوەو ئارام بۆوە..

دەزانی چی تووڕەی کرد بوو؟! نوێژی بەیانی ئەو ڕۆژەی بە جەماعەت لەدەست چوو بوو.. دەیوت: ئەو کارگوزارە دەرکەنو بیگۆڕن بە یەکێکی تر.. منیش تووڕەییەکەیم ڕەواندەوە.. سۆزو بەزەیی خودات لێبێت ئەی فایز.. خودا بەزەیی بە ئێمەشدا بێتەوە..



## غەمی گەورە..

لــە مانگی ڕەمەزاندا بۆ گەشـــتێکی بانگخـــوازی چووم بۆ وڵاتی ســـوید.. بۆئەوەی چەند ئامۆژگاریەك پێشکەش بکەم.. کۆمەڵێك برا بانگیان کردم بۆ یەکێك لە ناوەندە ئیســـلامیەکان بۆ چاوپێکەوتنی کۆمەڵە گەنجێکی موســـڵمانی ســـویدی.. دوای نیوەڕۆ چوومە ناوەندەکەوە.. لە شێوەی بازنەیەکدا دانیشتبوون‌و چاوەڕێ بوون..

ســـەرنجم چووە ســـەر مێرد منداڵێك کە تەمەنی لە پانزە ساڵ کەمتر دەبوو.. ناوی محمد بوو.. ڕەگەزنامەی ســـویدی هەبوو.. بەڵام لە بنەڕەتدا ســـۆماڵی بوو.. لە ســـەر کورسیەکی جوڵاو دانیشتبوو.. دەستەکانی بە تەنیشتەکانی کورسیەکەوە بەسترابونەوە، لەبەرئـــەوەی بەردەوام دەســـتەکانی دەجوڵانـــدو نەیدەتوانی بە ســـەریاندا زاڵ بێت.. سەرەڕای ئەمەش لاڵیش بوو نەیدەتوانی قسە بکات.. سەریشی بە بەردەوامی دەجوڵا.. کاتێك بینینم بەزەییم پیایدا هاتەوەو سۆزم بۆی جوڵا..

لێـــی نزیك بوومەوە.. زەردەخەنە کەوتە ســـەر لێوی‌و ســـەیری دەکـــردم‌و ئەگەر بیتوانیایە لەبەرم هەڵدەستا.. سلاوم لێکرد.. لە ئینگلیزی‌و سویدی بە باشی تێدەگەیشت، بەڵام عەرەبی تێنەدەگەیشـــت.. سەرەتا باسی نەخۆشی‌و پلەوپایەو پاداشتی نەخۆشیم بۆ کرد.. سەری دەجوڵاندو بە ئاماژە بەڵێی بۆ دەکردم..

تێبینم کرد لە بەرامبەریەوە لەوحەیەکی بچوك هەیەو لاپەڕەی پێدا هەڵواسراوە کە چوارگۆشەی بچوك بچوکی تێدایە.. لە هەر چوارگۆشەیەکیشدا ڕستەیەکی مانابەخش‌و بەســـود نوسراوە، وەك: من برسیمە.. ناتوانم.. پەیوەندی بە هاوڕێکەمەوە بکە.. هتد.. سەرم لەم لاپەڕەیە سوڕما!!

یەکێك لە ئامادەبووان هەواڵی پێدام، کە ئەم کورە ئەگەر بیویستایە قسەیەك بکات، حەڵقەیەکی خڕیان دەکردە ســـەری کە شـــتێکی وەك گۆچانی پێوەبوو، کام داواکاریەی بیویســـتایە بە سەری ئەو نوســـینەیانی دەجوڵاند، بۆئەوەی تێی بگەن کە چی دەوێت، ئەمەش تاکە ڕێگە بوو بۆئەوەی تێ‌ی بگەن.. چونکە قســـەی نەدەکرد.. نەشـــیدەتوانی دەستەکانی بجوڵێنێت..

دەربارەی نیعمەتەکانی خودا لەگەڵی دوام.. مرۆڤ کاتێك ئاینی ئیســـلامی هەبێت، ئەگەر هەموو دنیاشـــی لە دەســـت بچێت زەرەری نەکردووە.. باسی ئەو پلەوپایانەم بۆ کرد کە خودا بەهۆی ئیســـلامەوە پێی بەخشـــیوین.. پاشـــان بـــۆم دەرکەوت کە محمد بانگخوازێکی زۆر گەورەیە..

چۆن؟!

تێتدەگەیەنم..

وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی سـویدی دوو کارمەندی پیاوی تەرخان کرد بوو کە لـە بەیانیاندا خزمەتی محمد بکەنو دوو کارمەندیش لـە ئێواراندا خزمەتی بکەن.. کاتێك یەکێك لەو کارمەندە ناموسـڵمانانە دەهاتن، لە ڕێگەی ئاماژەوە بەهۆی کاغەزە هەڵواسراوەکانەوە تێی دەگەیاند کە پەیوەندی بە فلانە هاوڕێمەوە بکە.. کارمەندەکەش پەیوەنـدی بە هاوڕێکەیەوە دەکرد.. محمدیـش بەهۆی کاغەزەکانەوە داوای دەکرد کە پرسیار لە هاوڕێکەی بکاتو لێی بپرسێت: ئیسلام چیە؟ هاوڕێکەشی وەڵامی دەدایەوە.. کارمەندەکەش وشەکانی لەبەردەکردو پاشان بۆ محمدی باس دەکرد..

پاشـان محمد داوای لێدەکرد کە پرسـیاری لێبکاتو پێی بڵێـت: جیاوازی لە نێوان ئیسلامو مەسیحیەتدا چیە؟ بە هەمان شێوە وەڵامی دەدایەوە.. پاشان دەیوت پرسیاری لێبکەو پێی بڵێ: لە ڕۆژی دواییدا موسڵمانو ناموسڵمان حاڵیان چۆن دەبێت؟ هاوڕێکەی وەڵامی دەدایەوەو کارمەندەکەش بۆی باس دەکرد.. هەتا کارمەندەکە لە هەموو قسەکان تێدەگەیشت..

پاشـان محمد ئاماژەی بـۆ دەکرد کە کتێبخانەکە بکاتـەوەو کارمەندەکەش کتێبی بانگخوازی بۆ لای ئیسلامی دەبینیو دەریدەهێناو دەیخوێندەوە.. بەم هۆیەشەوە کاری کردۆتە سەر چەندان کەس..

بـە ڕاسـتی محمد لە سـەر هەڵوێسـتێکی جوانە.. خـاوەن هیممەتێکـی بەرزە.. نەخۆشـییەکەی نەیتوانیوە وازی لە بانگەواز پێ بهێنێ.. بەڵکو نەیتوانیوە خۆشـیو کامەرانیشی لێ بتۆرێنێ..

ڕازی بە بەو بەشەی کە خودای گەورە پێی بەخشیوی دەبیت بە ئیماندار.. بشزانە هەموو مرۆڤێك بەرپرسـیارە لـەو توانایەی کە خودای پەروەردگار پێی بەخشـیوە.. بیسـتن.. بینین.. زمان.. ژیری.. زۆرجـار خەڵکی ئامۆژگاری لە نەخۆشـێکەوە زیاتر وەردەگرن، وەك لە کەسێکی لەش ساغ..

ئەی بۆ بانگەواز ناکەی بۆ ئاینی خودا؟! پشـت بە خودا ببەسـتەو دەستەوسـانو بێتوانا مەبە.. لەوانەشـە لێم بپرسـیو پێم بڵێی: بانگەوازی کێ بکەم؟! پێت دەڵێم: بانگەوازی پزیشـکەکان.. کارمەندەکانی نەخۆشـخانە.. بانگەوازی نەخۆشەکان.. ئەو میوانانەی کە سـەردانی نەخۆشـەکان دەکەن.. ببە بە کەسـێکی پـیرۆز.. ئامۆژگاری

خەڵکــی بکە بەوەی کە گرنگی بە نوێژەکانیان بدەن.. بە پاراســتنی چاوو داوێنیان.. بەوەی کە ســود لە کاتەکانیان وەرگرنو خۆیان بە کاری بێســودەوە خەریک نەکەنو هەروەها چەندان ئامۆژگاری تر...

## لە نەخۆشخانەدا..

★ کەســێك دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە نەخۆشــخانەیەکدا بە لای ژووری نەخۆشێکدا ڕۆیشتم، نەخۆشــەکە هاواری لەو کەسانە دەکرد کە بە بەردەم ژوورەکەدا دەڕۆیشتنو بانگی دەکردن، منیش چوومە ژوورەوە بۆ لایو دەبینم هەموو گیانی شەلەل لێیداوەو ناتوانــێ بجوڵێت.. تەختەیەك لە بەردەمیدا دانرا بوو، قورئانێکی بەکراوەیی لە ســەر بوو، ئەم نەخۆشە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك هەر ئەو دوو لاپەڕەیەی دەخوێندەوەو دوبــارەی دەکــردەوە.. لەبەرئــەوەی نەیدەتوانی لاپــەڕەی قورئانەکــە هەڵبداتەوە.. کەسێکیشــی لێنەبوو هەتا یارمەتی بدات.. کاتێك لە بەرامبەریدا ڕاوەســتام، پێی وتم: بێزەحمەت لاپەڕەکەم بۆ هەڵبدەرەوە..

لاپەڕەکەم بۆ هەڵدایەوە.. ڕوخســاری گەشــایەوە.. پاشــان ڕووی کردە قورئانەکەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی، خۆم بۆ نەگیراو دەستم کرد بە گریان.. سەرم سوڕما بوو لە بێئاگایی خۆمانو لە پەرۆشی ئەو نەخۆشە بۆ قورئان..

★ کەسێکی تر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: چووم بۆ لای پیاوێك لە یەکێك لە نەخۆشخانەکان کە بە تەواوی توشی شەلەل بوو بوو.. تەنها سەری دەجولا، کاتێك بینیم بەزەییم پێیدا هاتەوەو وتم: خۆزگەی چی دەخوازیت؟

گومانــم وا بوو خۆزگە بــە چاکبوونەوە بخوازێت!! هەروەهــا خۆزگە بخوازێت کە بتوانێت دانیشێتو هەڵبستێتو بێتو بچێت..

نەخۆشــەکە وتی: تەمەنم نزیکەی چل ســاڵەو پێنج منداڵم هەیە.. ماوەی حەوت ســاڵە لە ســەر جێگە کەوتووم.. ســوێند بە خودا خۆزگەی ئەوە ناخوازم بە پێیەکانم هەنگاو بنێم.. بینینی مناڵەکانیشم بە ئاوات ناخوازم..

بــە سەرســوڕمانەوە وتم: ئــەی خۆزگە بە چــی دەخوازیت؟! وتــی: ئاواتەخوازم نێوچەوانم بنێمە سەر زەویو کڕنوشێك بۆ خودا بەرم..

★ پزیشــکێك بۆی گێڕامەوە کە چووەتە ژووری بوژاندنەوەی دڵ بۆ لای نەخۆشێك، کە پیاوێکی پیر بوو.. لە سەر جێگایەکی سپی ڕاکشا بوو.. دەموچاوێکی نورانی هەبوو..

پزیشـــکەکە وتی: فایلەکەیم هەڵدایەوە، زانیم کە نەشـــتەرگەری دڵی بۆ کراوەو توشی خوێنبەربوون بووە.. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە خوێن لە چەند بەشێکی مێشکیدا بوەســـتێتو توشـــی بێئاگاییەکی تەواو ببێت.. لە ســـەر دەمی ئامێرێکی هەناســـەدانی دەســـتکرد دانرا بوو، کە لە خولەکێکدا نۆ جار پاڵی بە ســـیەکانیەوە دەناو هەناســـەی دەدا.. یەکێك لە کوڕەکانی لە تەنیشـــتیەوە بوو، پرسیارم دەربارەی کردو هەواڵی پێدام کە باوکی بۆ ماوەیەکی زۆرە بانگ بێژی یەکێك لە مزگەوتەکانە..

ســـەیری باوکیم کردو دەستیم جوڵاندو قسەم لەگەڵ کرد.. هیچ شتێکی نەدەزانیو ئاگای لە هیچ نەبوو.. حاڵەتەکەی ترسناك بوو.. کوڕەکەی لێی نزیك بۆوەو بە گوێیدا چرپاندی.. بەڵام هۆشی لە لای خۆی نەبوو..

کوڕەکەی دەســـتی پێکردو وتی: بابە گیان دایکمو خوشـــكو براکانم هەموو باشن.. خاڵـــم لە ســـەفەرەکەی گەڕایەوە.. بـــەردەوام کوڕەکەی قســـەی دەکـــردو باوکی هیچ نەدەجوڵا.. ئامێرەکەش وەك جاران نۆ جار هەناسەی پێدەدا..

لەپڕ کوڕەکەی وتی: بابە گیان مزگەوتەکە تاســـەی بینینت دەکات.. کەسێك نیە لە جێگەکـــەت بانگ بدات، تەنها فلانەکەس نەبێت کە ئەویش لە بانگداندا هەڵە دەکاتو شـــوێنەکەت لـــە مزگەوتدا چۆڵە.. کاتێك باســـی مزگەوتو بانگ کرا، ســـنگی پیاوەکە دەستی کرد بە جوڵەو هەناسەدان.. سەیری ئامێرەکەم کرد ئاماژەی بەوە دەکرد، کە لە خولەکێکدا هەژدە جار هەناســـەی داوە.. کوڕەکەشی بەمەی نەدەزانی.. پاشان کوڕەکەی وتـــی: ئامۆزاکـــەم ژنی مارە کرد.. براکـــەم خوێندنی تەواو کرد.. هەمدیســـان ژمارەی هەناسەکانی باوکی بووەوە بە نۆ جار..

کاتێك کە ئەمەم بینی چووم لە لای ســـەریدا وەســـتامو دەســـتو چاویم جوڵاند.. هەموو شـــتێك بێدەنگ بوو.. دەمم لە گوێی نزیك خســـتەوەو وتـــم: (الله اکبر).. (حي علی الصلاة).. (حي علی الفلاح).. تەماشای ئامێرەکەم دەکرد.. هەژدە هەناسەی تۆمار دەکرد لە یەك خولەکدا.. ســـوێند بە خودا ئێمە نەخۆشـــین نەك ئەو پیاوە.. پیاوانێك دڵیان وابەستەیە بە مزگەوتەکانەوە..

بەڵـــێ.. ﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ۙ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ ★ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ ۗ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ النـور/٣٧ – ٣٨ واتـــە: (پیاوانێك ستایشـــی خودا دەکەن لـــەو مزگەوتانەدا، کە بازرگانیو کڕینو فرۆشتن سەرگەرمیان ناکاتو غافڵ نابن لە یادی خوداو ئەنجامدانی

نوێــژەکانو بەخشــینی زەکاتو لە ڕۆژێك دەترســن کە دڵانو چــاوان تیایدا ئاوەژوو دەبن(لــە تــرسو هەیبەتی ئــەو ڕۆژە) * بە ئومێدی ئەوەن خودا بە چاکترین شــێوە پاداشــتیان بداتەوەو لە فەزڵو بەخششــی خۆی بەهرەوەریان بکات، بە ڕاســتی خودا ڕزقو ڕۆزی بێ سنور دەبەخشێت بە هەر کەس کە بیەوێتو شایستە بێت)..

ئەمە حاڵی ئەو نەخۆشانەیە.. ئەی تۆ کە لەش ساغیتو دووریت لە هەموو دەردو بەڵایەك.. تۆ لەو هەموو نازو نیعمەتەدایت، لە ســزای خودا ناترسیت، بۆ بە کردەوەی خراپ ڕووبەڕووی خودا دەبیتەوە؟!

ئایا ناترســیت سبەینێ لە بەردەمی خودای پەروەردگاردا بوەستێنرێیتو پرسیارت لێبکاتو پێت بفەرموێت: بەندەکەم لەشێکی ساغم پێنەبەخشیت؟!

ڕزقوڕۆزی زۆرم نەدایتێ؟!

تۆش دەڵێی بەڵێ پەروەردگار.. پەروەردگاریش پرسیارت لێدەکاتو پێت دەفەرموێت ئەی بۆچی بەرامبەر چاکەکانم خراپەت ئەنجامدا؟ بۆچی خۆت خســتە ژێر خەشــمو تورەبوونــم؟ کاتێك لەبەر چاوی خەڵکی تاوانەکانت دەردەخات، ئەوســاکە نەفرەت لە گوناهو تاوان دەکەیت..

ئایا باوکە ئادەم بەهۆی گوناهێکەوە لە بەهەشــت دەرنەکرا؟! ئایا گەلی نوح بەهۆی تــاوانو گوناهــەوە نەبوو کە نوقمی ژێــر ئاو بوون؟ گەلی عادو ســەمود هەر بەهۆی تاوانەوە لەناونەچوون؟!

## خالید..

د.عبدالعزیز وتی: ئەو ڕۆژە عیادەکەم، بەهۆی نەخۆشـەکانەوە زۆر جەنجاڵ بوو.. زۆربەیان لە دێهاتە دوورە دەسـتەکانەوە هات بوون.. ئەمەش بە ئاشـکرا بە شـێوەی جلوبەرگیاندا دیار بوو.. بە ڕیز دەهاتنە عەیادەکەوە..

نەخۆشـەکان جۆراوجـۆر بـوون.. حاڵەتەکانیشـیان جیـاواز بـوون.. یەکێك لە نەخۆشەکان بە ناوی خالید هاتە ژوورەوە، کە لە تەمەنی دە ساڵیدا بوو.. دوو کەسیشی لەگەڵدا بوو.. ئەم نەخۆشـە زۆر جار لەگەل پیاوێکی بە تەمەندا سەردانی دەکردم، کە گومانم وابوو باوکی بێت.. بۆئەوەی چاودێری لاوازی بیستنی بکات، کە هەر لە کاتی لە دایك بوونیەوە وابوو.. هەر سـێکیان دانیشـتنو زانیم کە یەکێکیان باوکی بوو.. ئەوی تریشـیان ئەوە بوو کە لەگەڵیدا دەهاتو بەردەوام چاودێری چارەسـەرکردنی خالیدی دەکرد لەم ماوەی چەند سـاڵەدا، کە خاڵی بوو.. خاڵی دانیشتو سەبارەت بە خالید بە درێژی دەسـتی بە قسـە کردن کرد، کە چۆن بیسـتنی باش بووە بەهۆی ئەو ئامێرەی بـۆ دواهەمین جار کە بۆیان بەکارهێناوە.. خاڵی زۆر بە دڵسـۆزیەوە قسـەی دەکردو دوبارەی دەکردەوەو دەیوت: بە یارمەتی خودا بەو ئامێرە بیستنی وەك حاڵەتی ئاسایی لێدێتەوە..

خاڵـی زۆر بەم چارەسـەرە دڵخۆش بـوو.. هەروەها زۆر بـەوەش دڵخۆش بوو کە مامۆستاکانی قوتابخانەی کەرو لاڵەکان هانی خالیدیان داوەو وتویانە کە لە خوێندندا زۆربـاش بووە.. خاڵی وتی: ئەم جارەیان باوکی خالیدیشـم هێنـاوە، بۆئەوەی بەهۆی ئامێرێکی بیستنەوە حاڵەتی بیستنی باش ببێت..

پزیشکەکە وتی: باوکیشی نابیستێت؟!

وتی: بەڵێ.. ماوەیەکی دوورو درێژە..

پزیشکەکە بە خالیدی وت: حاڵت چۆنە؟

بە خێرایی وەڵامی دایەوەو وتی: سوپاس بۆ خودا باشم..

لە قوتابخانەدا چۆنی؟

وتی: باشم..

خالید دەیبیستو قسەشی دەکرد، بەڵام قسە کردنی قورس بوو، پێویستی بە ڕاهێنان هەبوو.. زیرەکیشی لەگەڵ تەمەنیدا بەرەو پێشەوە دەچوو..

پزیشکەکە بە خاڵی وت: مادام خالید بیستنی باشە، ئەوا پێویستی بە قسە کردنی زۆر

هەیە.. پێشـــنیاری ئەوەتان بۆ دەکەم کە بە خێرایی بیگوێزنەوە بۆ قوتابخانەی ئاسایی، بۆئەوەی لە ژیانێکی تازەدا بژی.. خاڵی بێدەنگ بوو.. سەری داخستو ڕوخساری غەمبار بوو.. دڵی بریندار بوو، وەك ئەوەی بڕوا نەکات کە ئەو منداڵە ببێتە کەسێکی ئاسایی..

خاڵی وتی: پێویســـتە لە قوتابخانەی کەرو لاڵەکاندا بمێنێتەوە.. پزیشـــکەکە وتی: بۆچـــی؟! چ گرفتێکی هەیـــە لەگەڵتاندا؟! خاڵی وتی: ماڵی خالید لـــە دێهاتێکی دوورە دەســـتدا نیشـــتەجێنو توانام نیە کە لە قوتابخانەی ئاســـاییدا دایبنێـــم، لەبەرئەوەی پێویســـتە خالید پارێزگـــاری لە توانای هەڵسوکەوت کردنی لەگـــەڵ کەرو لاڵدا بکات، بۆئەوەی بتوانێت هەڵسوکـــەوت لەگەڵ کەسوکاریدا بکات، چونکە هەموو ئەندامانی ماڵەوەیان نابیستن.. باوك.. منداڵەکان..

پزیشکەکە وتی: ئەی بۆ تەنها چاودێری چارەسەری خالید دەکەن؟! خاڵی وتی: زۆر نارەحەتەو ئاســـان نیە، کە هەمووومان لە یەك کاتدا لادێکە چۆڵ بکەین.. پزیشـــکەکە وتی: خوشـــکەکانی تەمەنیان چەندە؟ خاڵی وتی: خوشـــکە گەورەکەی لە پانزە ســـاڵی تێپەڕیووە.. دووەمیشیان دوانزە ساڵێکە..

پزیشـــکەکە بە توڕەییەوە وتی: تۆ ئێستا باوکە پیرەکەییت هێناوە بۆ چارەسەرو دوو خوشکەکەشـــیت کە لە ســـەرەتای ژیانیاندان لە ماڵەوە بەجێ هێشتووە! یەکەمیان هەلی خوێندنی لە دەســـت چووەو لەوانەشـــە هەلی خێزانداریشـــی لە دەست بچێت!! دەتەوێت کچیی دووەمیش وەکو کچی یەکەمی لێبەسەر بێت؟! ئایا ئەمە تاوانو گوناه نیە؟! بەڵکو لەسەر ئەوەش ســـوری، کە خالیدیش لەو بارودۆخەدا بمێنێتەوە! خاڵی سەرەتا بەرگری لە خۆی دەکرد..

کاتێکی زۆر لەگەڵ خاڵیدا دانیشـــتمو پێم وت: ئەم بەرپرســـیاریەتیە لە ئەســـتۆی تۆدایە.. هەروەك چۆن دەتوانی خالید لە کاتی خۆیدا ئامادە بکەیت، ئەواش پێویســـتە خوشـــکەکانی ئامادەی چارەســـەر بکەیت.. خاڵی پەیمانی ئامـــادە کردنیانیداو لە کاتی چوونـــە دەرەوەدا لە بەر دەرگاکە وەســـتاو وتی: پەیمان دەدەم بە ســـەیارە بچوکەکەم هەموویان ئامادە بکەم، هەتا ئەگەر لە سەر یەکیش دایان بنێم.. بزەیەك گرتمی..

خۆزگە هەموو کەســـانێك لە ناخیاندا ئەو دڵە پاكو بێگەردەیان هەڵبگرتایە.. هەر کەسێکیش بە دەم پێویستی خوشكو برایەکی موسڵمانیەوە بچێت، ئەوا خودای گەورە بە دەم پێویســـتیەکەیەوە دێت.. خودای گەورەش لە یارمەتی بەندەکانیدایە، مادام ئەو بەندەیە لە یارمەتیدانی خوشكو برا موسڵمانەکانیدایە..

## لە نێوان پزیشکو ئافرەتی نەخۆشدا..

مافی خۆمانە کە بپرسین.. کەی پزیشکی پیاو، ئافرەتی نەخۆش چارەسەر بکات؟؟ وەڵامەکە بریتیە لەوەی: لە بنەڕەتدا پێویستە کە پزیشکی ئافرەت چارەسەری ئافرەتانو کچانی هاورەگەزی خۆی بکات، بەڵام ئەگەر پێویستی وای خواست، پزیشکی ئافرەتیش نەبوو، ئەوا دروستە پزیشکی پیاو چارەسەری ئافرەتی نەخۆش بکات..

لەم کاتەدا پێویستە ئافرەتە نەخۆشەکە بەپێی پێویست جەستەی بە دەربخات.. ئەگەر ئازارەکە لە قاچیدا بوو، دروست نیە پزیشك سەیری شوێنی تری بکات.. ئەگەر ئازارەکە لە دەستیدا بوو، ئەوا دەبێت پزیشك تەنها سەیری دەستی بکات.. بەبێ ئەوەی سەیری ڕوخسارو سەرو قژی بکات.. خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ الأحزاب/ ٥٣ واتە: (کاتێکیش داوای کەلوپەلێکتان لە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، ئا ئەو جۆرە ڕەفتارە چاکترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش)..

هەروەها نابێت لە کاتی چارەسەر کردندا پزیشکی پیاو لەگەڵ نەخۆشە ئافرەتەکەدا بە تەنها بێت، بەڵکو دەبێت کەسێکی نزیکی ئافرەتەکەی لەگەڵدا بمێنێتەوە، وەك باوك یان مێرد.. ئەگەر کەسێکی نزیکی لەگەڵدا نەبوو ئەوا دەبێت پەرستارێکی لەگەڵدا بمێنێتەوە..

زۆر سەیرە!! جارێك کەسێك خێزانەکەی دەچێتە ژوورەوە بۆ لای پزیشکی ددان، کەچی خۆی لە دەرەوە چاوەڕێی دەکات.. پێم وت: بۆ لەگەڵ خێزانەکەتدا ناچیتە ژوورەوە.. وتی: بۆئەوەی ئیسراحەتی خۆی وەربگرێت..

## لەگەڵ پزیشکدا..

کاری پزیشك کارێکی پیرۆزە.. عیسا پێغەمبەر ﵇ چارەسەری خەڵکی دەکرد.. چاوی نابیناو نەخۆشیی بەڵەکی چاك دەکردەوە.. بەڵکو بە یارمەتی خودا مردوویشی زیندوو دەکردەوە..

پزیشکی کارێکی زۆر پیرۆزو گەورەیە.. زۆر پێویستە پزیشك ئامۆژگاریکار بێتو ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکات:

١- پاراستنی نهێنیەکانی نەخۆش:

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (من ستر مسلماً ستره الله في الدنيا والأخرة). رواه مسلم.

واتە: (هەرکەسێك کەموکوری موسڵمانێك بپۆشێت، ئەوا خودای گەورە کەموکوڕیەکانی لە دونیاو قیامەتدا دەپۆشێت)..

هەندێك کەس بەهۆی کارو پیشەکانیانەوە، نهێنی کەسانی تر دەکەوێتە بەر چاویان.. وەك پزیشك، یان ئەو کەسانەی موفتیو شارەزای ئاینین، ئەم کەسانە پێویستە نهێنی خەڵکان بپارێزن، تەنها کاتێك نەبێت کە خاوەنی نهێنیەکە ڕێگە بە بڵاوبوونەوەی نهێنیەکە بدات، بەڵام دروستە لەبەر بەرژەوەندی گشتی نهێنی ئاشکرا بکرێت، وەك ئاگادارکردنەوەی لایەنی پەیوەندیدار بەوەی کە نەخۆشەکە توشی نەخۆشییەك بووە، کە تەشەنە دەکات.. یان یەکێك لە ژنو مێرد ئاگادار بکاتەوە، یان ئەوی تریان توشی نەخۆشییەکی ڕەگەزی بووبێت، وەك ئایدز..

٢- بەکارنەهێنانی کارەکەی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی:

ڕۆژێك لە دوای پێشکەش کردنی وتارو ئامۆژگاریەك، دەرچووم بڕۆم.. کەسێك هات بۆ لامو وتی: یاشێخ من بەرپرسم لە کۆمپانیایەکی گەورەی بەرهەم هێنانو دابەش کردنی دەرمان.. کۆمپانیاکە بە ملێونەها ڕیاڵ خەرج دەکات بۆ پروپاگەندەو بانگەشەی فرۆشتن.. ساڵانە ملیۆنێك ڕیاڵ لە ژێر دەستی مندا دادەنێن بۆ دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ پزیشکەکاندا..

وتم: چۆن؟! وتی: نمونەیەك لە بەرهەمەکانمان بۆ پزیشك دەنێرین.. هەروەها دیاری وەك کاتژمێر.. قەڵەمو شتی تریشی لەگەڵدا دەنێرین.. یاخود ئەرکو خەرجی ئامادە بوونی لە کۆنگرە پزیشکیەکاندا دەگرینە ئەستۆ.. یان ئەرکو خەرجی خۆییو ماڵو منداڵی بۆ گەشتوگوزار دەگرینە ئەستۆ.. هەر کاتێك ئەو نەخۆشخانەیەی کە پزیشکەکە کاری تێدا دەکات، بەرهەمەکانی ئێمەیان زیاد بەکارهێنا، ئەوا دەزانین ئەو پزیشکە زیاتر دەرمانەکانی ئێمە بۆ نەخۆشەکان دەنوسێت.. ئێمەش زیاتر دیاری بۆ دەنێرین..

بە گشتی ئێمە ڕێگای تایبەتی خۆمان هەیە بۆ ناسینی پزیشکی چالاك.. پێم وت: ئایا یارمەتیدانتان بۆ پزیشکەکان زەرەرو زیان لە نەخۆشەکان دەدات؟ وتی: پزیشکەکە کە دەرمانەکانی ئێمە بۆ نەخۆشەکان دەنوسێت، بەهۆی ئەو دیاریانەوە نرخی دەرمانەکان بەرز دەبێتەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا پزیشکەکە دەتوانێت دەرمانی کۆمپانیایەکی تری بۆ بەکاربهێنێت، کە دەرمانەکە هەمان کاریگەری هەیەو نرخەکەشی کەمترە..

هەروەها وتی: جاری وا هەیە پزیشکەکە کۆمەڵە دەرمانێك بۆ نەخۆش دەنوسێت، کە

زەرورو پێویســت نین، وەك دەرمانی هێورکەرەوەو ڤیتامینات.. لەگەڵ ئەوەی زۆربەی جار نەخۆشــەکان پێویســتیان پێیان نیە، بەڵام بۆ ئەوەیە کە ئێمەش‌و پزیشکەکەش ســودمەند بین.. وتم: قوربانیەکەش نەخۆشــی هەژارەو پارەو ســامانەکەش عارەقی نێوچەوانیەتی.. وتی: بەڵێ.. بەڵام نەخۆش چاری نیەو دەبێت دەرمان بکرێت، ئێمەش وای لێدەکەین کە تەنها لە ئێمەی بکرێت.. وتم: بەڵام پارەیەکی زیاتر دەدات بۆ کرینی دەرمانەکانتان.. کرینی هەندێك دەرمان کە پێویستیان پێیان نیەو ئێوەی پێ سودمەند دەبن.. وا نیە؟!! وتی: بەڵێ وایە..

لێرەوە دەتوانین بە ڕاشــکاوی بە خوشك‌و برا پزیشــکەکانم بڵێم: ئەو تاوانەی کە کۆمپانیاکانی دەرمان دەیکەن، پێویســتە بەدەم داواکاریەکانیانەوە نەچن‌و هاوکارییان نەکــەن، بەڵکو دەبێــت بەرەنگاریشــی ببنەوە.. هەندێــك لە کۆمپانیاکانــی دەرمان، وەسفێکی زۆر سەیرو سەمەرەی دەرمان‌و بەرهەمەکانیان دەدەن بە پزیشکەکان، بەڵام پزیشکی زیرەك زیادەڕەوی ناڕاســت‌و وەسفی زۆری دەرمانەکان کار ناکەنە سەری.. لە دڵسۆزی‌و ڕاستگۆیی پزیشك ئەوەیە کە دەرمانی باش بەکاربهێنێت بۆ نەخۆش، ئەگەر دەرمانەکە هی کۆمپانیایەکیش بێت، کە پەیوەندیشــی لەگەڵدا نەبێت.. یان ئەگەر هی ئەو کۆمپانیایەش نەبێت کە دیاری پێدەدات.. یان پەیمانی پێداوە کە گەشتی دەرەوەی وڵاتی پێبکات‌و کرێی فرۆکەکەی بۆ بدات..

جــاری وا هەیــە دەرمانێك هەیە هــی کۆمپانیایەکی جیاوازەو کاریگەری‌و باشــی دەرمانەکەش هاوشــێوەی دەرمانی کۆمپانیاکەی ترە، بەڵکو هەرزانتریشە.. ئیتر بۆچی دەرمانــە گرانەکە بۆ نەخــۆش بەکاربهێنرێت؟! ئەمە ناپاکی‌و خیانەتە لە ســپاردەو ئەمانەت، کە یەك دەرمانن‌و لە کاریگەریشیاندا هاوشێوەن..

٣-داپۆشینی عەورەت‌و جەستەو لەش‌ولاری نەخۆش:

وەك دەبینین زۆرێك لە پزیشکەکان لە کاتی چارەسەردا گرنگی دەدەن بە داپۆشینی نەخۆش.. یان لە کاتی نەشــتەرگەری‌و دواتردا.. هەندێك لە پزیشکەکان کاتێك ڕۆژانە کە بە لای نەخۆشــەکانیاندا تێدەپەڕن، کە نەخۆشــێك دەبینن خەوتووەو جەســتەی دەرکەوتــووە، بە پەلە دەچن بۆ لای‌و دایدەپۆشــن، یان کاتێك نەخۆشــێك دەبینن کە ئاگای لە خۆی نیەو لەهۆش چووەو خۆی دەجوڵێنێت‌و جەســتەی دەرکەوتووە، ئەوا بە پەلە دایدەپۆشن.. هەر کەسیش عەیب‌و کەم‌وکوری موسڵمانێك لە دونیادا داپۆشێت، ئەوا خودای گەورە لە دونیاو دوارۆژدا عەیب‌و کەم‌وکوریەکانی دادەپۆشــێت.. بەڵام لە

هەندێکی کەم لە نەخۆشخانەکاندا ئەم لایەنە پشت گوێ خراوەو پێویستە ئاگاداری پزیشکەکان بکرێتەوەو پزیشك و کارمەندانی تەندروستیش پێویستە ئامۆژگاری یەکتری بکەن..

د. حارس وتی: لە سەرەتای کارەکەمدا لە بواری پزیشکیدا، هەندێك نەشتەرگەری بچوکم ئەنجام دەدا.. لە ژووری نەشتەرگەری نەخۆش لە دوای بێ هۆش کردن بە فۆناغی ئامادە کردندا تێدەپەڕێت، بەڵام من ناچوومە ژووری نەشتەرگەری هەتا نەخۆشەکە بە تەواوی ئامادە نەکرایە.. کاتێك دەچووم کە نەخۆشەکە تەنها شوێنی ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکەی بە دەرەوە بووایە..

جارێکیان لە کاتی ئامادەکردنی نەخۆشدا چوومە ژوورەوە، گەنجێکم بینی کە بەنج کرا بوو.. لە سەر مێزی نەشتەرگەری بوو، بە تەواوی جل و بەرگی لەبەرداکەنرا بوو!! ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو پەرستارانەی کە تایبەت بوون بە دانانی جل و بەرگی نەخۆش لە پێش نەشتەرگەریدا، کاری خۆیان ئەنجام دابوو، بەڵام ئەو پەرستارانەی کە تایبەت بوون بە لەبەرکردنەوەی جل و بەرگی نەخۆش، جل و بەرگەکەیان لەبەرنەکردبۆوە..

جاری وا هەیە پزیشك خەریکی تاقیکردنەوەی ئامێرەکانی نەشتەرگەریە و ئەم کارە دەبینێت، کەچی پشت گوێی دەخات، وەك ئەوەی پەیوەندی بەوەوە نەبێت!! پاشان ئەم کارە بەرەو خراپی دەچوو بە تایبەت لە نەشتەرگەری ناو سك بینی و قەستەرەی بۆریەکانی میزەڕۆدا.. ئاسانیش نیە وردەکاریەکان باس بکەم لەبەر ڕێزی خوێنەران.. ماوەیەکی زۆریش بە دڵتەنگی مامەوە..

د. سارەش وتی: لە ژووری نەشتەرگەریدا ئافرەت بە رووتی لە سەر مێزی نەشتەرگەری دادەنرێت و پزیشکی بەنج و قوتابی و پزیشکی تریشی لێیە!! پێیان دەڵێم: داپۆشن.. سەرۆکی دەستە پزیشکیەکان دەڵێت: ئێمە هەموومان پزیشکین.. لە دڵی خۆمدا دەموت: باشە، بەڵام کە ئێمە پزیشکین دەبێت سوکایەتی بە جەستەو عەورەتی خەڵکی بکەین؟! من دڵنیام ئەگەر خێزانەکەی خۆی نەخۆش بووایە، ڕێگەی بە کەس نەدەدا بەو شێوەیە بیبینن.. من وا گومان دەبەم ئەم حاڵەتانە کەم و دەگمەنن.. بۆیەش باسم کرد، بۆئەوەی خوشك و برا پزیشك و پەرستارەکانی لێ ئاگاداربکەمەوە..

٤- خۆ بە کەم زانین لەبەر خوداو نەرم و نیانی لە هەڵسوکەوتدا..

٥- پێویستە پزیشك بەپێی توانا شارەزا بێت لەو بنەما شەرعیانەی کە پەیوەندیان بە چارەسەرو نەخۆشەوە هەیە:

به لایەنی کەمەوە پزیشــك پێویستە شارەزای زانستی فیقهو بنەماکانی خوداپەرستیو عیبادات بێت.. لەبەرئەوەی خەڵکی ئەو پرسیارە تەندروستیانە دەکەن کە پەیوەندیان بە شەرعو عیبادەتەوە هەیە.. بە تایبەت چۆنیەتی دەست نوێژو نوێژ کردنی نەخۆش..

هەندێك نەخۆش هەن، زۆر جار لە کاتی نەخۆشیدا نوێژ ناکەن.. لەبەرئەوە نا کە ڕقیان لــە نوێژ بێت، بەڵکو لەبەرئەوەی چۆنیەتی دەســت نوێژ گرتنــی نەخۆش نازانن، هەروەها نازانن لە کاتی نەخۆشیدا چۆن نوێژەکانیان ئەنجام بدەن..

کاتێك ئامۆژگاری هەندێك لە نەخۆشــەکانمان دەکرد دەیانوت: چۆن نوێژ بکەم لە کاتێکــدا جلو بەرگەکانــم پاك نین!! چۆن نوێژ بکەم کــە قەرەوێڵەکەم ڕووەو قیبلە نەبێت؟! کێ بەرپرسە لەو کەسانە؟! پزیشکی سەرکەوتوو ئەوەیە، کە بنەماکانی پاکیو پیسیو نوێژو دەست نوێژی نەخۆش فێر ببێتو نەخۆشەکانیش فێر بکات..

هەروەهــا کۆکردنــەوەی نوێژ لە کاتی پێویســتیدا.. کەی نەخــۆش نوێژەکانی کۆ بکاتەوەو کەی کۆیان نەکاتەوە؟

هەروەها بنەماکانی تەیەموم کردنو بەخەبەر هێنانەوەی نەخۆش بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی.. ئەم کارانەش ئاســانە، ئەگەر پزیشك ئەو کتێبانەی لا بێت کە تایبەتن بــە کۆکردنەوەی بنەما شــەرعیو پزیشــکیەکانی تایبەت بە نەخۆش.. دەشــتوانرێت پزیشكو نەخۆش زۆر بە ئاسانی سودی لێ وەربگرن..

٦-شایەتیدانی درۆ:

زۆر جار لایەنە حوکمیەکان پشت بە ڕاپۆرتی پزیشکی دەبەستن دەربارەی سەلماندن یان نەفی کردنی نەخۆشــییەك بۆ پێدانی مۆڵەت بۆ فەرمانبەرەکانیان، یان خانەنشین کردنیان، یان پێدانی یارمەتیو هەروەها.......هتد..

لە سەر پزیشك پێویستە ڕاپۆرتەکەی لە سەر بنەمای ڕاستیو ڕاستگۆیی بنووسێت.. پێویســتە نزیکیو خزمایەتیو دۆستایەتیو خۆشەویســتی وای لێنەکات، کە ڕاپۆرتو شایەدی ناڕاست بدات..

پێغەمبــەری خــودا ﷺ دەفەرموێت: (ألا انبئكم بأكبر الكبائر؟ قالوا: بلى يارســول الله، قال: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، ثم صمت مَلياً، وقال: ألا وقول الزور.. ألا وقول الزور.. ألا وقول الزور.. فمازال يُكررها حتى حسَــبوهُ لايســكت). رواه الشيخان. واتە: (ئایا ئاگادارتان بکەم لە گەورەترین تاوانەکان؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، فەرموی: هــاوەڵ پەیداکردن بۆ خودا، وە ئازاردانی دایكو باوك، پاشــان ماوەیەکی زۆر بێدەنگ

بوو، وە فەرموی: شـایەتیدانی درۆ.. شـایەتیدانی درۆ.. شـایەتیدانی درۆ.. بەردەوام دوبارەی دەکردەوە هەتا گومانمان برد کە وازناهێنێتو بێدەنگ نابێت)..

٧-رەخنە نەگرتن لە پزیشکانی تر لە بەرامبەر نەخۆشدا:

زۆر جـار پزیشـك ئەوەندە هەوڵ دەداتو هیلاكو مانـدوو دەبێت، هەتا دەگات بە شـارەزاییەکی زۆر لە کارەکەیدا.. لەگەڵ ئەمەشـدا پێویسـت ناکات کە زۆر باسی کارە جوانو باشـەکانی خۆی بکات، یان باسی وردیو زیرەکی خۆی بکات.. لە بەرامبەریشدا لە کارو پیشـەی پزیشـکە هاورێکانی کەم بکاتەوە، بۆ راکێشانی نەخۆشی پزیشکەکانی تر.. نەخۆشیش دوو جۆرە، نەخۆشی دڵو دەروون (دەروونی)، وە نەخۆشی جەستەیی.. چەند جوانو پیرۆزە ئەگەر پزیشك بتوانێت چارەسەری هەر دوو جۆرە نەخۆشییەکەی نەخۆش بکات!!

## لە سەر جێگەی مردن..

پزیشـك پێویستە چی بکات لەو کاتەی کە لای نەخۆشێکەو نەخۆشەکەش خەریکە دەمرێت؟

ئەگەر نەخۆشەکە نیشانەکانی مردنی تێدا دەرکەوتو مردنی نزیك بۆوە، سوننەتە کە شـایەتمانی پێ بهێنرێتو هەولی لەگەڵدا بدرێـت، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێـت: (لقنوا موتاکم لاإله إلا الله). رواه مسـلم. واتە: (لە کاتی سـەرەمەرگدا مردووەکانتان رابهێنن بە وتنی لاإله إلا الله )..

ئەمەش دەبێت بە نەرمو نیانیو لەسەرخۆیی بێت.. نابێت بڵێیت: ئەی فلانە کەس مردنـت نزیك بۆتەوە، شـایەتمان بێنە.. نەخێر.. بەڵکو دەبێـت یادی خودا بکەیتو شـایەتمان بهێنیت، بۆئەوەی گوێی لێـت بێتو ئەویش یادی خودا بکاتو شـایەتمان بهێنێت..

بەڵێ.. ئەگەر بێباوەریش بوو لێی بێ هێوا مەبەو بە راشـکاوی پێی بڵێ، بڵێ: لاإله إلا الله.. لەبەرئـەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ کاتێـك خەریك بوو کە ئەبو تالیبی مامی بمرێت، پێی وت: ئەی مامە بڵێ لاإله إلا الله.. هەتاوەکو بەو وشـەیە لە لای خودا تکات بۆ بکەمو بیکەم بە بەڵگەیەك بۆت..

هەروەها کاتێك مێردمنداڵێکی جولەکە لە سەرەمەرگدا بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی دەڵێت، بڵێ: لاإله إلا الله.. هەر دوبارەی دەکردەوە هەتا شـایەتمانی هێنا.. پاشـان

مرد.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: سوپاس بۆ خودای پەروەردگار کە لە ئاگر ڕزگاری کرد..

هەروەها ئەو کەسەش کە لە سەرەمەرگدایە پێویستە گومانی باش بە پەروەردگاری بەرێت‌و دڵ‌و دەرونی ئاسودە بێت.. هەندێك جار ئەو کەسە بیرو هۆشی لە لای منداڵەکانیەتی، یان لە لای قەرزەکانیەتی، یان بیرلە هەژاری‌و نەبوونی دەکاتەوە.. بێگومان پێویستە بیر لەوە بکاتەوە، کە تەنها خودا ڕزق‌و ڕۆزی بەخشە‌و هەرگیز دروستکراوەکانی لەبیر ناچێت، بۆئەوەی بە دڵنیایی‌و ئاسودەیی گیانی بسپێرێت..

## پزیشك‌و بانگەواز..

ڕاپۆرتێکم سەبارەت بە گاور کردن خوێندەوە.. ڕاپۆرتێکی ڕێك‌وپێك‌و بەرنامە داڕێژراو بوو، سەبارەت بە هۆکارەکانی بە گاور کردن‌و سود بینین لە حاڵەتی هەژاری‌و نەداری‌و پێویستی خەڵکی..

لە ڕاپۆرتەکەدا دەستەواژەیەکی گرنگی یەکێك لە ڕێکخراوە پزیشکیە گاورەکانی تێدا بوو کە دەڵێت: (لە هەر شوێنێك مرۆڤ هەبوو، ئازار هەیە.. کاتێك کە ئازار هەبوو، پێویستی بوون بە پزیشك سەر هەڵدەدات.. کاتێکیش پێویستی بە پزیشك دێتە ئاراوە، ئا لەوێدا هەلێکی گونجاوە بۆ بە گاور کردنی خەڵکی)..

(بات ڕۆبەرت سۆن) پاڵێوراو بوو بۆ هەڵبژاردنەکانی ئەمەریکا بۆ ساڵی ١٩٨٧، کە سەرۆکی یەکێك لە ڕێکخراوە بە گاور کردنەکان بوون.. هەستا بە ئامادەکردنی فرۆکەیەك لە جۆری (لۆکهیدی L50 – 1011) و گۆڕینی بۆ فرۆکەیەکی نەخۆشخانەیی گەورە بە بڕی تێچوونی بیست‌و پێنج ملیۆن دۆلار، بە هەموو پێویستیەکی نەشتەرگەری‌و چارەسەرەوە.. بە شێوەیەك بە زۆر ناوچەی جیهاندا دەسورایەوەو لە هەندێك ناوچەی دیاریکراودا بۆ ماوەی هەفتەیەك تا دە ڕۆژ دەمایەوەو خزمەتگوزاریەکانی بێ بەرامبەر پێشکەش دەکرد.. بەڵام حاڵەتی ڕاستەقینەی ئەم کارە بێ بەرامبەرە، بە گاور کردنی خەڵکی بوو!!

لە پێش چارەسەردا پرسیاریان دەربارەی ئاینی نەخۆش دەکرد، پاشان نزیکەی دە خولەك دەربارەی عیسا پێغەمبەر ﵇‌و ئاینی مەسیحی قسەی بۆ دەکەن.. پاشان هەندێك کتێب‌و بڵاوکراوەی پێدەدەن‌و داوای لێدەکەن بیان خوێنێتەوەو دوای چەند ڕۆژێك لە شوێنێکی دیاریکراودا ئامادە بێت..

سەیرە!! فرۆکەیەك لە شێوەی نەخۆشخانەدا بەکاربهێنرێت بۆ بە گاورکردنی خەڵکی.. ئەی ئوممەتی ملیارێك موسڵمان، ئایا ئێوە توانای کارێکی واتان نیە؟!!

★ ڕەحمەتی خودا لە ئیمامی شافیعی بێت، کە دەفەرموێت: (موسڵمانان سێ یەکی زانستیان لە دەستداو دایان بە گاورو جولەکەو ئەوانیان کرد بە جێگری خۆیان)..

بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت لە بواری پزیشکیدا بانگەواز بکرێت بۆ بەرنامەکەی خوداو نەخۆشخانەکانیش زەویەکی زۆر بە پیتن بۆ بانگەواز، لەبەرئەوەی پزیشك پەیوەندیەکی پتەوو بنەڕەتی لەگەڵ خەڵکیدا هەیە..هیچ کەسێك نیە نەخۆش نەکەوێتو پێویستی بە پزیشك نەبێت..

بۆیە دەبینین خەڵکی بە گەرموگوڕیەوە پەلە دەکەن لە چوونیان بۆ لای پزیشك بە هیوای شیفاو چاك بوونەوە.. لەو پێناوەشدا پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن.. هەوڵیش دەدەن کە پەیوەندیەکی پتەو لەگەڵ پزیشکدا دروست بکەن، چونکە دەزانن کە پێویستیان پێیەتی..

دەی کەواتە پێویستە پزیشك سود لەم هەلە وەربگرێت، بۆ ئامۆژگاری کردنی ئافرەتێك تا ببێت بە بالاپۆش.. یان ئامۆژگاری کەسێك بکات، کە دڵی باوكو دایکی دەرەنجێنێت.. یان کەسێك نوێژ ناکات.. یان کەسێك کە کەوتووەتە نێو زەلکاوی تاوانو گوناهەوە.. ئامۆژگاری کردنی نەخۆش زۆر گرنگە، بە تایبەت لە بواری بیرو باوەڕدا.. لە نوشتەو دوعادا.. نەخۆشیش زۆر جار لەبەرئەوەی لە حاڵەتێکی لاوازدایە، بە گوێی پزیشك دەکاتو باوەڕی پێدەکات.. لەوانەیە بەهۆی تەنها وشەیەکەوە کەسێك لە تاریکایی تاوانەوە بەرێت بۆ ڕوناکی ئیمان..

## ڕێگەکانی بانگەواز کردن،

## کە پزیشک دەتوانێت پشتیان پێ ببەستێت..

١- دابەش کردنو بڵاوکردنەوەی کاسێتو بڵاوکراوەی بەسود.. هەروەها هەڵواسینو نوسـراوی بەسـود بە دیوارەکانـەوە، وەك گۆڤارو پۆسـتەری دیوار، کـە دەتوانرێت بابەتەکانیشـی جۆراوجۆر بێت، وەك بنەماکانی دەست نوێژو پاكو خاوێنیو نوێژی نەخۆش، هەروەها پاڕانەوەو ئارامگرتن لە سەر ناخۆشیو نارەحەتی..

٢- دانانـی کتێبخانەیەکی ئیسـلامی بچوك لە بوارەکانـی خوێندنەوەو گوێگرتنو بینین، وەك کتێبو نامیلکەو کاسـێتو سـی دی بینراو بۆ سـودی موسـڵمانانو بانگ کردنی ناموسڵمانان..

٣- دروست کردنو هێنانەدی کتێبخانەیەکی بیستراوی ئیسلامی بازرگانی لە شێوەی پێشـانگایەك یان کۆشکێکی بچوك لە هۆڵی پێشوازی کردنی نەخۆشدا، ئەم بۆچونەش پاداشتێکی گەورەی هەیە..

٤- ڕێکخستنو گونجاندن لە نێوان وتارو ئامۆژگاری مزگەوتو شوێن نوێژەکانی سەر بە نەخۆشخانە..

٥- بەسـتنی کۆڕی زانیاری پزیشـکی بۆ ڕون کردنەوەی دەسەڵاتی خودا لە دروست کردنی مرۆڤدا..

## پزیشكو کلیلەکانی خێرو چاکە..

دانیشـت بـووم‌و زۆر بیرم دەکردەوە لـە حاڵی پزیشـك لەگەڵ نەخۆشـەکانیدا.. هەروەهـا بەراوردکردنی پیشـەی پزیشـکی لەگەڵ کارو پیشـەکانی تـردا، زانیم کە مامۆسـتا هەڵس‌وکەوت لەگەڵ کۆمەڵە کەسـێکی دیاری کراودا دەکات، کە لە بۆچونو هەڵس‌وکەوتو مامەڵەیاندا تا ڕادەیەك لێك نزیکن، هەروەها زۆریش لەگەڵیاندا هیلاكو ماندوو نابێت..

هەروەها ئەندازیاریش لەگەڵ کۆمەڵە کەسـێکی ئاست لە یەك نزیکدا هەڵس‌وکەوت دەکات، لەبەرئەوە زۆر بیرو هۆشی ماندوو نابێت..

هەروەها خاوەن پیشەکانی تریش بە هەمان شێوە، وەکو فرۆکەوانو وەستای دروست کردنی خانوبەرەو ئاسنگەرو دارتاشو.. هەروەها...

بەڵام پزیشـك لە عەیادەکەی دادەنیشێتو نەخۆش دێتە ژوورەوە بۆ لایو نەخۆش

هەیە زیرەکەو زوو لە مەبەستی پزیشک تێدەگات‌و پزیشکیش تێدەگات.. هەیانە بە ئاسانی تێناگات‌و خۆی‌و پزیشکیش ماندوو دەکات.. لێت تێناگەم!! نا.. تۆ لە مەبەستی من تێنەگەیشتیت!! زیاتر بۆم ڕوون بکەرەوە!!

هەیانە گومانی خراپ بە پزیشک دەبات‌و بە قسەکانی خەریکی دەکات، ئەوە چیە؟! لە خودا بترسەو ماڵ‌و سامانم لە دەرمان‌و دەرزیدا بە فیڕۆ مەدە.. ئەو هەموو پشکنینە چیە؟! تۆ دانیشتوویی‌و دزیمان لێدەکەیت!! هەیانە گومانی باش دەبات..

هەیانە تووڕەیەو بە قسەکانی پزیشک بێتاقەت دەکات، وەك دەڵێت: تۆ تێناگەیت!! چەند جار دەرمانت بۆ نوسیم‌و چاك نەبومەوە؟! ئەگەر نازانی چارسەری نەخۆش بکەیت، عەیادەکەت دابخە؟!

هەیانە زۆر نەرم‌و نیان‌و لە سەر خۆیە.. هەیانە بەخشندەیە.. هەیانە ڕەزیلە.. هەیانە گەورەو بە تەمەنەو هەیانە بچوك‌و منداڵە.. هەیانە دەوڵەمەندەو هەیانە هەژارە..

کەواتە پێویستە پزیشك لە هەڵس‌وکەوتیدا خۆی بگونجێنێت لەگەڵ هەر یەکێکیاندا.. لە کاتی چارەسەری نەخۆشدا ئارامگر بێت، بە تایبەت لەگەڵ کەسە بە تەمەنەکاندا وەك ڕێزێك بۆیان، هەروەها لەگەڵ منداڵدا وەك بەزەییەك بۆیان.. هەروەها لەگەڵ لێقەوماوانی ڕوداوە کت‌وپڕەکاندا وەك سۆزێك بۆیان..

ئەو ئیماندارەی کە تێکەڵی خەڵکی دەبێت‌و لە سەر ئازارو نارەحەتیەکانیان ئارام دەگرێت، لە لای خودای پەروەردگار چاکترو خۆشەویست ترە لەو ئیماندارەی کە تێکەڵی خەڵکی نابێت‌و ئارام ناگرێت، هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی پێداوین..

لە کلیلەکانی خێرو چاکەش:

١- نەرم‌و نیانی نواندن لەگەڵ نەخۆشداو پرسیار کردن دەربارەی ژیانی ماڵ‌و منداڵی..

٢- ئامادە کردنی هەندێك کاسێت یان نامیلکەو پێشکەش کردنی بە نەخۆش..

٣- بە سۆزو میهرەبان بوون لەگەڵ کەس‌وکاری نەخۆشداو نارەحەت نەبوون لە زۆر پرسیار کردنیان، هەروەها هەوڵ بدات لە ڕێگەی ئامۆژگاریەوە کار بکاتە سەریان..

٤- وای دابنێت ڕۆژانە کە سەردانی نەخۆشەکان دەکات، پاداشتی هەیەو خێری دەگات.. چونکە هەر موسڵمانێك سەردانی نەخۆشێکی موسڵمان بکات لە میوەچنینی بەهەشتدایە هەتا دەگەڕێتەوە..

٥- زەردەخەنەو ڕووخۆشـــی بە ڕووی نەخۆشـــدا، لەبەر ئەوەی ڕووخۆش بوون بە ڕووی موسڵماناندا خێرو چاکەیە.

٦- ڕێ پیشـــاندانی نەخۆش دەربارەی ئەو شتانەی پرسیاریان لێدەکاتو پێویستیان پێیانە، هەرکەسـێکیش خەریکی جێبەجێ کردنی پێویستی موسڵمانێك بێت، خودای گەورە پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ دەکات..

٧- مانەوەی لە ژووری ئێشکگرتندا بە تەنهاو بەجێ هێشتنیماڵو منداڵو کەس‌وکار بە خێرو چاکە بزانێتو چاوەڕوانی پاداشتی خودای پەروەردگار بکات..

٨- پەلە نەکردن لە زوو دیاری کردنی نەخۆشـیدا، هەروەها پەلە نەکردن لە دیاری کردنی دەرماندا.. هەر پزیشـکێك چارەســەری خەڵك بکاتو شارەزایی تەواوی نەبێت، ئەوا لە ڕوودانی هەر کارەساتێك بەر پرسیار دەبێت..

٩- سوربوون لە سەر داپۆشینی عەیبو عاری موسڵمانان، هەر کەسێك عەیبو عاری موسڵمانان داپۆشێت، ئەوا خودای گەورە لە ڕۆژی دواییدا عەیبو عاری دادەپۆشێت..

١٠- زۆر قسە نەکردن لەگەڵ نەخۆشدا ئەگەر هاتوو نەخۆشێکی زۆر چاوەڕوانی هاتنە ژوورەوە بوون، چونکە نەخۆشی وا هەیە ئیش‌وکارو ماڵو منداڵی بەجێ هێشتووە..

## نوێژ کردنی نەخۆش..

ماوەیـــەك لەگەڵ کۆمەڵە هاوڕێیـــەك ڕێك کەوتین لە ســـەر بنیاتنانی لیژنەیەکی خێرخوازی بۆ ســـەردانی نەخۆشو ئاگادار بوون لە نارەحەتیەکانیانو یارمەتیدانیان لە کاتی پێویستیدا.. ژمارەمان کەم بوو.. نەخۆشخانەکانمان دیاری کردو یەك لە دوای یەك سەردانمان دەکردن..

یەکەم نەخۆشخانە کە سەردانمان کردن پێکهاتبوو لە پێنج سەد جێگەی نەخۆش.. بە لای نەخۆشەکاندا ڕۆیشـــتینو دیاریمان پێشکەش کردنو وەڵامی پرسیارەکانیانمان دەدایـــەوە.. ئەوەی چاوەڕوان نەکراو بوو ئەوە بوو کە زیاتر لە ٤٠%ی نەخۆشـــەکان لە کاتی نەخۆشیدا نوێژیان نەدەکرد!!

هەیان بوو نیەتی ئەوەی هەبوو کە لە دوای دەرچوونی لە نەخۆشـــخانە نوێژەکانی بگێڕێتەوە..هەیـــان بـــوو دەیوت: چـــۆن چۆنی نوێژ بکەم کە ڕووم لـــە قیبلە نەبێت!! یان چۆن نوێژ بکەم کە نەتوانم دەســـت نوێژ بگـــرم!! یان جلو بەرگەکانم پاك نین!! هەروەها چەندان قسەو بیانوی تر..



لەگەڵ ئەوەدا کە خودای گەورە زۆر کار ئاسانی بۆ کردون، ئاینی ئیسلامیش هەڵگری نارەحەتیەکانە.. خودای گەورە لەگەڵ تەنگانەو نارەحەتیدا، خۆشیو ئاسودەیشی داناوە.. پێویستە هەموومان ئەوە بزانین کە بە هیچ شێوەیەك نوێژ کردن لە سەر موسڵمان لاناچێت، تەنها لە حاڵەتی لەدەستدانی ژیریو عەقڵدا نەبێت، وەك شێت بوون یان لەهۆش خۆچوونێکی درێژخایەن..

لێرەدا بە کورتی چۆنیەتی دەست نوێژو نوێژی نەخۆش ڕوون دەکەینەوە:

١- ئەگەر نەخۆشییەکەی ئاسایی بوو، بەکارهێنانی ئاو زیانی نەبوو، وەك سەرئێشەو دان ئێشەو هاوشێوەی ئەوانە، ئەوا تەیەموم کردن دروست نیە..

٢- ئەگەر بەکارهێنانی ئاو دەبووە هۆی زیاد بوونی نەخۆشییەکە، ئەوا تەیەموم کردن دروستە..

٣- ئەگەر نەخۆشەکە نەیدەتوانی دەست نوێژ بگرێت، یان خۆی بشوات، لەبەر نەتوانینی یان لە زیاد بوونی نەخۆشیەکەی بترسێت، ئەوا دەتوانێت بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکات هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟﴾ المائدة/ ٦ واتە: (ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان دەستتان بە ئاو گەیاند بوو (تارەتتان گرت بوو) یان لە ئافرەتی نامەحرەم کەوتبوونو ئاوتان دەست نەدەکەوت (بۆ خۆشتن یان بۆ دەست نوێژ، ئەو کاتە دەتوانن) بە خاکێکی پاك تەیەموم بکەن)..

ئەگەر نەیتوانی با تەیەمومی بۆ بکەن، بەوەی کە هەر دوو دەستی نەخۆشەکە بگرنو بیدەن بە خۆڵێکی پاکداو پاشان بیهێنن بە ڕوخسارو دەستەکانیدا، وە ئەگەر جلو بەرگەکانی یان جێگەکەی پاك نەبوو، ناشتوانرا پاك بکرێتەوە، ئەوا دروستە بەو حاڵەوە نوێژەکانی ئەنجام بدات، هەر وەك خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ﴾ التغابن/ ١٦ واتە: (کەوابوو هەتا دەتوانن بە تەقواو خودا ناسبن)..

٤- ئەو کەسەی برین یان شکاوی یان نەخۆشیەکی هەبێت، کە بەکارهێنانی ئاو زیانی پێبگەیەنێت، توشی لەش گرانیش ببێت، ئەوا دروستە تەیەموم بکات.. بە بەڵگەی ئایەتەکەی خاڵی پێشوو.. بەڵام ئەگەر توانی هەندێك بەشی جەستەی بشوات، با بیشواتو بەشەکانی تری تەیەموم بکات..

٥- ئەگەر نەخۆشەکە لە شوێنێکدا بوو، نە ئاوو نە خۆڵی لێنەبوو.. کەسیش نەبوو بۆی ئامادە بکات، ئەوا با بە دڵ نیەتی دەست نوێژ بهێنێتو بەو حاڵەتەوە نوێژەکەی



بکاتو نابێت نوێژەکەی دوا بخات..

٦- ئەو نەخۆشانەی میزیان بۆ راناگرێت، یان برینەکەیان خوێنەکەی ناگرسێتەوەو بەردەوام لە چارەسەردایە، ئەوا پێویستە بۆ هەموو نوێژێك، لە دوای هاتنی کاتی نوێژ، دەست نوێژ بگرێتو ئەو بەشەی جلوبەرگەکەی یان لاشەی بشوات، کە میز یان خوێنی پێوە بووە، یان ئەگەر توانی جلوبەرگێکی پاك دابنێتو لە کاتی نوێژەکاندا لەبەری بکات، یان ئەگەر توانی پارچەیەك لۆکە یان پەڕۆ لە سەر ئەو بەشەی جەستەی دابنێت، بۆئەوەی رێگری بکات لە گەیشتنی خوێنو میز بۆ لاشەی ئەوا باشترە..

٧- ئەگەر نەخۆشەکە لەفافو پێچانەوەی پێوەی بوو، ئەوا لە کاتی خۆشۆرینو دەست نوێژدا پێویستە ئەو شوێنە مەسح بکات، واتە دەستی تەڕی پێدابهێنێتو ئەندامەکانی تریشی بشوات، بەڵام ئەگەر مەسح کردنەکە زیانی پێدەگەیاند، یان برینی پێوە بوو، نەدەتوانرا بشۆرێت یان مەسح بکرێت، وەك سوتان ئەوا لە دوای دەست نوێژەکە دەتوانێت تەیەموم بکات..

## چۆنیەتی نوێژکردنی نەخۆش..

زاناکان هاوڕان لە سەر ئەوەی ئەگەر کەسێك نەتوانێت بە پێوە نوێژ بکات بۆی هەیەو دەتوانێت بە دانیشتنەوە نوێژەکەی بکات.. چۆنیش لە لای ئاسانە دەتوانێت بەو شێوەیە دابنیشێت..

ئەگەر بە دانیشتنەوە نەیتوانی نوێژەکەی بکات، ئەوا دەتوانێت لە سەر تەنیشت نوێژەکەی بکاتو ڕوو لە قیبلە بێت.. سوننەتیشە لە سەر تەنیشتی ڕاستی بێت.. ئەگەر لە سەر تەنیشتیش نەیتوانی، دەتوانێت لە سەر پشت نوێژەکەی بکاتو ئەگەر توانی با قاچەکانی ڕووەو قیبلە بن.. هەروەك پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵێك دەفەرموێت: (صلِّ قائماً، فإن لم تستطيع فقاعداً، فإن لم تستطيع فعلى جنب). رواه البخاري. لە لای ئیمامی نەسائی ئەمەشی لەگەڵدایە (فإن لم تستطيع فمستلقياً) واتە: (بە پێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە، ئەگەر نەتتوانی لە سەر تەنیشت، ئەگەر نەتتوانی بە پاڵدانەوەوە).. ئەگەر کەسێك دەیتوانی بە پێوە بوەستێت، بەڵام نەیدەتوانی بۆ ڕکوعو کڕنوش بردن بچەمێتەوە، ئەوا هەر دەبێت بە پێوە نوێژەکەی بکات، بەڵام بۆ ڕکوع تەنها کەمێك جەستەو سەری دانەوێنێتو پاشان دانیشێتو بۆ کڕنوشیش سەری دانەوێنێت.. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ البقرة/ ٢٣٨ واتە : (هەمیشەو





بەردەوامیش هەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکان بۆ خودا، بە گەردن کەچیەوە)..

خۆ ئەگەر نەخۆشیەکەی بەهێز بوو، یان شەلەلی بوو، نەیدەتوانی سەری بجوڵێنێت، ئــەوا لە دڵی خۆیدا نیەتی ڕکوعو کڕنوش دەهێنێت.. وە ئەگەر نەیدەتوانی ڕوو بکاتە قیبلەو کەســیش نەبوو یارمەتی بدات، ئەوا چۆن بۆی ئاســانەو بۆی دەگونجێت، با وا بکات..

هەندێــك نەخۆش کاتێك نەشــتەرگەریەکیان بۆی ئەنجام دەدرێــت، نوێژ ناکەن، لەبەرئــەوەی ناتوانن بە تــەواوی ئەنجامی بدەن، یان ناتوانن دەســت نوێژ بگرن، یان لەبەرئــەوەی جل‌وبەرگەکەیــان پاك نیە، ئەمــەش هەڵەیەکی گەورەیــە.. وازهێنان‌و نەکردنــی نوێژ دروســت نیە، بەڵکو دەبێــت هەر چۆنێك بۆی بکرێــت، بیکات.. هەر وەك خودای گــەورە دەفەرموێت: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ التغابن/ ١٦ واتە: (کەوابوو هەتا دەتوانن بە تەقواو خوداناس بن)..

هەندێك نەخۆش دەڵێن: کاتێك چاك بووینەوە، نوێژەکانمان دەگێڕینەوە.. ئەمەش ساردو سڕیە.. نوێژ دەبێت لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدرێت‌و دروست نیە دوای بخەین بۆ کاتێکی تر.. ئەگەر نەخۆش، یان کەسێکی تر خەوی لێکەوت، یان لە بیری چوو نوێژەکەی بــکات، ئەوا دەبێت هەر کــە خەبەری بووەوە، یان بیری کەوتەوە یەکســەر نوێژەکەی بکات.. نابێــت وازی لێ بهێنێت‌و لەگەڵ نوێژێکی تردا بیــکات.. هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (من نام عن صلاة، أو نســيها فليصلها متى ذكرها لاكفارة لها إلا ذلك). واتە: (هەر کەســێك لە کاتی نوێژدا خەوی لێکەوت، یان لە بیری چوو، ئەوا هەر کاتێك بیری کەوتەوە با نوێژەکە ئەنجام بدات‌و تەنها ئەمەش کەفارەتیەتی)..

ئەگــەر نەیتوانی هەر نوێژەو لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدات، ئەوا با نوێژی نیوەڕۆو عەسر بەیەکەوەو نوێژی ئێوارەو خەوتنیش بەیەکەوە ئەنجام بدات، پێشیان بخات یان دوایان بخات، بەپێی گونجان‌و ئاسانی بۆی، واتە (جمع تقديم يان جمع تأخير)..

بەڵام نوێژی بەیانی پێویستە لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدرێت‌و نە لەگەڵ پێش خۆی‌و نە لەگەڵ دوای خۆی کۆ ناکرێتەوە..

## ڕۆژووگرتنی نەخۆش..

هەموو نەخۆشـێك، كە ڕۆژووگرتن لە لای گران و زەحمەت بوو، دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت، هەروەك خـودای گەورە دەفەرموێـت: ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ البقـرة/ ١٨٥ واتــە: (ئەوەش كە نەخۆش بێت یان لە سـەفەردا بێت با لە ڕۆژانی تردا بەو ئەندازەیە بیگرێتەوە).. بەڵام دروسـت نیە لەبەر نەخۆشی بڵاوو ئاسان، وەك كۆكەو سەرئێشە بەڕۆژوو نەبێت..

ئەگەر ڕۆژووەكە دەبووە هۆی زیاد بوونی نەخۆشیەكە یان درەنگ چاك بوونەوەی و بە ڕۆژ پێویستی بە خواردنی دەرمانەكانی هەبوو ئەوا دروستە بەڕۆژوو نەبێت، بەڵكو مەكروهــە كە بەڕۆژوو بێــت، هەروەك خودای گــەورە دەفەرموێت:﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ البقرة/ ١٨٥واتە: (چونكە خودا ئاسـانكاری بۆ ئێوە دەوێت و نایەوێت (پەرستن و فەرزەكانتان) لە سەر قورس و گران بكات)..

ئەگــەر هاتوو ڕۆژووگرتنەكــە دەبووە هۆی لە هۆش خۆچوونی نەخۆشــەكە، ئەوا با ڕۆژووەكەی بشـكێنێت و پاشــان بیگرێتەوە.. وە ئەگەر بەڕۆژوو بوو، پاشان لە هۆش خــۆی چوو، بەڵام پێــش یان دوای ڕۆژئاوا بــوون بە هۆش هاتەوە، ئــەوا ڕۆژووەكەی تەواو و دروستە، مادام هیچ خواردن و خواردنەوەیەكی نەخوارد بێت..

وە ئەگەر كەسێك لە هۆش خۆی چوو، یان دەرمانێكی ئارام بەخشیان بۆ بەرژەوەندی نەخۆشــەكە بەكارهێناو پاشان لە هۆش چوو.. ئەگەر لە هۆش چوونەكەی لە سێ ڕۆژ كەمتر بوو، ئەوا دەبێت ڕۆژووەكەی بگرێتەوە، چونكە حســابی خەوتووی بۆ دەكرێت.. بەڵام ئەگەر لە هۆش چوونەكەی لە سێ ڕۆژ زیاتر بوو ئەوا پێویست ناكات ڕۆژووەكەی بگرێتەوە، چونكە حســابی نەمانی ژیری و عەقڵــی بۆ دەكرێت، ئەمەش بە پێی فتوای زانای گەورە شیخ إبن باز (ڕەحمەتی خودای لێبێت)...

ئەگەر نەخۆشێك چاوەڕوانی چاكبوونەوەی لێدەكرا، هەر وەك ئەوەی نەشتەرگەری بۆ ئەنجام بدرێت، ئەگەر ڕۆژووەكە لە ســەری نارەحەت بوو، با بیشـكێنێت و پاشــان بیگرێتەوە.. بەڵام ئەو نەخۆشــانەی نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە و چاوەڕوانی چاك بوونەوەیــان لێناكرێت، وەك شــێرپەنجە یان لە دەســتدانی گورچیلــە، هەروەها ئەو كەسانەی تەمەنیان زۆرەو ناتوانن بەڕۆژوو بن و ناشتوانن بیگرنەوە، ئەوا لە باتی هەر ڕۆژێك با خواردنی هەژارێك بدەن، كە دەكاتە كیلۆ و نیوێك برنج.. یان خواردنی ئەو وڵاتە..

ئـــەو نەخۆشـــەی کە هەندێك ڕۆژی ڕەمـــەزان بەڕۆژوو نەبـــووەو چاوەڕوانی چاك بوونـــەوە دەکات بۆئەوەی بیان گرێتەوە، پاشـــان بۆی دەردەکەوێت کە نەخۆشـــیەکەی درێژخایانەو ناتوانێت بیان گرێتەوە، ئەوا پێویستە بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدات.. بەڵام ئەو کەســـەی چاوەڕوانی چاك بوونەوو شـــیفا دەکات، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ڕۆژو کاتی گرتنەوەی ڕۆژووەکە بمرێت، ئەوا هیچ شتێك نە لە سەرخۆیو نە لە سەر کەسوکاری نیە..

بۆ نمونە: کەسێك لە بیستوپێنجی ڕەمەزاندا نەشتەرگەریەکی بۆ ئەنجام دەدرێتو بەڕۆژوو نابێت، بەو نیازەی لە دوای چاك بوونەوە بیان گرێتەوە، بەڵام لە سی ڕەمەزاندا دەمرێت.. لەم حاڵەتەدا کەسوکارەکەشـــی لە سەریان نیە نە ڕۆژووەکەی بۆ بگرنەوەو نەخواردنی هەژاریش بدەن..

بەڵام ئەو کەســـەی نەخۆش دەکەوێتو بەڕۆژوو نابێت، پاشـــان چـــاك دەبێتەوەو دەتوانێـــت ڕۆژووەکەی بگرێتەوە، بەڵام ســـاردو ســـڕی لێدەکات هەتـــا دەمرێت، ئەوا دەبێت بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك لە ماڵەکەی دەربکرێت.. بەڵام ئەگەر کەسێك لـــە خزمەکانی وتی: من ڕۆژووەکانـــی بۆ دەگرمەوە، ئەوا ئەمەیان باشـــترە، هەر وەك پێغەمبـــەری خـــودا ﷺ دەفەرموێت: (من مـــات وعليه صيام، صام عنـــه وليه). واتە: (هەرکەسێك مردو ڕۆژووی لەسەر بوو، با کەسوکاری بۆی بگرنەوە)..

بۆ نمونە: کەســـێك لە بیستوپێنجی ڕەمەزاندا نەشتەرگەری بۆی ئەنجام دەدرێتو بـــەڕۆژوو نابێـــت بە نیازی ئەوەی لـــە دوای چاك بوونەوە بیانگرێتەوە، بەڵام لە ســـی ڕەمەزاندا چاك دەبێتەوەو ساردو سڕی لە گرتنەوەی ڕۆژووەکەی دەکات، هەتا لە مانگی حەجدا دەمرێت، ئەوا کەسوکارەکەی یان دەبێت ڕۆژووەکەی بۆ بگرنەوە یان خواردن بدەن بە هەژاران..

ئەگەر نەخۆشـــەکە نەخۆشـــیەکەی بەدرێژخایەن دادەنراو بەڕۆژوو نەبوو، پاشان بواری پزیشکی پێشکەوتو چارەسەر بۆ نەخۆشیەکەی دۆزرایەوەو چاکبووەوە، ئەوا لە ســـەری نیە ئەو ڕۆژووانەی پێشوو بگێڕێتەوە، چونکە لەو کاتەدا بەڕۆژوو نەبووەو لە سەری نەبووە، هەروەها نەشیتوانیوە بیان گرێتەوە.. (اللجنة الدائمة)..

ئەگەر کەسێك توشی برسیەتیو تینویەتیەکی زۆر هاتو ترسا لەوەی کە لەناوبچێت، با ڕۆژووەکەی بشـــکێنێتو پاشـــان بیگرێتەوە، لەبەرئەوەی پاراســـتنی گیان پێویستو زەرورە..

خواردنی هەژاریش بە دوو شـێوە دەبێت: دروسـتە لە کۆتایی مانگدا خواردنی سی هەژار بدات، هەروەها دروستە هەموو ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدات..

## چەند وشەیەك بۆ ئەوانەی لای نەخۆشن..

هەندێك کەس کاتێك لە لای نەخۆشێکی نزیکیان دەبن، سۆزو بەزەیی بە سەریاندا زاڵ دەبێـت.. بەردەوام لە نەخۆشـخانە لەگەڵ نەخۆشـەکە دەبێتو هەڵدەسـتێت بە خزمـەت کردنو جێبەجێ کردنی پێویسـتیەکانی.. هەندێك جار ئەم کەسـە شـەو ناخەوێت، بەڵام نەخۆشـەکە دەخەوێت.. شەونخونی ئیماندار لەبەر برایەکی نەخۆش یان لەبەر خوشـکێکی نەخۆشـی موسـڵمانی، هۆکارێکی گەورەیە بۆ نزیك بوونەوە لە خودای گەورە.. خۆ ئەگەر نەخۆشـەکە کەسێکی نزیکی ببێت، وەك باوك یان دایك یان خوشكو برا، ئەوا بە دڵنیاییەوە پاداشتی گەورەتر دەبێت..

پێغەمبـەری خودا ﷺ هەواڵمان پێدەداتو دەفەرموێت: (هەر کەسـێك سـەردانی نەخۆشێك بکات، ئەوا بەردەوام وەکو ئەوە وایە خەریکی میوە چنین بێت لە بەهەشتدا، هەروەها حەفتا هەزار فریشتە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن)..

ئەمە بۆ سەردان کردنی نەخۆشە!! ئەی ئەگەر بەردەوام لەگەڵ نەخۆشەکەدا بێتو خزمەتی بکات؟! بەڵام هەندێك لەو کەسـانەی کە لە لای نەخۆشن، هەموو ئەو چاکەو پاداشتانە کۆ دەکەنەوەو پاشان بەهۆی چەند هەڵەو تاوانێکەوە بەفیڕۆی دەدەن..

کەواتە هەموومان پێویسـتە بپرسین: ئەو کەسانەی لە لای نەخۆشن کاتەکانیان لە چیدا بەسەر ببەن؟ دەتوانن کاتەکانی خۆیان لە خوێندنەوەی بە سوددا بە سەر ببەن.. هەروەها لە نەخۆشخانەدا ئامۆژگاری خەڵکی بکەن.. یان ئەگەر لە نەخۆشخانە لە لای نەخۆش بوو، با دوعا بە سەر نەخۆشەکەدا بخوێنێت..

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الإسراء/ ٨٢ واتە: (ئێمە لە قورئان ئایەتو سورەتانێك دادەبەزێنین، کە ببێتە هۆی شیفاو چارەسەر بۆ نەخۆشیە دەروونیو جەستەییەکان هەروەها ببێتە ڕەحمەتو میهرەبانیش، بۆ ئیمانداران)..

هەروەهـا دەفەرموێـت: ﴿ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ﴾ فصلـت/٤٤ واتـە: (ئـەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئەم قورئانە بـۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە هیدایەتو ڕێنموویيو شیفایەو چارەسەری هەموو دەردو نەخۆشیەك دەکات)..

بە دڵنیاییەوە خوێندنی قورئان بە سەر نەخۆشدا کاریگەریەکی گەورەی دەبێت..

## لە نەخۆشخانەی سەربازیدا..

عبداللەی هاورێم گەنجێکی چاکەکار بوو.. پەیوەندیو دۆستایەتیمان پێکەوە هەبوو.. ئەمزانی کە باوکی توشــی نەخۆشی دڵ بووەو چەندان نەشتەرگەری بۆ ئەنجامدراوەو کۆتا جاریش بردویانەتەوە نەخۆشخانەو لە ژێر چاودێری وردداییە..

چەند جارێك لە نەخۆشــخانە سەردانم کرد، پاشــان نەخۆشیەکەی پەرەی سەندو کەوتە بێ هۆشیەکی تەواوەوە.. نەیدەزانی لە دەوروبەریدا چی ڕوو دەدات.. کاتێك ئەو هاورێیەم زانی کە باوکی ئاگای لە هیچ نیەو زۆری ســەردانی میوانەکانیش نارەحەتی دەکەن، نوســراوێکی بە دەرگای ژوورەکەدا هەڵواســیو لێی نوسی: بە فەرمانی پزیشك سەردان قەدەغەیە..

پاش چەند ڕۆژێك پەیوەندیم پێوە کردو بە شــڵەژاویەوە وتی: یا شــێخ دەمەوێت سەردانی باوکم بکەیت، بۆئەوەی هەندێك قورئانی بە سەردا بخوێنیت.. بە پەلە چووم بۆ نەخۆشخانەو چوومە ژوورەوە بۆ لای باوکی.. وەك لاشەیەکی بێ گیان وابوو، لە سەر جێگەکەی ڕاکشــا بوو.. لە بێ هۆشیەکی تەواو دابوو.. چەند ئامێرێك بە جەستەیەوە بوو.. ئامێری فشاری خوێن.. ئامێری شەکرە.. لێدانی دڵ.. هەناسەدان.. لە تەنیشتیەوە یاریدەدەری پزیشــکێك بە ئارامی چاودێــری ئامێرەکانی دەکرد.. لێی نزیك بوومەوەو چوومە دیار سەریو قسەم لەگەڵ کرد، بەڵام هیچ شتێکی وەڵام نەدامەوە..

وتم: ئەی فلانە کەس ئەگەر گوێت لێمە، تەنها پەنجەت بجوڵێنە.. بە بێ جوڵە مایەوەو پەنجەی نەجولاند.. بە دەنگێکی کەمێك بەرزو بیســتراو، دەستم کرد بە خوێندنــی قورئــان.. ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ★ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ★ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ....﴾. ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ...﴾.. نەخۆشەکە کەمێك جولاو بەڵام قسەی نەکرد.. لە پڕ یەکێك لە ئامێرەکان دەنگی لێوە هات، وەك دەنگی ئاگادار کردنەوە.. یاریدەدەری پزیشکەکە ترساو هەســتا ژمارەکانی ئامێرەکەی گۆڕیو دانیشت، پاشان ئامێرێکی تریش دەنگی لێوە هات.. هەســتاو گۆڕانکاری لەویشــدا کردو دانیشــتەوە، پاشان ئامێری سێیەم بە هەمان شێوە.. بەردەوام لە نێوان ئامێرەکاندا هاتوچۆی دەکردو منیــش قورئانم دەخوێنــد.. گوێم لە هاورێکەم بوو بە یاریدەدەری پزیشــکەکەی دەوت: this Quran.. this Quran.. ئەوە قورئانە.. ئەوە قورئانە.. بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکردین!! بەڵام من لە قورئان خوێندنەکەم هەر بەردەوام بووم، بە بێ ئەوەی

ئاوریان لێبدەمەوە..

نزیکەی نیو کاتژمێر قورئانم بە سەردا خوێند، پاشان دوعام بۆ کردو ڕۆیشتم، بەڵام عبدالله لەگەڵ یاریدەدەری پزیشکەکەدا مایەوەو بە زمانی ئینگلیزی قسەی بۆ دەکرد.. گوێم لە دوبارە بوونەوەی ئەم وشانە بوو: قورئان.. ئیسلام..

پاشان عبدالله بەرەو ڕووم هاتو سوپاسوماڵئاوایی لێکردم.. دەستیم گرتو وتم: تێنەگەیشتم چی ڕوویدا؟! ئەم ئامێرانە چی بوون، کە بێتاقەتیان کردین؟! یاریدەدەری پزیشکەکە بۆچی شڵەژا؟! وتی: یا شێخ کارەکە زۆر سەر سوڕهێنەرە.. تۆ دەزانی باوکم توشی نەخۆشی دڵ بووەو چەندان نەشتەرگەریمان بۆ ئەنجامداوە.. پێش دوو ڕۆژ لە کۆتا نەشتەرگەریدا، لە پڕ خوێن لە دەمارەکانیدا وەستاو پزیشکەکەشی چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد.. لە پێش نەشتەرگەریەکەدا پزیشکەکە زۆر سور نەبوو لە سەر گەیاندنی دانانی ترومپایەکی کارەبایی (مضخة كهربائية) بۆ جوڵاندنی خوێن لە دەمارەکانیدا بۆ کاتی پێویست.. هەر بۆیە پزیشکەکە زۆر بە پەلە هەستا بە دانانی ترومپایەکی بە دەست جوڵاو، داوای لە یەکێك لە یاریدەدەرەکانی کرد کە بە دەست ترومپاکە بجوڵێنێت.. ئەمەش باوکمی هێنایە سەر لێواری مەرگ، لەبەرئەوەی خوێن لە دەمارەکانیدا بۆ ماوەی پەنجا خولەك وەستا.. بەڵام خودای گەورە زۆر بە سۆزو میهرەبانە.. لە دوای نەشتەرگەریەکە وەك جەستەیەکی بێ گیان باوکمیان هەڵگرتو بردیان بۆ ژوورەکەی.. فشاری خوێنی دابەزی تا گەیشتە چل پلە.. بە چەندین هۆکار هەوڵی بەرزکردنەوەیاندا، بەڵام نەیانتوانی..

پزیشکەکە بڕیاریدا کە ماددەیەکی کیمیاوی بکرێتە دەمارەکانیەوە، بۆئەوەی فشاری خوێنەکەی بەرز ببێتەوە.. ئەو ماددەیەش زۆر ترسناك بوو، هەر بۆیە لە ڕووی پزیشکیەوە نابێت لە دوانزە پلە زیاتر بدرێتە نەخۆش، چونکە زۆرجار دەبێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە.. ئەو بڕە دەرمانەی پێدراو حاڵەتی هیچ پێی باش نەبوو، پاشان پزیشکەکە زیادی کرد بۆ سیانزە پلە، پاشان بۆ چواردە پلە.. بۆ پانزە پلە.. بۆ شانزە پلە.. فشاری خوێنەکەی بەرزبووەوە بۆ شەستو حەوت پلەو وەستا.. لەگەڵ ئەوەشدا هەر نزم بوو، پاشان لە سەر ئەم جێگەیە دایاناو ئەم یاریدەدەرەش چاودێری دەکرد.. دوای ئەوەی تۆ دەستتت بە قورئان خوێندن کرد، فشاری خوێنی باوکم دەستی بە بەرزبوونەوە کردو بەرزبووەوە.. بۆ شەستو هەشت.. شەستو نۆ.. حەفتا.. یاریدەدەرەکە هەستا بە کەم کردنەوەی ئەو ماددەیەی کە بۆ بەرزبوونەوەی فشاری خوێنەکە پێویست بوو، بەردەوام فشاری خوێنی باوکم بەرز دەبووەوە، هەتا گەیشتە

حەفتاو پێنج.. هەشـتا.. نەوەد.. هەتا لە سـەدو بیسـتو یەكدا جێگیر بوو.. ئێسـتا هۆكاری سەرسوڕمانی یاریدەدەرەكە دەزانی؟!

پزیشـكەكان.. ئامێـرەكان.. دەواو دەرمان، هیچ سـودێكیان نەبوو، كوا شـارەزایی پزیشكەكان؟! كوا دەواو دەرمانەكانیان؟! پاكیو بێگەردی بۆ ئەو خودایەی كە قورئانی دابەزاند﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الإسـراء/٨٢ واتە: (ئێمە لە قورئان ئایەتو سورەتانێك دادەبەزێنین، كە ببێتە هۆی شیفاو چارەسەر بۆ نەخۆشیە دەروونیو جەستەییەكان هەروەها ڕەحمەتو میهرەبانیش، بۆ ئیمانداران)..

## هاوەڵی نەخۆش

## دەتوانێت دوعا بۆ نەخۆش بكات بە:

١. خوێندنی حەوت جاری سورەتی (الفاتحة)، لەگەڵ فوو كردن بە شوێنی ئازارەكە، یان بە سەری نەخۆشەكەدا..

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە كە كەسانێك لە هاوەڵان لە گەشتێكدا دەبنو بە لای دانیشتوانی هۆزێكدا دەڕۆنو داوایان لێدەكەن، كە میوانداریان لێ بكەنو لە لایان لابدەن، بەڵام ڕازی نابن.. گەورەی ئەو هۆزە مار پێوەی دەدات.. كەسێكیان دێت بۆ لای هاوەڵەكانی پێغەمبـەر ﷺ و دەڵێت: گەورەی هۆزەكەمان مار پێـوەی داوە.. ئایا دوعاو نزایەكتان لەلا هەیـە؟ یەكێك لە هاوەڵان وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: بەڵێ.. سـورەتی (الفاتحة)ی بەسـەردا دەخوێنێـتو گەورەی هۆزەكەیان چاك دەبێتـەوەو هەندێك مەڕو ماڵاتیان دەداتێ، بەڵام هاوەڵەكە وەریناگرێتو دەڵێت: پرس بە پێغەمبەری خودا ﷺ دەكەم..

كاتێـك دێت بـۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و پێی دەڵێت: ئـەی پێغەمبەری خودا ﷺ، سـوێند بـە خودا تەنها سـورەتی (الفاتحة)م بە سـەردا خوێند.. پێغەمبـەری خودا ﷺ زەردەخەنەیەكی كردو فەرموی: تۆ لە كوێ دەزانیت ئەو سورەتە دوعایە؟! پاشان فەرموی: مەڕو ماڵاتەكەیان لێوەربگرنو بەشی منیشی لێ بدەن..

٢. خوێندنـی حـەوت جاری هەر سـێ سـورەتی ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾.. هەروەها خوێندنی حەوت جاری ئەم نزایە: (اسـأل الله العظيم، ربَّ العرش العظيم أن يشفيك. بسم الله أرقيك من كل شيء يؤذيك، من شر كل نفس، وعين حاسدة، بسـم الله أرقيك، والله يشفيك) رواه أحمد.. هەروەها خوێندنی: (أذهب البأس، رب الناس، اشف أنت الشافي لاشفاء إلا شفاؤك شفاء لايُغادر سقماً) متفق عليه.. هەروەها خوێندنی

(أعيذك بكلمات الله التامة، من كل شيطان وهامة، ومن كل عين لامة) رواه الترمذي..

٣. پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: هەر کەس سەردانی نەخۆشێك بکات، کە کاتی مردنی نەهاتبێت و حەوت جار ئەم نزایەی بۆ بخوێنێت: (أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك). رواه الترمذي.. ئەوا خودای گەورە شیفای دەدات.. هەروەها نزاو پاڕانەوەی تریش زۆرەو قورئانی پیرۆزیش هەمووی هەر شیفایە..

## هاوەڵی نەخۆش

## دەتوانێت سود لە کاتەکانی ببینێت بە:

١- خوێندنەوەی بە سود.. قورئان خوێندن بێت، یان کتێبو نوسراوی تری بەسود..

٢- دوورکەوتنەوە لە ڕووبەڕوو بوونەوەو چاوپێکەوتن لەگەڵ ئافرەتاندا، یان ئافرەتان لەگەڵ پیاواندا، چونکە لە کاتی دەست بەتاڵیدا شەیتان دەست دەکات بە یاری کردن بەو کەسانە.. ئافرەتان وا لێدەکات، کە لە ڕێڕەوەکاندا هاتوچۆ بکەن، یان یاری بە ژمارە تەلەفۆن و مۆبایل بکەن..

هەروەها پیاوانیش بە هەمان شێوە.. زۆر شتانی خراپمان بیستووە کە لە نەخۆشخانەکان ڕوویداوە.. زۆرێك لە ئافرەتان کاتێك لە نەخۆشخانەدان، لە خۆداپۆشینیاندا ساردو سڕی دەکەن، یاخود لە قسە کردنو لە پێکەنینیاندا لەگەڵ پیاوانی نامەحرەمدا..

٣- چەند جوانە هاوەڵی نەخۆش کاتی خۆی لە شتی بە سوددا بە سەر بەرێت.. بەڵکو وا لە نەخۆشەکەش بکات، کە ئەویش لە شتی بە سوددا کاتەکانی بە سەر بەرێت..

کاتەکانی لە خوداپەرستیدا بە سەر بەرێت، کاسێتی بە سودو قورئانو ئامۆژگاری لە لا بێت.. ئاگای لە کاتی نوێژەکان بێتو جێبەجێیان بکات.. دوورکەوێتەوە لە هەموو کارێك، کە تووشی تاوانو سەرپێچی خودای گەورەی بکات..

٤- ڕازی بێت بە هەموو قەزاو قەدەرێکی پەروەردگار..

٥- لە بیرم ناچێت، کە بە هاوەڵی نەخۆش بڵێم:

## پاڵەوان و ئازا بە..

بەڵــێ.. پاڵەوان بە.. لــەرزۆك و بێئارام مەبە.. زۆر جار جێگەی سەرزەنشــت نیە، ئەگــەر گوێمــان لە ئاهو ناڵەی نەخــۆش بێت.. چونکە زۆربەی مرۆڤەکان ســنورێکی دیاریکراویان بۆ ئارامگرتنیان هەیە، بەڵام جێگەی سەرسورمان ئەوەیە، کاتێك کەسێك دەبینی کە لە لای نەخۆشــیکەو خەریکی گریانەو بێئارامە، لەگەڵ ئەوەش چاوەڕوانی ئەوە لەو کەســە دەکرێت، کە نەخۆشەکە ئارام بکاتەوەو دڵی بداتەوەو ببێتە پێشەنگ لە ئارامگرتن و ڕەزامەندیدا بۆ نەخۆشەکە، بەڵام حاڵی ئەمیش لە حاڵی نەخۆشەکەوە زۆر نزیکە..

زۆرێك لە هاوەڵانی نەخۆش و ئەو کەسانەی نەخۆشیان هەیە، سکاڵای ئەوە دەکەن، کە گریان و دڵتەنگی بە سەریاندا زاڵ دەبێت.. منیش پێیان دەڵێم: بەڵێ.. بەڵام ئارامگرتن زۆر جوانترە بۆت.. ئەگەر هاتوو نەخۆشــە خۆشەویســتەکەت بەرەو مردنیش بچێت، نارەزایــی و نائارامی چ ســودێکت پێدەگەیەنن؟! ئارام بگرە بــە ئارامگرتنێکی جوان.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك کەسێك منداڵەکەی دەمرێت، خودای گەورە بە فریشتەکان دەفەرموێت: گیانی منداڵی بەندەکەمتان کێشا؟ میوەی دڵیتان لێکردەوە؟ فریشــتەکانیش دەفەرمون: بەڵێ.. خودای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەندەکەم چی وت؟ فریشتەکانیش دەفەرمون: سوپاسی کردیت.. خودای گەورەش دەفەرموێت: کۆشکێك لە بەهەشتدا بە ناوی کۆشکی سوپاسگوزاریەوە بۆ بەندەکەم دروست بکەن)..

کاتێك زەرەرو زیانێکت تووش دەبێت، هەروەها دڵت تەنگ دەبێت بە نزاو پاڕانەوە پەنا بۆ خودا بەرە..

## د. عبدالله وتی:

ئافرەتێــك هات بۆ لام، هەنگاوەکانی بــە دوای خۆیدا پەلکێش دەکرد.. بە باڵەکانی منداڵێکی نەخۆشی هەڵگرت بوو.. دایکەکە تەمەنی نزیکەی چل ساڵ دەبوو.. کۆرپەکەی لــە باوەش گرت بوو، وەك ئەوەی پارچەیەك بێت لە جەســتەی.. حاڵی زۆر نارەحەت بوو.. لە دووری دوو تا سێ مەترەوە گوێت لە دەنگی هەناسەی سنگی دەبوو..

پرســیارم لێکرد: تەمەنی چەندە؟ وتی: دوو ســاڵ و نیوە.. پشکنینی پێویستمان بۆ ئەنجامداو دەرکەوت کە خوێنبەرەکانی دڵی ناتەواون..

دوو ڕۆژ لە دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری، کوڕەکەی زۆر باش بوو بوو.. دایکەکەش

زۆر دڵخۆش بوو.. هەر کات کە دەیبینیم دەیوت: کەی دەردەچین؟ خەریك بووم فەرمانی دەرچوونی بۆ بنوسم، لەپڕ منداڵەکەی لە قورگیدا توشی خوێن بەربوونێکی زۆر هات.. ئـــەم ڕووداوەش بوو بە هۆی وەســـتانی دڵی بۆ ماوەی چلو پێنـــج خولەك.. منداڵەکە لەهۆش چوو.. ئاگای لە خۆی نەما.. پزیشـــکەکان هەموو لـــە ژوورەکەیدا کۆبوونەوەو چەندین کاتژمێر تێپەڕیو نەیانتوانی چارەسەری بکەن..

یەکێـــك لە هاوەڵانم پەلەی کـــردو بە دایکەکەی وت: لەوانەیـــە کوڕەکەت دەماغی وەستا بێت، واش گومان دەبەم کە هیچ هیوایەکی بۆ ژیان نەما بێت.. بە سەرزەنشتەوە ئاوڕم لێدایەوەو پێم وت: بۆچی وات پێوت؟! ئافرەتەکەش ســـەیری کردو ســـوێند بە خودا لەمە زیاتر کە وتی: شـــیفا لە لای خودایە، هیچی تری نەوت، پاشان داوای شیفای لە خودا کردو بە بێ دەنگی چوو بۆ لای کورســـیەكو لە ســـەری دانیشـــت.. قورئانێکی شینی بچوکی بە دەستەوە گرتو دەستی کرد بە خوێندنەوەی..

دکتـــۆرەکان لە ژوورەکە چوونە دەرەوەو منیـــش لەگەڵیان دەرچووم.. منداڵەکەش وەك جەســـتەیەکی بێ گیان لە سەر قەرەوێڵە ســـپیەکەی بوو.. ئاوڕم لە دایکی دایەوە، هـــەر وەك خـــۆی بوو.. ڕۆژێـــك دەمبینی قورئانی بە ســـەردا دەخوێنـــد، ڕۆژێك بۆی دەپاڕایەوە..

دوای چەند ڕۆژێك پەرســـتارێك هەواڵی پێدام کە منداڵە بچوکەکە دەستی کردووە بە جوڵە.. سوپاسی خودام کردو وتم: پیرۆزە، دایکی یاسر.. مژدە بێت، یاسر بەرەو باش بوون دەچێت.. تەنها بە وشەیەك وەڵامی دامەوەو وتی: سوپاس بۆ خودا..

بیســـتو چوار کاتژمێر تێپەڕیو منداڵەکە توشـــی خوێن بەربوونێکی هاوشـــێوەی خوێن بەربوونی یەکەم هات.. جارێکی تر، دڵی وەستا.. جەستەی منداڵەکە زۆر هیلاك بوو، جوڵەو هەستی لە دەستدا.. یەکێك لە پزیشکەکان بۆ چارەسەری چووە ژوورەوە.. دایکەکـــە گوێی لێبوو کە دەیوت: وەســـتانی دەماغەو ئەمیش هەر دوبارەی دەکردەوەو دەیوت: (الحمدلله علی کل حال)..

پـــاش چەند ڕۆژێك منداڵەکە باش بوو، بەڵام چەند کاتژمێرێکی خایەندو توشـــی خوێـــن بەربوونێکـــی تـــر بوو، لە دڵیدا، دوبارە جوڵەو هەســـتی لە دەســـتدا.. پاشـــان ڕۆژێکی تر باش بوو، هەمدیســـان تووشی خوێن بەربوونێکی تر بوو.. حاڵەتەکەی زۆر سەرســـوڕهێنەر بوو، لە ژیانمدا حاڵەتی لەو شـــێوەیەم نەدیبوو.. خوێن بەربوونەکەی شـــەش جار دوبارە بووەوەو گوێم لێنەبوو دایکی شتێکی تر بڵێت جگەلە ئەمە نەبێت:





سوپاس بۆ خودا.. شیفا لە لای خودایە..

دوای چەندین پشــکنین‌و چارەسەر، هەروەها پاش شەش هەفتە لە خوێن بەربوون، پزیشــکەکان توانیان زاڵ بن بە ســەر ئەو بۆری هەوایەی کە خوێن بەربوونەکەی تیادا روویدەدا..

یاســر دەســتی بە جوڵە کرد.. لەپڕ تووشــی وەرەمێکی گــەورەو هەوکردن بوو لە دەماغیــدا.. خــۆم چاودێریــم دەکردو بە دایکیــم وت: کورەکەت حاڵــی زۆر خراپەو ترســناکە.. ئەویش وتی: خودای گەورە شیفادەرەو دەســتی کرد بە قورئان خوێندن.. پاش دوو هەفتە، دوو ڕۆژ منداڵەکە باش بوو.. سوپاســی خودامان کردو دایکەکە خۆی بۆ دەرچوون لە نەخۆشخانە ئامادە دەکرد.. لە پاش سێ ڕۆژ، تووشی هەوکردن‌و سست بوونــی گورچیلــە هات‌و نزیك بوو بمرێت.. دایکیشــی بەردەوام پابەند بوو بە پشــت بەســتن بە خوداوەو هەردوبــارەی دەکردەوەو دەیوت: خودای پەروەردگار شــیفادەرە، پاشان دەڕۆیشت‌و دەستی دەکرد بە قورئان خوێندن..

ڕۆژان تێپەڕین‌و ئێمەش بەردەوام بۆ ماوەی زیاتر لە ســێ مانگ لە هەوڵدا بووین.. ســوپاس بۆ خودا منداڵەکە حاڵی باش بوو، بەڵام چیرۆکەکە کۆتایی نەهات.. منداڵەکە تووشــی نەخۆشیەکی زۆر ســەیر بوو، کە لە ژیانمدا نەمبینی بوو.. دوای چوار هەفتە تووشــی هەوکردنی پــەردەی دڵ بوو، کە ناچار بووین قەفەزەی ســنگی بکەینەوەو بە کراوەیی بەجێی بهێڵین، بۆئەوەی کێم‌و زوخاوەکەی دەربکەین.. دایکیشی سەیری دەکردو دەیوت: داوام وایە خودای پەروەردگار شــیفای بدات.. شــیفا هەر لە لای خودایە، پاشان دەچوو بۆ لای کورسیەکەی‌و قورئانەکەی دەکردەوە.. جار جار سەیری دایکی منداڵەکەم دەکردو قورئانەکەشی بە دەستەوە بوو، سەیری دەوروبەری خۆی نەدەکرد..

چوومــە ژووری بوژاندنەوەی دڵ، چەندان نەخۆشــی جۆراوجۆرم بینی.. هەندێك نەخۆش هاواریان دەکرد.. ئەوانەی لە لای نەخۆشــەکانیش بوون، دەگریان.. هەندێکی تریان بە دوای پزیشــکەکاندا دەچوون.. بەڵام ئافرەتەکە لە سەر کورسیەکەی دانیشت بوو، قورئانی دەخوێند.. ئاوڕی بۆ لای ئەو کەســانە نەدەدایەوە کە هاواریان دەکرد، بۆ لای پزیشــکەکانیش نەدەچوو، لەگەڵ کەسیشدا قسەی نەدەکرد.. وام هەست دەکرد، کە ئەم ئافرەتە چیایەك بێت لە خۆڕاگری، نەك مرۆڤ..

دوای شەش مانگ لە ژووری بوژاندنەوەی دڵ، بە لای منداڵەکەدا ڕۆیشتم‌و دەبینم، کە هیچ نابینێت.. دەنگیشی لێوە نایەت.. ناشجوڵێت.. سنگیشی کراوەتەوە.. وا گومانمان

برد، كە ئەمە كۆتاییەتی.. ئافرەتەكەش لە سەر قورئان خوێندنی خۆی بەردەوام بوو.. ئارامگر بوو، هیچ سـكاڵایەكی نەدەكرد.. بە تەنها وشەیەكیش نەیدەدواندم.. پرسیاری حاڵی منداڵەكەشـی نەدەكرد، تەنها مەگەر من قسەم بكردایە.. هاوسەری ئەم ئافرەتە چل ساڵێك زیاتر دەبوو.. جارجار لە لای منداڵەكەی دەمبینی، كاتێك دەیویست پرسیار بكات دەربـارەی منداڵەكەی، خێزانەكەی ورەی بەرز دەكردەوەو بیری دەخسـتەوە كە شیفا تەنها لە لای خودایە..

لە دوای دوو مانگ، حاڵی منداڵەكە بەرەو باش بوون چوو.. رەوانەی بەشی مناڵانمان كرد.. چەندەها جۆر چارەسەرمان بۆ بەكارهێنا، لە دوای ئەوە منداڵەكە بە پێی خۆی رۆیشـتەوە بۆ ماڵەوە، منداڵەكە بە شێوەیەك قسـەی دەكرد وەكو ئەوەی لەوەو پێش تووشی هیچ شتێك نەبوو بێت..

ببورە.. چیرۆكە سەیرەكە كۆتایی نەهاتووە.. دوای ساڵو نیوێك، لە عیادەكەم بووم، پیاوێـك هاتە ژوورەوە، خێزانەكەشـی كە منداڵێكی لە باوەشـدا بوو بـە دوایدا هاتە ژوورەوە.. منداڵەكە تەندروسـتی باش بوو، سـەردانی ئاسایی هەبوو، بۆ لای یەكێك لە هاورێكانم، بەڵام بۆ هەواڵ پرسینو چاكو چۆنی هاتن بۆ لام..

بە پیاوەكەیم وت: ماشاءالله.. ئەم منداڵە شیرەخۆرەیە منداڵی شەشەم یان حەوتەمی خێزانەكەتانە؟ وتی: ئەمە دووەم منداڵمانە، منداڵی یەكەمیشـمان ئەوە بوو كە سـاڵی پـار چارەسـەرت كرد.. ئەو منداڵەشـمان لە دوای حەڤدە سـاڵ لـە پێكهێنانی ژیانی هاوسەریمانو لە دوای چارەسەری نەزۆكی، خودا پێی بەخشین..

سەرم داخست.. بیرم لە ئافرەتەكە دەكردەوە، كاتێك كە لە لای منداڵە نەخۆشەكەی بوو.. گوێم لە دەنگی نەدەبوو.. نارەزاییم لێنەبینی.. لە دڵی خۆمدا وتم: سـبحان الله، لـە دوای حەڤدە سـاڵ ئارامگرتنو جۆرەها چارەسـەری نەزۆكـی، منداڵێكیان بوو كە چەندەها جار بە چاوی خۆی مەرگی منداڵەكەی دەبینی.. تەنها ئەم وتانەشـی دوبارە دەكردەوە لاإله إلا الله.. شیفا لە لای خودایە.. ئەمە چ ئافرەتێكە؟!.





## چۆنیەتی سەردانی نەخۆش..

لە هەندێك کتێبدا هاتووە کە کەسێك دەچێت بۆ لای نەخۆشێك و پێش ئەوەی کە دابنیشێت، بە نەخۆشەکە دەڵێت: فلانە کەس ڕەنگت زەردە..

نەخۆشەکەش دەڵێت: الحمدلله علی کل حال..

کابرا دەڵێت: زۆر هیلاك و ماندوو دیاریت..

نەخۆشەکەش دەڵێت: خودا گەورەیە..

کابرا دەڵێت: نەخۆشیەکەت زۆر پێوە دیارە، کەی تووش بوویت؟

نەخۆشەکە دەڵێت: چەند ڕۆژێکە..

کابرا دەڵێت: هاواری چی دەکەیت؟

نەخۆشەکە دەڵێت: شتێکی وا نیە، داوای شیفا لە خودا دەکەم..

کابرا دەڵێت: نەخۆشیەکە چیە؟

نەخۆشەکە دەڵێت: نەخۆشیەکی دیاریکراوە..

کابرا دەڵێت: چیە؟ ناوی نیە!! باشە .. ئایا تۆ باشی؟

نەخۆشەکە دەڵێت: پێش ئەوەی کە بێیت بۆ لام زۆر باش بووم..

کابرا دەڵێت: باشە من دەڕۆم، پێویستیەکت نیە؟

نەخۆشەکە دەڵێت: با، پێویستیەکەم ئەوەیە کاتێك کە لە لای من دەڕۆیت هەرگیز مەیەرەوە بۆ لام، ئەگەر مردیشم گەردنت ئازا بێت نوێژیشم لە سەر مەکە..

ئەمە زمان حاڵ و سکاڵای هەندێك لە نەخۆشەکانە لەو کەسانەی کە سەردانیان دەکەن.. هەندێك میوان، کاتێك دادەنیشن کۆمەڵە پرسیارێکی کۆتایی نەهاتوو لە نەخۆش دەکەن.. پێشنیاری سەیر دەردەبڕن، خۆیان وەکو پزیشکێك پیشان دەدەن.. لێرەدا پێویستە چەند نەریتێکی شەرعی بە بیری خۆمان بهێنینەوە دەربارەی چۆنیەتی سەردانی کردنی نەخۆش:

١- ڕەچاوکردنی داب و نەریتی سەردان کردن، وەك لە سەرخۆ لە دەرگادان و ناوهێنانی خۆت بە ئاشکرا، پاراستنی چاو لە سەیر کردنی ئەملا و لا.. هەندێك جار نەخۆشەکە جەستەی بەدەردەکەوێت یاخود شتێکی ناخۆش ڕوودەدات، کە پێویست ناکات ئاوڕی بە لادا بدەیتەوە..

٢- سەردان کردنی نەخۆش لە کاتی گونجاودا..

٣- بردنی دیاریەك لەگەڵ خۆت، کە نەخۆشەکە خۆشحاڵ بکات.. خۆزگە دیاریەکە

شتێك بێت كە نەخۆشەكە سودمەند بكات، وەك كتێب یان كاسێت یان گۆڤاری بەسود، یاخود شـیرینی یان میوە یان خواردنێك كە نەخۆشـەكە حەزی لێبكات.. بەڵام ئەوەی كـە دەیبینین، كە چەپكە گوڵ بۆ لای نەخۆش دەبرێت، زیادەڕەویە.. نەخۆش سـودی لێنابینێت، بەڵكو هەندێك لە مێژووناسان دەڵێن: ئەمە نەریتی یۆنانیەكان بووە، هەتا ئێستاش مەسـیحیەكان كاریگەرن بەو هەڵسوكەوتەوە.. ئایا نابینیت، كە چەپكە گوڵ لە سەر تابوتو گۆڕەكانیان دادەنێن؟!

٤- پرسـیاركردن لـە نەخـۆش بـە شـێوەیەكی نەرمونیـانو زۆر نەچوونـە ناو وردەكاریەوە..

٥- ئەوەندە دانەنیشیت، نەخۆشەكە بێزار بێت.. نەخۆش پێویستی بە سەرئاو دەبێت، هەروەهـا گۆڕینی جلو بەرگ، هەروەها پێویسـتی بە خـواردنو خەوتن دەبێت، ئەم كارانەش لە بەرامبەر میوانەكاندا نارەحەتە، مەگەر میوانەكە كەسـێكی خۆشەویستو نزیكی نەخۆشـەكە بێت، نەخۆشەكەش حەز بكات ئەو كەسە زیاتر لە لای بمێنێتەوە، لەم حاڵەتەدا قەیناكە..

٦- هەوڵـدان بـۆ دڵخۆش كردنی نەخۆشـەكەو بە بیرهێنانەوەی بە دەسـت هێنانی پاداشتی خودایی، هەروەها دوعا كردن بۆ نەخۆشەكە، لەو دوعایانەش خوێندنی حەوت جـاری ئەم فەرمودەیە: (أسـأل الله العظیم رب العرش العظیم أن یشـفیك)، هەروەها خوێندنی سورەتی (الفاتحة)و (الإخلاص)و (الفلق)و (الناس) بە سەر نەخۆشەكەدا..

## لە پێش نەشتەرگەریدا..

نەخۆشەكان جۆراوجۆرن، ترسناكیو شـێوازی چارەسەریشیان جیاوازن.. جاری وا هەیە پزیشك بڕیاری نەشتەرگەری بۆ نەخۆش دەدات..

پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەری، خۆزگە خوشكو برای نەخۆش، ئەم ئامۆژگاریانەیان لێ قەبوڵ بكردینایە:

١- پشت بەستن بە خودای گەورەو پەنابردن بۆی.. هەموو خۆشیو ناخۆشیو بەڵاو موسـیبەتێك هەر بە دەسـتی خۆیەتی، هەروەك ئەیوب پێغەمبەر ﷺ هاوار لە خودا دەكاتو دەفەرمویت:﴿ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ الأنبیاء/٨٣ واتە: ( بە ڕاسـتی من ئازارو ناخۆشـیم تووش بووە، تۆش لـە هەموو كەس میهرەبانترو لە هەموو كەس دلۆڤانتریت).. تۆ لەبەر دەستی خودا دایتو سكاڵای خۆتی بۆ دەربڕە..

٢- ئـازاو خۆڕاگرو ڕەزامەندو ملکەچ بە.. کەس‌وکارەکەت دڵخۆش بکە.. بەڵێ.. هەوڵ بدە بە سەر خۆتدا زاڵ بیت، بەپێی توانا.. ئەوەی خودا لە چارەی نەنوسی بیت، تووشت نابێت.. ترس‌و غەمبـاری‌و دڵەڕاوکێت، هیچ لە کارەکەت ناگۆڕێت، خەڵکیش بە خۆتەوە دڵتەنگ مەکە، بشـزانە کە هەموو کارێکی موسـڵمان هەر خێرو چاکەیە، ئەگەر تووشـی خۆشـیەك ببێت، سوپاسی خودا دەکات، ئەمەش خێرە بۆی، ئەگەر تووشی ناخۆشیەکیش ببێت، ئارام دەگرێت‌و هەر خێرە بۆی، ئەمەش تەنها بۆ ئیمانداارانە.. ئەوەی ئارامگر بێت، ڕەزامەندی خودا بۆ ئەوە.. ئەوەی نارازی‌و نائارام بێت، توڕەیی خودای لە سەرە..

٣- نوسینی وەسـیەتنامە.. ئەمەش ترسی ناوێت‌و مانای ئەوە نیە کە بەم زووانە دەمریت!! نەخێر.. بەڵکو زانایان نوسـینی وەسـیەتنامە بە واجب دەزانن، بۆ هەموو ئەو کەسـانەی کە شتێکیان لایەو پێویست بە وەسیەت دەکات، وەکو وەسیەت کردن لە ماڵ‌و ساماندا، یان بۆ ماڵ‌و منداڵ، یان بۆ قەرز، یان بۆ هەر شـتێکی تر.. کەواتە پێویسـتە پەراو بهێنیت‌و وەسیەتنامەی خۆت بنوسیت، وەك ئەوەی بڵێیت: فلانە شتم لە لای فلانە کەسە.. شتی فلانە کەسم لە لایە..

داوای تەمـەن درێژی بـۆ خۆمان‌و بۆ ئێوەش لە خودای گـەورە دەکەین، هەروەها داوای عاقیبەت خێری‌و وتەو کرداری چاك لە خودای پەروەردگار دەکەین..

## دەستکەوتێکی ئاسان..

خوشـك‌و بـرای نەخـۆش: خـودا شـیفات بـدات.. ڕاو بۆچونت چیـە دەربارەی خوداپەرستیەکی پێغەمبەری خودا ﷺ کە لە هەموو ساتەکانی تەمەنیدا، ئەنجامیداوە.. خـودای گەورە فەرمانی بە ئیمانـداران کردووە، کە لە دوای نوێژەکان، لە دوای ڕۆژوو، لـە دوای ئەنجامدانـی فەریزەی حەج، هەروەها لە کاتی غەزاو تێکۆشانیشـدا، کە ئەم خوداپەرسـتی‌و عیبادەتـە ئەنجام بـدەن.. فەرمانت پێکراوە کـە ئەنجامی بدەیت لە پێش‌و لە دوای خواردن‌و خواردنەوەدا، لە پێش‌و لە دوای چوونە سەر ئاودا، لە چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە لە ماڵدا، لە پێش خەوتن‌و لە دوای هەڵسان لە خەودا، لە پێش جل‌و بەرگ لەبەرکردن‌و لە دانانیدا..

ئەویش زیکرو یادی خودای پەروەردگارە، سـوپاس کردن‌و بـە گەورە زانینیەتی..

ئیمانداران ئەو کەسـانەن کە خودای گەورە دەربارەیـان دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ آل عمران/ ١٩١ واتە: (ئەوانەی یادی خودا دەکەن لە کاتێکدا کە بە

پێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشـە بیر دەکەنەوە لە دروسـت بوونی ئاسمانەکانو زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەك، سـەرنجی هەموو دیاردەیەك دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروسـت کراوانەت بێهودەو بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیو بێگەردی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ)..

زیکرو یادی خودای گەورە، پێویسـتی بە دەسـت نوێژو ڕووکردنە قیبلەو بە پێوە وەستان، یان دانیشتن نیە، بەڵکو چۆن بۆت دەکرێت بەو شێوەیە ئەنجامی بدە..

ئەبوهورەیرە ﷺ لە شەوو ڕۆژێکدا زیاتر لە دوانزە هەزار جار (سبحان الله)ی وتووە، بۆئەوەی خۆی لە دۆزەخ پێ ڕزگار بکات..

باشـترین زیکـرو یادی خوداش کە نەخـۆش بیانکات بریتیە لە: دوعـاو پارانەوە، چونکە دوعاو پارانەوەی نەخۆش گیراو قبوڵە، هەروەها زۆر وتنی (أستغفرالله)، چونکە ئـەو کەسـەی زۆر ئەم زیکرە بکات خودای گەورە لە هەموو غـەمو خەفەتێك ڕزگاری دەکاتو لە شوێنێکیشـەوە ڕزقو ڕۆزی بۆ دەنێرێت کە هەر بە بیریشـیدا نەهاتبێت.. (أسـتغفرالله) کلیلی ڕزقو ڕۆزیە.. هۆی بەرەکەتی ماڵـە.. هەروەها دەبێتە هۆی چاك بوونی ماڵو منداڵو شیفای نەخۆش..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (ئایا ئاگادارتان بکەم بە باشـترین کردارەکانتان، وە پاکتریـنو چاکترینو بەرزترین کـردار لە لای خودای پەروەردگار، وە باشـتر بێت بۆتان لە بەخشـینی زێڕو پارە، وە لەوەش چاکتر بێت کە بە دوژمنەکانتان بگەنو لە گەردنیـان بدەنو ئەوانیش لە گەردنتان بدەن؟ وتیـان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: زیکرو یادی پەروەردگار).

## نەخۆش و سەرپێچی و تاوان..

ڕۆژێــك چووم بۆ لای نەخۆشـێك، كە تووشــی نەخۆشـیەكی ترسـناك بوو بوو.. نەخۆشــەكە كەسـێكی بەهێزو بە توانا بوو.. بەڵام لە دوای نەخۆشیەكەی، جەستەی لاواز بــوو بوو، ئێسـقانەكانی بێ هێز بــوو بوو.. هەندێك كەس پێیــان ڕاگەیاندم كە پزیشك وتویەتی كۆتایی تەمەنی نزیكە، هەر چەندە تەنها خودای گەورە دەزانێت..

بە ئارامی بەرەو ژوورەكەی كەوتمە ڕێ.. چاوەڕێی ئەوەم دەكرد بە قورئان خوێندنی پێشــوازیم لێبكات، هەروەها چاوەڕێم دەكــرد بەرماڵی نوێژەكەی ڕاخراو بێت و ڕووەو بارەگای خودا بێت..

لــە دەرگامــداو مۆڵەتیاندام كە بچمــە ژوورەوە، ئەو نەیدەزانی كــە منم، چوومە ژوورەكەی.. ژوورەكەی هاوشـێوەی گۆڕسـتان بوو.. ئاوێنەی ژوورەكەی بە ڕەنگی سپی داپۆشرا بوو، بۆئەوەی خۆی نەبینێت و ئاگاداری هەڵوەرینی قژی نەبێت و نەخۆشیەكەی بیر نەكەوێتەوە.. كاتێك بینیمی خۆی ئامادەكرد كە دابنیشێت..

كۆمەڵێــك هاوڕێی لە لا بوو، گەورەترین خەمیان، ئەوە بوو كە نەخۆشــیەكەی لە بیر ببەنەوە.. وا گومانیان دەبرد كە خزمەتێكی گەورەی پێشــكەش دەكەن، كە بیخەنە پێكەنــین.. بەڵێ.. بیخەنە پێكەنین.. تەنهــا پێكەنین.. گەنجەكە كەوتە پێكەنین، یان پێكەنیناوی خۆی دەردەخســت.. نازانم!! لە بیری چوو بوو، كە نامەی كردارەكانی لە هەر ســاتێكدا دەپێچرێتەوەو زۆربەی ئەندامەكانی جەستەی لە كاردەكەون، بەڵكو لە هەر ساتێكدا لەوانەیە بمرێت..

كاتێك دانیشــتم، یەكێكیان هەستاو دەنگی گۆرانی تەلەفزیۆنەكەی كز كرد، هەستم كرد كە ئەوان هەســت دەكەن دانیشــتن و شــەو مانەوەكەیانم لێتێكدان.. لا حول ولا قــوة إلا بالله.. ئــەم دڵانە چەندە ڕەقن.. چاوم بە ژوورەكەدا گێڕاو ئاواتەخواز بووم كە قورئانێك، یان بەرماڵێك یان كاســێتێكی قورئان ببینم، بەڵام زۆر بە داخەوە، تێبینی هیچ یەكێك لەو شتانەم نەكرد..

ئەوەی لێی بوو بریتی بوو لە گۆڤارەكان، بەرگی یەكێكیان وێنەی شاجوانی فەرەنسای لە ســەر بوو، یەكێكی تریان وێنەی یەكێك لە گۆرانی بێژەكانی لە ســەر بوو.. گۆڤاری سێیەمیان دەربارەی گەنج و وەرزش بوو، چوارەمیان....

هەمــوو گۆڤارەكانیش لە تەنیشــتیەوە بوون، بە لاپەڕەكانیشــیانەوە دیار بوو، كە چەندان جار هەڵیدابوونەوەو سەیریشــی كرد بوون.. لە ڕاســتیدا، نزیك بوو بگریم و

سەیریشــم دەکرد، بەڵکو دەمویســت وا لە خۆم بکەم کە فرمێســکەکانی چاوم نەیەنە خوارەوەو دەرنەکەون..

هاوەڵەکانی هەوڵیاندا کە بەشــدار بم لــە پێکەنینەکانیاندا، منیش دڵم رادەگرتن‌و زەردەخەنەم بۆ دەکردن.. یەکێك لە هاورێکانی باســی هەڵوێســتێکی پێکەنیناوی کرد، کە بیســتوویەتی من لە یەکێك لە وتارەکانمدا یان لــە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا بە ســەرم هاتــووە، بۆئەوەی خۆی‌و منیــش پێبکەنین، ئەو هەژارە داماوە وا هەســتی دەکرد کە بەم قسەو توانجە پڕوپوچە، خوێن شیرین دەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا، قسەشی نەکردایە زۆر ڕەزا قورس‌و خوێن تاڵ بوو، چ جای قسەی بکردایە..

زۆرم لە خۆم کردو زەردەخەنەم خســتە ســەر لێوم‌و لە دڵی خۆمــدا وتم: ئــاه.. چۆن هاورێکانی دەتوانن ئارام بگرن‌و لەگەڵیدا بێتاقەت نابن.. تاقەتی دانیشتنەکەیانم نەماو مۆڵەتم وەرگرت‌و چوومە دەرەوە..

لە ڕاڕەوی نەخۆشــخانەکەدا هەنگاوم دەنــا، کاتێك نزیك بوومەوە لە دەرگاکەی، لە دڵی خۆمدا وتم: دروست نیە بڕۆم، هەتا ئامۆژگاری نەکەم، لەوانەیە ئەم یەکتر بینینە دوا دیدار بێت، گومانەکەم ڕاست‌و دروست بوو.. کۆتا دیدارمان بوو..

گەڕامەوە بۆ لای‌و لە دەرگامداو چوومە ژوورەوە.. مۆڵەتم لە هاورێکانی وەرگرت، کە بــۆ کەمێك بە تەنها جێمان بهێڵن.. هاوەڵەکانی چوونە دەرەوەو بە ئارامی دەرگاکەیان داخست‌و تەنها من‌و نەخۆشەکەماینەوە..

سەیری کردم‌و گومانم وا بوو، کە دەزانێت چی پێدەڵێم.. زۆر بە ڕاشکاوی پێم وت: کاتی مجامەلە نیە، دەشــزانی کە تۆ یەکێکی لە خۆشەویسترین کەسم.. تامەزرۆییم بۆ تۆ، وای لێکردم کە کارەکەم بەجێ بهێڵم‌و بێم بۆ سەردانت.. کاتێك بە نەخۆشیەکەتم زانی دڵگران بووم.. وا هەســت دەکەم کە خەمــی من بۆ تۆ کەمتر نیە لە خەمی تۆ بۆ من.. ئەگەر تۆ بە فرمێسك بۆ خۆت بگریت، ئەوا من بە خوێنم بۆت دەگریم..

سەری دانەواندو گریا.. منیش هەنسکمدا.. وتم: هاتمە ژوورەوە بۆ لات‌و گومانم وا بوو کە لە سەر بەرماڵ دەتبینم، یان لە کاتێکدا دەتبینم کە قورئانت بە دەستەوە بێت، خــۆ تۆ پەیمانی نەمریت پێنەدراوە.. بە دڵنیاییەوە پزیشــکەکە پێی ڕاگەیاندویت کە نەخۆشیەکەت پەرەی سەندووە.. ژیانی دونیاشت لەوانەیە چەند ڕۆژێکی دیاری کراوی مابێت.. نازانم هەینی داهاتوو لەگەڵماندا نوێژ دەکەیت، یان نوێژت لە ســەر دەکەین..

زیاتر گریا..

وا شایستەیە بۆ کەسێك کە پەڕاوی کردارەکانی بپێچرێتەوەو هەناسەکانی لە سەری بژمێردرێت کە زیاتر بەپێی توانا لە خودای گەورە نزیك ببێتەوە..

کەسی لەش ساغ فەرمان پێکراوە بە خۆشەویستیو ملکەچی خودای گەورە، کەواتە کەسی نەخۆش زیاتر پێویستە فەرمانەکانی خودای گەورە جێبەجێ بکات.. تۆ لە کوێ بوویت دەربارەی پاڕانەوەو زیکرو یادی خودا بۆت بدوێم.. کوا دڵ نەرمیەکەت؟ کوا ئەو ئازایەتیەی کە پەیمانت پێدا؟ کوا ئەو قسەیەی کە ڕۆژێك وتت: پێویستە مرۆڤ تف بکاتە دەموچاوی شەیتانو ئاور لە وەسوەسەکانی نەداتەوە.. چۆن لەم کاتی پێویستیەدا لە خودای گەورە دوور دەکەویتەوە؟!

زیاتر گریا.. بە چەند وشەیەك ستایشی کردم، پاشان لە لای ڕۆیشتمە دەرەوە.. پاش سێ ڕۆژ کۆچی دوایی کردو نوێژمان لە سەر کرد.. خودا بە بەزەیی بێت لەگەڵیداو پلەی بەرز بکاتەوە.. ئامین..

## نەخۆشەکان جۆراو جۆرن..

لە ڕەمەزاندا گەشتێکم کرد بۆ وڵاتێکی ئەوروپی.. کەشو هەوا زۆر سارد بوو، لە ناوەندی ئیسلامی کۆبووینەوەو نوێژی تەراویحمان ئەنجامدا، پاشان ئامۆژگاری ڕۆژانەم بۆباس کردن..

پیاوێکی پیر، کە توانای ڕۆیشتنی نەبوو یەکێك لە کوڕەکانی لە سەر عەرەبانەیەك هێنا بووی، کە پاڵی پێوەی دەنا.. شەوێك لە شەوان نەمبینیو دیار نەما.. وتم: لەوانەیە کەشو هەوای ساردو باو باران ڕێگری لە هاتنی بۆ مزگەوت کرد بێت.. شەوی دووەمیش بە هەمان شێوە تێپەڕی.. شەوی سێیەمیش هەر دیار نەبوو.. پرسیارم لە کوڕەکەی کردو هەواڵی پێدام کە توشی نەخۆشی بووەو ماوەی سێ ڕۆژە لە نەخۆشخانە خەواندویانە.. لەگەڵ هەندێك لە نوێژ خوێناندا ڕێکەوتین، کە سبەی عەسر سەردانی بکەین..

چووین بۆ نەخۆشخانەو چووینە ژوورەوە.. شێوەمان سەرنج ڕاکێش بوو.. من پۆشاکێکم لەبەردا بوو.. کەسێکی تر پۆشاکێکی درێژیلەبەردا بوو.. سێیەم پانتۆڵی لە پێدا بوو..

یەکێك لە پەرستارەکان پرسیاری لێکردینو وتی: ئایا ئێوە هەمووتان کوڕی ئەون؟!

وتمان: نەخێر..

پەرستارەکە وتی: کەواتە ئێوە کۆمەڵەیەکی خێرخوازین..

وتمان: نەخێر..

وتـــی: کەواتە ئێوە کێن؟! بۆچی هەمووتـــان هاتوون بۆ لای؟! کێ کرێی ئوتومبیلی بۆ داون؟

من سەرســامیەکەیم لا ســەیر نەبــوو، لەبەرئەوەی پەرســتارەکە وا ڕاهات بوو کە پیاوێکی پیر لە نەخۆشــخانە، دوو یان سێ مانگ بمێنێتەوەو کەسێك سەردانی نەکات، بەڵکو جاری وا هەیە، کە دەشــمرێت، نەخۆشــخانە ئەرکی کفنو دفن کردنی دەگرێتە ئەستۆو منداڵەکانی لێی ناپرســنەوە.. تێمان گەیاند، کە ئێمە موسڵمانینو ئەویش لە ئیســلامدا برامانە.. لە ژووری هاوەڵەکەمان ڕۆیشتینو یەکێك لە هاوەڵەکانمان لەگەڵ پەرستارەکەدا مایەوەو باسی ئیسلامی بۆ دەکرد..

چووین بۆ لای باوکی عیماد، کە پیاوێکی بە تەمەن بوو.. شوێنەواری نەخۆشی پێوە دیار بوو.. ســەریم ماچ کرد.. گریــاو پێم وت: حاڵت چۆنە؟ وتی: ســوپاس بۆ خودا.. ناتوانم بە ڕۆژوو بم، بەڵام قورئان دەخوێنمو بە پێی توانا زیکرو یادی خودا دەکەم.. درێژەی پێداو باسی تامەزرۆیی خۆیی بۆ مزگەوتو ئەنجامدانی نوێژی تەراویح کردو دڵی پڕو چاوی پڕ فرمێسکی، قسەکانیان پێ دەبڕی..

چــاوم بە ژوورەکەیدا گێڕاو دوو پیاوی پیرم بینی ، کە خەڵکی ئەو وڵاتە ئەوروپیە بــوون.. زمانەکەیانم باش نەدەزانـــی.. یەکێك لە هاوەڵانم نارد بۆ لایان، تا ســڵاویان لــێ بکات، هەروەها هەواڵیان بپرســێت.. ســەیریان لـــە ئێمە دەهــات.. ئەوەی جێی سەرســورمان بوو هەمان ئەو پرســیارانەیان لێ کردین کە پەرســتارەکە لێی کردین.. ئێوە کێن؟! کۆمەڵەیەکی خێرخوازین؟! کاتێك پێمان ڕاگەیاندن، کە هیچ خزمایەتیەك لە نێوان ئێمەو ئەودا نیە، تەنها هاوئاینی نەبێت، هەروەها هیچ پارەو سامانێکیشــمان لە بەرامبەر ســەردان کردنیدا پێ نادات.. هەریەکەیان بە سەرســامیەوە سەیری ئەوی تریانی دەکرد..

لە بیرمە کە یەکێکیان شانازی بە سەر هاوەڵەکەیدا دەکردو دەیوت: کچەکەم جەژنی ڕابوردوو کارتێکی پیرۆزبایی بۆ ناردم..

بــۆ ماڵئاوایــی گەڕامەوە بۆ لای باوکــی عیمادو دوو پیاوەکەش لە دوورەوە ســەیریان دەکردم، لێم پرســی: ئێوە هیچ قسەو وتوێژێکتان لە نێواندا هەیە؟ وتی: یا شێخ ئەو دوو

پیاوە کاتەکانیان سەیر بە سەر دەبەن.. وتم: چۆن؟! وتی: هەتا عەسر دەخەون، کاتێك کە هەڵدەستن، برسیانە.. پەرستارەکە خواردنیان بۆ ئامادە دەکات، کاتێك تێر دەبن، ئاخ و ئۆف هەڵدەکێشــن و تورە دەبن و جنێو دەدەن و هاواریان نەخۆشخانەکە پڕ دەکات و پەرستارەکە یەکی شوشەیەك عارەقیان بۆ دەهێنێت، وا دەزانم کە خەولێخەر بێت، دەیخۆنەوە و دەخەون هەتا سبەی عەسر!! پاشان لە خەو هەڵدەستن و هەمان بەرنامە دوبارە دەکەنەوە..

## ترس لە نەخۆشی..

یەکێك لە قوتابیەکانم لە زانکۆ، تەمەنی نزیکی چل ســاڵ دەبوو، وام گومان دەبرد هەر بیســت و پێنج ساڵێك بێت.. چەند ڕۆژێك دیار نەماو نەمبینی، پاشان بینیمەوە و ســەبارەت بە دیار نەبوونەکەی پرســیارم لێکــرد، ئەویش وتی: کوڕەکەم نەخۆشــە و خەریکی چارەسەری بووم..

وتم: خودا شیفای بدات، توشی چی بووە؟!

وتی: توشــی ژەهــراوی بوونی خوێن بووە و کاری کردووەتە ســەر جگەر و دەماغی، ئێستاش نەخۆشیەکە بە لاشەیدا بڵاوبووەتەوە..

وتم: الحمدلله علی کل حال، مژدە بێت ئەجر و پاداشتی گەورەت هەیە، هەتا ئەگەر گیانیش بســپێرێت و بمرێت، لەبەرئــەوەی مردنی منداڵی بچوك شــەفاعەت و تکا بۆ باوك و دایکی دەکات..

وتی: یا شێخ منداڵی بچوکی چی؟! تەمەنی حەڤدە ساڵە..

وتم: سوپاس بۆ خودا.. خودا بەرەکەت بخاتە براکانیەوە و بیان پارێزێت..

کەمێك مات بوو، وتی: یا شێخ تەنها ئەو کوڕەم هەیە و بەس!! بەڵام سوێند بە خودا سوپاســگوزارم.. ئارامگرم و چاوەڕێی پاداشــتی خودا دەکەم.. هەموو شتێکیش بە پێی قەزاو قەدەرە..

توخوا بەراوردێك لە نێوان ئەم کەسە ئارامگرە و کۆمەڵێکی ترساوی بێ هێزی دارو خاوی ئیمان لاوازدا بکە.. ئەو کەسانەی کە ئارامگر نین و بە تەمای پاداشتی خودا نین..

## تەنها خاڵێکی بچوک..

د.ئەریج وتی: بە هێواشــی لــە دەرگای عیادەکەی داو پەرســتارەکە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پێدا، مێردەکەی و کچەکەشــی لەگەڵیدا بــوو.. لێی ورد بوومەوە، ئافرەتێك بوو لە تەمەنی چل ســاڵیدا بوو، کەمێك قەڵەو بوو، بە شــێوەیەکی ئاشــکرا دیار بوو، کە زۆر بایەخی بە خۆی دەدا.. لە ســەر کورســیەك دانیشــت و دەســتی کرد بە قسەو وتی: پێویســتم بە ڕاو بۆچونت هەیە بۆ ئەو کێشەیەی کە ماوەیەکی دوورو درێژە بە دەستیەوە دەناڵێنم.. زەردەخەنەیەکم بۆ کرد..

زیاتر درێژەی پێداو قسەی بۆ کردم دەربارەی ئەو شتەی کە ماوەیەکی زۆرە ماندووی کردووە، ئەویش چەند خاڵێك بوو لە دەموچاویدا.. بۆ چارەســەری ئەو چەند خاڵەی دەموچاوی سەردانی زۆرێك لە پزیشــکان و ناوەندە جوانکاریەکانی کرد بوو.. ئێستاش مــاوەی چەند مانگێکــە دەرمانێك بەکاردەهێنێت، کە ئەو دەرمانە بەوە ناســراوە، کە دەبێت بە شێوەیەکی زۆر ورد چاودێری بکرێت بۆئەوەی کارنەکاتە سەر جگەر..

پێم وت: کوا ئەو خاڵانەی ڕوخســارت؟! شــوێنی خاڵەکانــم نەبینی، بەردەوام بوو لە گێڕانەوەی ئەو نارەحەتیانەی کە لە ماوەی چارەســەریدا توشی هات بوو، بە ڕاستی هیــلاك و ماندو بوو.. جارێکی تر پرســیارەکەم دوبارە کــردەوە.. ڕێگەم پێدەدەی کە پشکنین بۆ ئەو خاڵانەت بکەم کە مەبەستتە؟

کاتێك ڕوخساری بە دەرخست، خەریك بوو دەستێك بە دەموچاومدا بهێنم، گومانم هەبوو لەوەی کە بینیم!! ببورە؟! ئازیزەکەم، کوا ئەو خاڵانەی کە مەبەستتە؟!

وتی: ئەوەتا دکتۆرە.. تەنها خاڵێکەو بەس!! جارێکی تر سەیرم کردەوە، خاڵێکی زۆر بچوك، کە بە ئاسانی نەدەبینرا..

وتم: ئێستا ئەمەیە بێزاری کردوویت؟!

وتی: بەڵێ.. دەرونم زۆر هیلاکەو تکات لێدەکەم یارمەتیم بدەیت..

سەیرە!! پێموت: بەڵام دەبینم ڕوخسارت زۆر باشە..

قســەی پێ بڕیم و وتی: ئــاە.. نــا.. نــا.. باش نیەو لێی ڕازی نیم!! ماوەیەکی درێژ خۆم گرت و بە ســەر خۆمدا زاڵ بووم.. پێش ئەو پشــکنینم بۆ کەسانێك کرد بوو، کە حاڵیان خراپ بوو، خودای گەورە بە نەخۆشــی توند تاقی کردبوونەوەو چارەســەریان نەبوو، سوپاسگوزارو ئارامگریش بوون..

بــە هێواشــی پێمــوت: ئازیزەکەم ئــەم کارە ئەوەنــدە خراپ نابینم کــە تۆ بیری

لێدەکەیتەوە، هەتاوەکو ئەو دەرمانەش کە ئێستا بە کاری دەهێنیت، بە پێویستی نازانم، دەتوانیت لە ئەمڕۆوە واز لە بەکارهێنانی بهێنیت، ئەو خاڵەش زۆر بچوکە.. نامەوێت زۆر بایەخی پێبدەیت.. گەشبین بەو تەماشای لایەنە جوانەکانو ئەو نازو نیعمەتە زۆرانە بکە کە خودا پێبەخشیویتو سوپاسگوزاریش بە..

پاش چەند چرکەیەك لە بێدەنگی، وتی: دەمەوێت دەرمانەکە تەواو بکەم، هەروەها ئەمجارەیان دەمەوێت ئەو خاڵە بە تەواوی نەمێنێت..

باشە ئازیزەکەم، بڕیار بڕیاری خۆتە، دەرمانەکە تەواو بکە.. هەر کاتێکیش ویستت واز لە دەرمانەکە بهێنیت، بەخێربێیت بۆ عیادە..

خۆزگەم دەخواست کە مێردەکەی لە بەرامبەر مندا ڕێگای پێشانی هاوسەرەکەی بدایەو پێی بوتایە: هاوسەرەکەم پێویستیت بە دەواو دەرمان نیەو ئەو خاڵەش بچوکەو پێویست ناکات ئەوەندە گرنگی پێبدەیت.. من دەمزانی ئەگەر ئەو قسانەی بکردایە، زۆرێك لە ترسو بەربەستەکانی تێکدەشکاند، بەڵام بە درێژایی کات بێدەنگ بوو!! ئاه بۆ پیاوان!!

## لە کۆتاییدا..

براو خوشکی نەخۆش..

پزیشکی بەڕێز..

هاوەڵی دڵسۆزی نەخۆش..

ئەمە گەڕانێکی خێرابوو سەبارەت بە نەخۆشی و نەخۆشەکان..

پەیامێك بوو بۆ خوشكو برا پزیشکەکان..

بۆ هەموو ئەو کەسانەی نەخۆشیان هەیەو دەردەدارن..

داواکارم کە سودمەند بووبێتو بۆ ساتێکیش بێت، ئازاری نەخۆشو دەردەدارەکانی شکاندبێتو هیوایەکیان لە دڵو دەروونداو بۆ دروست بووبێت..

خودای گەورەش لێمانی وەرگرتبێت..

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد و آله وصحبه أجمعين..



بەشێك لەنوسراوە زێڕینەكانی د. محەمەد عەریفی

# محمد صلى الله عليه وسلم

# ڕێبازی ژیان



وەرگێڕانی

هێمن محەمەد عەلی

# محمد ﷺ ڕێبازی ژیان

★ چل قوتابـی دەبوون.. لە قۆناغی دووەمـی زانکۆدا بوون.. پرسـیارم لێکردن‌و پێم وتن: خێزانەکانـی پێغەمبەری خوداﷺ ناویان چی بوو؟ یەکێکیان وتی: ئامینە..

یەکێکی تریان وتی فاطمە..

★ ئا لەم کاتەدا دڵم پڕ بوو.. فرمێسک‌و ئەسرین لە چاوەکانمدا قەتیـس مان..بـیری ئـەم ئایەتـەی پەروەردگـارم کەوتەوە کە دەفەرموێت: ﴿أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ المؤمنون.

★ ئەم کتێبەی بەردەسـتت، پێناسـەیەکی کورتی پێغەمبەری ئازیـزەﷺ.. هەندێك لە نیشـانەو موعجیزەکانیەتی.. باسـێکی کورتی ئاکارو گوفتارەکانیەتی..

★ ئەم کتێبەی بەردەستت، پەیامێکە بۆ خوشك‌و برا لاوەکان.. بۆ ئەوەی پێغەمبەرەکەیان بناسن..

★ ئەو پێغەمبـەرەی کە پەروەردگار دەربـارەی دەفەرموێت: ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ التوبة..

★ هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء.

★ داواکاریـن لـە پەروەردگـار یارمەتیمان بـدات، بۆ ئەوەی بتوانـین ڕێزێنی ئەو پێغەمبەرە ئازیـزەﷺ هەڵبگرین‌و بتوانین ئەو خۆشەویستەمان بە جیهان‌و دەوروبەرمان بناسێنین..

د. محەمەد عەریفی
arefe@gawab.com

## پێشەکی..

به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

پرۆژەی جوانو دڵنشـینی دۆستانی موحەممەدﷺ، بۆ جارێکی تر، بە بەرهەمێکی ئیمانـیو ئاكاری ناوازە بەسـەرمان دەكاتەوە، بەرهەمەكـەش بریتیە لە وەرگێڕراوی ئـەم كتێبە بەنرخو بایەخدارەی زانای ئەدەب زانو خـاوەن قەڵەمی ڕەوان (د. محمد عبدالرحمن العریفی) .

كاتێـك ئەركی پێداچونـەوەی ئەم كتێبەم لـە لایەن بەڕێوەبەرانـی پرۆژەكەوە، پێسـپێردرا، بە پێویستم زانی بە وردی بیخوێنمەوەو سـەرنجی خۆمی لەسەر تۆمار بكەمو ببم بە شایەت بەسەریەوە.

كەدەسـتم پێكرد، تەماشـام كرد لـە ڕووی ناوەرۆكەوە، پڕە لە زانسـتو چەمكی پێویستی بڕوایی، بۆ نەوەی نوێی ئیسلام لە كوردستان، هەروەها بە شێوەیەكی ئەدەبیو زنجیرە مانایەكی پێكەوە بەستراو، كەهەر هەموویان لە خزمەت حەقیقەتێكی ڕۆشنی جیهانبینی ئیسـلامیانەدان، كە ئەویش حەقیقەتـی بڕوابونە بە خەتمی مەرتەبەت، موحەممەدی موسـتەفاﷺ و توانەوە لە ئەویـنو مەحەببەتی ئەو زاتە گەورەیە، كە خودای پەروەردگار ڕێزو حورمەتی تایبەتی بۆ داناوەو ناوی ئەوی بەرزو بڵندو پیرۆز ڕاگرتووە.

بێگومان ئەم ئەوینو مەحەببەتەش، داخوازیو موقتەزای خۆی هەیە، كە ئەویش پەیڕەو كردنی دڵسۆزانەیە لە سـوننەتو سیرەتو خەسڵەتە بەرزو ناوازەكانی بەپێی وزەی مرۆڤ.

وەرگێڕرانی ئەم كتێبە لەم ساتو وەختانەدا، كە ڕەوتی ئیسلامخوازانەی كوردستان بـەرەو قۆناغێكی چڵۆنایەتی گرنگ هەنگاو دەنێـت، خزمەتێكی لە بارو هەموارە بە ئەسـڵی كۆبونەوە، لەسەر مەحەببەتی ئەو پێغەمبەرە سەرومرو سالارەی، كە هە موو

تەمەنـــی پیرۆزی تەرخانکردبوو بۆ پێگەیانـــدن و تێگەیاندنی مرۆڤ، لە مانای بوونو ژیانو هەســـتان بـــە ئەرکو فرمانی تەســـلیم بوون بە حوکمو بڕیـــاری خودای تاکو تەنها.

دەستخۆشـــیش لە وەرگێڕو برای هێژاو بەڕێزم کاك (هێمن محمد علی) دەکەم، کە هەســـتاوە بە وەرگێڕانـــی ئەم کتێبەو توانیویەتی بـــە ئەمانەتێکی باشو بە زمانێکی پاراو بیکاتە کوردیو پێشکەشی دۆستانی موحەممەدی بکات.

هیـــوای ســـەرکەوتنو بەردەوامی بۆ ئەم پـــرۆژە جوانەش لە خـــودای پەروەردگار دەخوازم.

والله من وراء القصد.

براتان

پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.صەباح بەرزنجی

٢٢/ربیع الأول/١٤٣١

٢٠١٠/٣/٨



## سەرەتا..

رۆژێك لەو رۆژانەی کە دەچووم بۆ کۆلێژ بۆ لای قوتابیەکانم، تووشـــی هەڵوێستو حاڵەتێکی نارەحەتو ناخۆش بووم.. وانەی ئەو رۆژەم ســـەبارەت بە ژیانی پێشـــەوای مرۆڤایەتی بوو.. ســـەبارەت بە محمدی راستگۆ ﷺ .. قوتابیەکانم لە قۆناغی دووەمی زانکۆدا بوون..

لە بەرامبەریان راوەســـتامو ویستم ئاستی زانیارییان بزانم، بۆ ئەوەی بە ئەندازەی رادەی زانیاریو تێگەیشـــتنی قوتابیەکانم قســـە بکەم، پرسیارم لێکردنو وتم: گەنجو لاوەکان، ناوی چوار لە هاوسەرەکانی پێغەمبەرم ﷺ پێبڵێن..

پرســـیارەکەم زۆر ئاســـان بوو، بە شـــەرمەوە ئەم پرســـیارەم لێکردن.. قوتابیەکان ژمارەیـــان چل کەس دەبوو، لە ناویاندا یەکێکیان دەســـتی بـــەرز کردەوەو بە دەنگێکی بەرز وتی: دکتۆر..

وتم: بەڵێ..

وتی: خەدیجە.. بە پەنجەکانی دەستم دەمژماردنو وتم: زۆر باشە.. کەسێکی تریان دەستی بەرزکردەوەو وتی: عائیشە..

وتم: ئافەرین.. پاشان هەر چلیان بێدەنگ بوون!!

بەڵێ.. هەر چلیان بێدەنگ بوون!! بە ناویاندا دەگەرامو وشەی (بە داخەوە)م دوبارە دەکردەوە..

ئایا پێشەواکەتان ناناسن؟!

ئایا دایکانی ئیماندار ناناسن؟!

یەکێکیان وتی: دکتۆر.. دکتۆر.. ناوی یەکێکیانم بیر هاتەوە..

وتم: کامیان؟

وتی: ئامینە..

ئامینە!!

ئامینـــە دایکـــی پێغەمبـــەرە ﷺ!! ئەو هـــەژارە گومانی وابـــوو کە ئامینـــە یەکێکە لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ.. ئامینە!! دایکیەتی، خودا لە دایکت نەستێنێت!!

شەرم دایگرتو بێدەنگ بوو.. بێدەنگی ئەوانو غەمیش منی داگرت..

یەکێکی تریان ویستی ئەم حاڵەتە کۆتایی پێ بهێنێتو بەوەی کە بە خەیاڵیدا هات وتی: دکتۆر.. ناوی هاوسەرێکم بیرکەوتەوە..

وتم: ئادەی، کامیان؟

وتی: فاطمە..

هەندێك لە قوتابیەکان دەستیان کرد بە پێکەنینو هەندێکیشیان سەریان سورما بوو.. هەندێکی تریان هیچ کاریگەریو هەڵسوکەوتێکیان نەنواند، لەبەرئەوەی گومانیان وابوو وەڵامەکە ڕاستەو یەکێکە لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ ..

وتم: فاطمە (خودای لێ ڕازی بێت) کچی پێغەمبەرە ﷺ .. قوتابیەکە بێدەنگ بوو.. بەڵکو هەموویان بێدەنگ بوون..

وتم: ئەی گەنجو لاوەکان ناوی پێنج لە یاریزانانی تیپی.. تیپی.. تیپی بەرازیلم پێبڵێن.. هەموو هاواریان کرد: من.. من.. ناوی یاریزانەکان وەکو دابباران، داباریـن.. ڕۆناڵدۆ.. ڕۆبینهۆ.. هتد..

بە دەستەکانم دەمژماردن، کاتێك پەنجەکانی یەکێك لە دەستەکانم تەواو بوو، بە دەستەکەی ترم دەمژماردن، پەنجەکانی دەستەکەی تریشم کۆتاییان هات، دوبارە گەڕامەوە بۆ لای پەنجەکانی دەستی یەکەممو ناوی پانزە یاریزانیان بۆ ژماردم!!

پرسیارم لێکردنو وتم: ئەوەی من بزانم ژمارەی یاریزانانی تۆپی پێ یانزە کەسە، بۆ ناوی پانزە یاریزانتان ژمارد؟!

وتیان: لەبەرئەوەی ناوی یاریزانە بنەڕەتیو یەدەکەکانیشمان بۆ ژماردی..

ئەوەی سەیر بوو بەلامەوە، ئەوە بوو، کاتێك کە یاریزانەکانم بە پەنجەکانی دەستم دەژماردو ناوەکانیانم دوبارە دەکردەوەو لە وتنی ناوەکانیاندا هەڵەم دەکرد، پێدەکەنینو ناوەکانیان بۆ ڕاست دەکردمەوە..

بە ڕاستی فەرمایشتی پەروەردگار جوانو ڕاستو دروستە، کە دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُواْ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ المؤمنون. واتە: (یان ئەوەیە پێغەمبەرەکەیان نەناسیوەو ئەوە بۆتە هۆی ئەوەی بڕوا بە پەیامەکەی نەکەنو دژی بوەستن!!)..

قوتابیەکانم هەستیان بەو غەمو پەژارەیە کرد، کە ڕوخساری داپۆشیم.. ویستیان

پـۆزش بهێنـنـەوەو وتیان: داوای لێبوردن دەکەین یاشـێخ، سەرزەنشـتی ئێمە مەکە، لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، ناوو ناوبانگی ئەو کەسانەی دەرخستووەو بەرزی کردوونەتەوە، بۆیە ئێمە لەبەرمان کردوون..

وتم: پۆزش‌و بیانوو مەهێننەوە، ڕاسـتە هۆیەکانی ڕاگەیاندن ئەو کەسانەی گەورە کـردووە، بەڵام خۆ ڕاگەیاندنـەکان زۆریان لێنەکردوون، کە بە شـوێن هەواڵەکانیاندا بچن‌و زانیاریان لە سەر پەیدا بکەن..

ئایا ناچاریان کردوون ناوی ئەو کەسانە لەبەر بکەن؟!

ناچاریان کردوون بیکەن بە بابەتی کۆڕو دانیشتنەکانتان؟!

ناچاریان کردوون، لە جل‌وبەرگەکانی ئەوان لەبەر بکەن؟! یان لاسـاییان بکەنەوەو قژەکانتان بە شێوەی ئەوان شانە بکەن؟!

ڕاستە چەندان کەناڵی وەرزشی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندان کەناڵی زانیاری بەسوود هەیە.. چەندان کەناڵی ئاینی هەیە، لەبەرئەوە هیچ پۆزشێك مەهێننەوە..

جارێکـی تر لـە یەکێك لە دێهاتـەکان وتارێکم پێشـکەش کرد، بە هەمان شـێوە وتارەکـەم دەربارەی ژیانی پێغەمبەری ئازیز بوو ﷺ .. لەبیرمە لە کۆتایی وتارەکەمدا باسی گرنگی زانین‌و فێربوونی ژیانی پێغەمبەرم ﷺ بۆ کردن، لە بەرامبەرمدا چەند کەسـێك کە تەمەنیان نەدەگەیشتە بیست ساڵ دانیشـتبوون، ڕووداوەکەی پێشووم بە خەیاڵدا هات‌و پاشـان باسـی ئـەو ڕووداوەم بۆ کردن، کە لە نێـوان من‌و قوتابیەکانی زانکـۆدا ڕوویـدا، کە پێم وتبوون: ناوی چوار لە هاوسـەرەکانی پێغەمبـەرم پێبڵێن‌و پاشان ڕووداوەکەم بۆ تەواو کردن، کارەکە تا ئێرە ئاسایی بوو، بەڵام کاتێك کە وتم: بە قوتابیەکانی زانکۆم وتووە، ناوی پێنج لە یاریزانانی هەڵبژاردەی بەرازیلم پێبڵێن، ئەو منـداڵ‌و لاوانەی لە بەرامبەرم بـوون، هاواریان کردو وتیان: من.. من.. من.. وایانزانی پرسیار لەوان دەکەم!!

سەیری یەکێکیانم کردو وتم: دەی زیرەك‌و وریا، وەڵامم بدەرەوە.. وتی: ڕۆناڵدۆ.. و..

وتم: بەسە.. پۆلی چەندی پاڵەوان؟

وتی: چوارەمی سەرەتایی..

بە یەکێکی تریانم وت: تۆ..



وتی: ڕۆناڵدینهۆ..

وتم: تۆ پۆلی چەندی؟

وتی: پێنجەمی سەرەتایی..

خەریك بوو فرمێسك بە چاوەکانمدا بێتە خوارێ، سەیری هەندێك لە خەڵکەکەم کرد، هاوشێوەی من بوونو لە ڕقا چاویان فرمێسکی تێدا وەستا بوو.. بۆم دەرکەوتو هەستم بــەوە کرد، ئێمە زۆر پێویســتمان بەوە هەیە ئەو پێغەمبــەرە نازدارەمان دەربخەینو بــەرزی بکەینەوەو ژیانو ڕەوشــتە جوانەکانی بۆ خەڵکی بە گشــتیو موســڵمانان بە تایبەتی باس بکەین..

ئەو پێغەمبەرەی لە گیانی خۆمان خۆشەویسترە لە لامان..

ئەم پەڕتوکە بەشــێکی کەمە لە ژیانی ئەو ســەرومرە ﷺ، باس کردنی بەشــێك لە موعجیزەکانیەتی، هەروەها بەشــێك لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، هیوادارم سوودی لێ ببینرێت..


د. محمد عبدالرحمن العريفي

مامۆستای زانکۆو وتاربێژی مزگەوتی البواردي لە ڕیازو

ئەندامی دەستەی باڵای ڕاگەیاندنی ئیسلامی

ڕیاز ١٤٢٨/٥/١

﴿أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾

**❖ ناو: محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی هاشـــم ی کوڕی عبدمناف کوڕی قصی کوڕی کیلاب..**

**❖ هۆز: قورەیشی هاشمی..**

**❖ نازناو: أبو القاسم..**

**❖ نـــاوی دایکـــی: ئامینـــەی کچی وەهبـــی کوڕی عبدمنـــاف کوڕی زوهـــرەی کوڕی کیلاب..**

**❖ ڕۆژو شـــوێنی لە دایك بوونی: پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕۆژی دووشـــەممەی ١٢ی ڕەبیعی یەکەم لە ســـاڵی فیل بەرامبەر ٢٠ی نیســـانی ساڵی ٥٧١ زاینی لە ماڵی أبو طالبی مامی لە دایك بووەو حەلیمەی سەعدیە شیری پێداوە..**

**❖ بە بێباوکی لە دایك بوو: لە سکی دایکیدا بوو باوکی کۆچی دوایی کرد.. پاشان دایکیشی کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خودا ﷺ لەو کاتەدا تەمەنی شەش ساڵان بوو.. پاشان باپیری گرتیە خۆیو لە تەمەنی هەشت ساڵیدا باپیریشی کۆچی دوایی کرد.. پاشان أبو طالب ئەرکی بەخێوکردنی گرتە ئەستۆ..**

**❖ ژیانی هاوسەری: لە تەمەنی بیستو پێنج ساڵیدا یەکەمین ژیانی هاوسەری لەگەڵ خەدیجەی کچی خوەیلددا پێك هێنا، کە لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو، خەدیجە (خودای لێی ڕازی بێت) سێ ساڵ پێش کۆچ کردن بۆ شاری مەدینە کۆچی دوایی کرد..**

**شـــایەنی باســـە پێغەمبەری خودا ﷺ سەرجەم هاوســـەرگیریەکانی لە دوای کۆچی دوایی خاتوو خەدیجە ئەنجامداوە..**

**پاشـــان خاتوو (سەودەی کچی زومعە)ی مارە کردووە.. پاشان خاتوو (عائشە ی کچی ابوبکر) ﷺ ی مارە کردووە.. پاشـــان (حفصـــەی کچی عومەری کوڕی خەتتاب) ﷺ ی مارە کردووە.. پاشان (زەینەبی کچی خوزەیمە).. پاشان (ئوم سەلەمە) کە ناوی (هیندی کچی ئومەیە)یە.. پاشـــان (زەینەبی کچی جەحش).. پاشان (جومەیریەی کچی حارس).. پاشـــان (ئوم حەبیبە) کە ناوی (ڕەملەی کچی ئەبو ســـوفیانە).. پاشـــان (صفیەی کچی**

حەی).. پاشـان (مەیمونەی کچی حارس)ی مارە کرد، کە ئەمەیان کۆتا هاوسـەرگیری پێغەمبەری خودا ﷺ بوو، ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێت..

❖ منداڵەکانی: پێغەمبەری ئازیز ﷺ خاوەنی سێ کوڕو چوار کچ بووە.. منداڵەکانی کـە لە خاتوو خەدیجە بوون، بریتی بوون لە (القاسـمو عبدالله) کـە هەر بە منداڵی کۆچی دواییان کرد.. إبراهیمی کوڕیشـی لە (ماریەی قیبتی)بوو، بە هەمان شێوە هەر بـە منداڵی کۆچـی دوایی کرد.. کچەکانیشـی ناویان (زەینەبو ڕوقیـەو ئوم کلثوم و فاطمە)بوو، هەمووشیان لە خەدیجەی دایکی ئیمانداران بوون..

جگە لە فاطمە، هەموویان لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ کۆچی دواییان کرد..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ لە لایەن پەروەردگارەوە سروشی بۆ هات، لە کاتێکدا کە لە ئەشکەوتی (حراء)خەریکی عیبادەت بوو..

محمد ﷺ کۆتا پەیامبەری سەرجەم مرۆڤایەتیە، هەر وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾سبأ. واتە: (ئێمە تەنها بۆ هەموو خەڵکی نەبێـت، تۆمان ڕەوانە نەکردووە، لە کاتێکدا مژدەدەرو ترسێنەریت بۆیان، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەم ڕاستیە نازانن)..

❖ لـە مانگی ڕەمەزانی پـیرۆزدا یەکەمین ئایەتی قورئانی پـیرۆزی بۆ دابەزی، کە بریتی بوو لەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾العلق. واتە: (ئەی محمد ﷺ بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شـتێکی دروست کردووە).. دابەزینی قورئانیش لە ڕێگەی جبریلەوە بوو عليه السلام ..

❖ سـێ سـاڵی یەکەمی دەسـت پێکردنی بانگەوازەکەی بە شـێوەیەکی نهێنی بوو، پاشان پەروەردگار فرمانی پێکرد، کەبانگەوازی ئیسلام ئاشکرا بکاتو هۆزەکەی ئاگادار بکاتەوەو بانگیان بکات بۆ یەکتاپەرستی..

❖ بەڵـێ.. پێغەمبـەری ئازیـز ﷺ قۆڵـی مەردایەتی لـێ هەڵماڵـیو بانگەوازی یەکتاپەرسـتی بە گوێی بت پەرستانی قورەیشـدادا.. ئەم بانگەوازە وەکو هەورە گرمە بەر گوێی بت پەرسـتان کەوتو سـوکاتیەکیش بوو، کە بەرامبەر خودا درۆینەکانیان کرا، لەبەر ئەوە گەورەو سـتەمکارەکانی قورەیش، کەوتنە ئازاردانو چەوسـاندنەوەی هاوەڵـە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی بە هاوەڵانیدا بۆ ئەوەی

کۆچ بکەن بۆ حەبەشـە.. جگەلە ژن‌و منداڵ، ژمارەی کۆچکەران بۆ حەبەشـە بریتی بوو لە هەشـتاو سێ پیاو، پاشـان بە فەرمانی پەروەردگار موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ بە هاوەڵی ئەبوبەکر ﷺ لە ساڵی یەکەمی کۆچی، بەرامبەر ساڵی ٦٢٢ زاینی کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە..

❖ لە نێوان موسڵمانان‌و قورەیشیەکاندا چەندان جەنگ‌و غەزا ڕوویانداو دواجار بە ڕزگار کردنی مەککە لە بت پەرستی کۆتایی هات..

❖ لە سـاڵی هەشـتی کۆچیدا، پاشـان لە سـاڵەکانی نۆو دەی کۆچیدا عەرەبەکان‌و خەڵکانی دەوروبەر نوێنەرانی خۆیان دەناردو موسڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیاند..

❖ لە سـاڵی دەی کۆچیدا پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە دوای حەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە بۆ شـاری مەدینەو لە ١٢ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١١ی کۆچی، بەرامبەر ٨ ی حوزەیرانی ساڵی ٦٣٢ی زاینی کۆچی دوایی کرد..

## گرنگترین ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەری خودا ﷺ..

⋆ الأسـراء والمعراج: سێ ساڵ پێش کۆچ کردنی بۆ شاری مەدینە ڕوویداو نوێژی تێدا فەرز کرا..

⋆ سـاڵی یەکەمی کۆچی: کۆچ کردن بۆ شـاری مەدینە.. دروست کردنی مزگەوت.. دانانی بنەماو سەرەتای دەوڵەتی ئیسلامی.. فەرزکردنی زەکات.. دروست کردنی برایەتی لە نێوان موسڵماناندا..

⋆ ساڵی دووەمی کۆچی: ڕوودانی جەنگی بەدری گەورە..

⋆ ساڵی سێیەمی کۆچی: ڕوودانی جەنگی ئوحود..

⋆ ساڵی چوارەمی کۆچی: ڕوودانی جەنگی جولەکەکانی (بني النضير)..

⋆ سـاڵی پێنجەمـی کۆچی: ڕوودانـی جەنگی (بنـي المصطلـق).. ڕوودانی جەنگی خەندەق.. ڕوودانی جەنگی جولەکەکانی (بني قريظة)..

⋆ ساڵی شەشەمی کۆچی: ڕێکەوتننامەی حودەیبیە..

⋆ ساڵی حەوتەمی کۆچی: ڕوودانی جەنگی خەیبەر.. هەر لەم ساڵەدا پێغەمبەر ﷺ

و هاوەڵانی، یەکەمین عومرەیان ئەنجامدا..

★ ساڵی هەشتەمی کۆچی: ڕوودانی جەنگی (مؤتة) لە نێوان موسڵمانانو ڕۆمەکان.. ڕزگارکردنو فەتحی مەککە.. ڕوودانی جەنگی حونەین..

★ ساڵی نۆیەمی کۆچی: ڕوودانی جەنگی تەبوك، کە کۆتا جەنگو غەزای پێغەمبەری خودا بوو ﷺ.. هەر لەم ساڵەدا، پۆل پۆل خەڵکی دەهاتنە ناو ئیسلامەوەو موسڵمان دەبوون..

★ ساڵی دەیەمی کۆچی: حەجیماڵئاوایی، لەم ساڵەدا زیاتر لە سەد هەزار موسڵمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ فەریزەی حەجیان ئەنجامدا..

★ ساڵی یانزەیەمی کۆچی: کۆچی دوایی سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ ..

لەم پەڕتوکەدا دەمەوێت لە دەریای موعجیزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ چەند موعجیزەیەك باس بکەمو لە دەرگای نیشانەو بەڵگەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بدەم، هەروەك شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە) زیاد لە هەزار موعجیزەی پێغەمبەری ئازیزی ﷺ باس کردووە، بەڵام باس کردنی زۆرێك لە موعجیزەکانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ کارێکی ئاسان نیەو ئێمە لێرەدا بە پێی توانا لە خزمەت هەندێکیاندا دەبین..

## بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەران..

پەروەردگار چەند بەڵگەو نیشانەو موعجیزەیەکی تایبەت کردووە بە پێغەمبەرانەوە (علیهم السلام)، وەکو پشتگیریو بە ڕاست زانینێك بۆ ئەو پێغەمبەرانە..

موعجیزەش بریتیە لە کارێك، کە لە توانای مرۆڤ بەدەربێتو موعجیزەی هەر پێغەمبەرێکیش لەگەڵ حاڵو هەواڵی سەردەمەکەی خۆیدا گونجاو بووەو ئەو شێوە موعجیزەیە پێویستو گرنگ بووە بۆ ئەو سەردەمە..

★ موسا ﷺ کاتێك پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ هات، سەردەم سەردەمی سیحرو جادوو بوو، پەروەردگار دەریای بۆ لەت کردو گۆچانەکەی دەستی بۆ کرد بە مار..

★ عیسا ﷺ لە سەردەمێکدا بوو، سەردەمی پێشکەوتنی پزیشکیو چارەسەری جۆراوجۆر بوو، پەروەردگار موعجیزەی چاکردنەوەی نەخۆشیەکانو زیندووکردنەوەی مردووی پێبەخشی..

* بەڵام محمد ﷺ پەروەردگار چەندان بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی پێبەخشی بوو.. لــە هەموویان گەورەتــر قورئانی پیرۆز بوو، ئەو قورئانەی ڕەوان بێژەکان لە ئاســتیدا بێتوانا بوون و شــاعیرەکان لە بەرامبەریدا دەستەوەســتان مانــەوە.. ئەو قورئانەی کە پەروەردگار خۆی دەیپارێزێ و هەتا هەتایە هیچ کەســێك ناتوانێت تەنها وشەو پیتێکی لــێ زیادو کەم بکات، هەر وەك پەروەردگار دەفەرموێــت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر. واتە: (بە ڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێبخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَـٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ العنكبــوت. واتــە: (کافران (وادیارە قورئان بە بەڵگە دانانێن بۆیە) دەڵێن: باشــە چی دەبوو؛ ئەگەر نیشــانەو بەڵگەی لە لایــەن پەروەردگاریــەوە بۆ ڕەوانە بکرایە، تــۆش ئەی پێغەمبەر لــە وەڵامیاندا بڵێ: موعجیزەو نیشانەو بەڵگە ماددیەکان بە دەست خوا خۆیەتی و من تەنها ئاگادارکەرەوەو بێدارکەرەوەیەکی ئاشــکرام بۆتان* ئایا بەس نیە بۆیان کە بە ڕاســتی ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆت و بەســەریاندا دەخوێنرێتەوە، بێگومــان ئا لەو قورئانەدا ڕەحمەت و یادەوەری ئاشکرا هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ دەهێنن)..

هەروەها لەبەر زۆری بەڵگەو نیشــانەکانی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ، هیچ کەسێك ناتوانێــت پێغەمبەرایەتیەکــەی بە درۆ بزانێت، مەگەر کەســانێك کە بە هۆی خۆ بە گــەورە زانینیانــەوە ڕێگە بە خۆیان نەدەن، دان بەو ڕاســتیەدا بنێــن.. تەنانەت ئەو بێباوەڕانەی کە بەرامبــەر پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی دەجەنگان، لە ناخ و دەروونیاندا باوەڕیــان بــە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ هەبــوو، بەڵام لەبەر خۆ بــە گەورە زانین و بەرژەوەندیەکانیان دەریان نەدەبڕی..

جولەکەکانیش دەیانزانی کە محمد ﷺ کۆتا پێغەمبەرەو پێویســتە شوێنی بکەون، هــەروەك بە عەرەبەکانی شــاری مەدینەیان دەوت: بەم نزیکانــە پێغەمبەرێك دێت و ئێمــەش شــوێنی دەکەوین، بــەڵام بە هــۆی لەخۆبایبوون و دەروون پیســی و حەزی

دوبەرەکــیو ناپاکیو خۆ بە گەورە زانینیانەوە، ئامادە نەبوون شــوێن ئەو پێغەمبەرە ئازیزە بکەون ﷺ..

ئەوەتا ئەبوتالیبیش دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ولقد علمت بأن دين محمدٍ | من خـيـر أديان البرية ديناً |
| ولولا الملامة أو حذار مسبة | لوجدتنيسمحاًبذاكمبيناً |

واتە: (بێگومان ئاینی محمد لە سەرجەم ئاینەکانی خەڵکی باشترە، خۆ ئەگەر لەبەر سەرزەنشــتو لۆمەی خەڵکی نەبووایە، ئەوا بە ئاشکرا فەرمانبەری ئاینەکەیم دەکردو باوەڕم پێدەهێنا)..

لێــرەدا بــە پشــتیوانی پەروەردگــار هەندێك لــە موعجیزەکانــی محمدی پێغەمبەرمان ﷺ باس دەکەین..

## یەکەم..
## هەواڵدان بە هەندێک لە نادیارەکان..

یەکێك لەو هەواڵانەی کە هێشــتا ڕوویان نەدابــوو، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ بە تەواوی بە ڕاستو دروستی ڕوودانی ئەو کارەی خستە ڕوو، ئەویش بەم شێوەیە بوو.. لە دوای کۆچ کردنی پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی، بۆ شــاری مەدینەو جێگیربوونیان لەو شــارە، ســەعدی کوڕی مەعاز ﷺ بە مەبەســتی ئەنجامدانی عومرە، بەرەو شاری مەککــەی پیرۆز کەوتە ڕێو لــە لای ئومەییەی کوڕی خەڵەف لایــدا، لەبەر ئەوەی لە ســەردەمی نەفامیدا خۆشەویســتیو پەیوەندیەکی پتەو هەبوو لە نێوانیاندا.. هێشتا جەنگێکیش لە نێوان بێباوەڕانو موســڵماناندا ڕووینەدابوو، هەر بۆیە کاتێك ئومەییە گەشــتی دەکرد بەرەو شام، لە شاری مەدینە لە لای سەعدی کوڕی مەعاز ﷺ لایدەداو چەند ڕۆژێك دەمایەوەو پاشــان دەڕۆی.. بە هەمان شــێوە سەعدیش کاتێك دەهات بۆ شاری مەککە، لە لای ئومەییە دەمایەوە..

کاتێك ســەعد ﷺ گەیشتە ماڵی ئومەییە، پێی وت: ئومەییە، بزانە چ کاتێك چۆڵە بۆ ئەوەی تەوافی ماڵی خودا بکەم؟!

ئومەییەش وتی: چاوەڕێ بکە هەتا نیوەڕۆ، چونکە ئەو کاتە کاتێکی گەرمەو خەڵکی

بێئاگان‌و لە ماڵەکانیاندا دەمێننەوە..

کاتێك دونیا گەرم بوو، خەڵکیش بەرەو ماڵەکانیان دەڕۆیشتنەوە، ئومەییە سەعدی لەگەڵ خۆی برد بەرەو کەعبە.. لە نێوان ڕێگەکەدا بە ئەبوجەهل گەیشتن، ئەبوجەهل سەیرێکی سەعدی کردو نەیناسی‌و لە ئومەییەی پرسی: ئەمە کێیە لەگەڵتدا؟!

ئومەییە وتی: ئەمە سەعدی کوڕی مەعازەو خەڵکی مەدینەیە..

ئەبوجەهـل بیری کردەوە خەڵکی مەدینە بوون، کە پشـتگیریان لە محمد ﷺ کردوو پەنایاندا.. هەر بۆیە ئەبوجەهل توڕە بووو وتی: ئەتەوێت بە ئارامی تەواف دەوری کەعبە بکەیت، لە کاتێکدا ئێوە پەنای محمدتانداو پشتگیریتان کرد؟! سەعد بێدەنگ بوو..

پاشـان ئەبوجەهل وتی: سـوێند بە خودا ئەگەر لەگەڵ ئومەییەدا نەدەبوویت، بە سەلامەتی نەدەگەڕایتەوە بۆ ناو کەس‌وکارت..

سەعد لەبەر ئەوەی سـەرۆك‌و دەمڕاستی هۆزەکەی بوو، ڕازی نەدەبوو بەم شێوەیە سـوکایەتی پێبکرێت، هەر بۆیە توڕە بووو وتی: ئەگەر ڕێگریم لێبکەیت لەوەی تەواف کەعبە بکەم، ڕێگریت لێدەکەم‌و نایەڵم بچیت بۆ شام..

ئەبوجەهـل بازرگان بوو، لەگەڵ کاروانەکانیدا دەچوو بۆ شـام، بۆ بازرگانی.. هەر بۆیە سەعد هەڕەشەی ڕێگەگرتنی لێکرد..

ئەبوجەهل‌و سەعد لەیەکتر توڕەبوون‌و ناکۆکی کەوتە نێوانیان، ئومەییە نەیدەزانی چـی بکات‌و پشـتگیری لە کامیان بکات، سـەعد سـەرۆکی هۆزەکەیەتی لـە مەدینە.. ئەبوجەهلیش سـەرۆکی هۆزەکەیەتی لە مەککە.. بەڵام بە لای ئەبوجەهلدا دایشکاندو بە سـەعدی وت: ئەی سەعد دەنگت بە سـەر ئەبو حەکەمدا بەرز مەکەرەوە، چونکە گەورەی ئەم شیوو دۆڵەیە..

سـەعدیش فەرمووی: واز بێنە ئەی ئومەییە، سوێند بە خودا گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو ﷺ فەرمووی: کە بە دەستی پێغەمبەرو هاوەڵانی دەکوژرێیت..

ئومەییە زۆر ترساو وتی: لە مەککە دەکوژرێم، یان لە دەرەوەی مەککە؟!

سەعد فەرمووی: نازانم..

ئومەییە ترسـێکی زۆری لێنیشت‌و پشـتی هەڵکردو ڕۆیی‌و هەر دەیوت: سوێند بە خودا محمد هەرگیز درۆ ناکات..

پاشــان ئومەییە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیانو بە خێزانەکەی وت: ئایا گوێت لێنەبوو سەعد چی پێوتم؟!

خێزانەکەی وتی: چی وت؟! ئومەییە وتی: سەعد دەڵێت: محمد وتوویەتی بە دەستی ئەو دەکوژرێم.. خێزانەکەی ترساو وتی: لە مەککە؟!

وتی: نازانم..

خێزانەکەی وتی: سوێند بە خودا محمد درۆ ناکات..

ئومەییەش وتی: بە خودا هەرگیز لە مەککە دەرناچم..

ڕۆژەکان تێدەپەڕیــن، هەتا ئەو کاتــەی قافڵەیەکی قوڕەیش لە شــام دەگەڕایەوە.. پێغەمبــەر ﷺ و هاوەڵانی، دەرچوون بــۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کاروانەکە.. ســەرۆکی کاروانــە بازرگانیەکــە ئەبو ســوفیان بوو، نوێنەرێکــی خۆی نارد بــۆ مەککەو داوای پشــتگیری لێکردن.. خەڵکی مەککە تــوڕە بوونو ئەبوجەهلیــش خەڵکی هان دەدا بۆ جەنگو کوشتار دژی موسڵمانانو دەیوت: فریای سەروەتو سامانتان بکەون..

خەڵکی خۆیان ئامادە کرد.. شمشێرەکانیان تیژ دەکردو کەلوپەلی جەنگیان ئامادە دەکرد..

بەڵێ.. خەڵکی مەککە هەموو ئامادەی جەنگ بوون، تەنها کەســێك نەبێت، ئەویش ئومەییەی کوڕی خەڵەف بوو، حەزی نەدەکرد لە شــاری مەککە دەربچێتو دەترســا.. ئومەییە لە ســێبەری کەعبەدا دانیشــتبوو.. کاتێك ئەبوجەهــل بەمەی زانی، چوو بۆ لایو پێی وت: ئومەییە تاکەی سەیری خەڵکی دەکەیت، وا دواکەوتیت، خۆ تۆ گەورەی لە ناوماندا..

ئومەییــە ڕازی نەبوو لەگەڵیــان دەربچێت، چونکە دڵنیا بــوو محمد هەرگیز درۆ ناکات..

ئەبوجەهل کەســێکی زۆر بێبــاوەڕو خراپ بوو، بەڵام زیرەك بــوو، لەبەرئەوە بە ڕێگەیەکی تر وای لە ئومەییە کرد، لەگەڵیاندا بچێت بۆ جەنگ..

چی کرد؟! هەستا بوخوردانێکی هێناو پشکۆو بۆنی خۆشی تێکردو بردی بۆ ئومەییە، لە کاتێکدا کە ئومەییە لە سێبەری کەعبەدا لە ناو هۆزەکەیدا دانیشتبوو.. ئەبوجەهل پێــی وت: ئومەییە بیگرەو خۆتی پێ بــۆن خۆش بکە، چونکە تۆ لە ئافرەتانی.. واتە:

مادام لەگەڵماندا نایەی بۆ جەنگ، لەگەڵ ئافرەتەکاندا بۆ خۆت دانیشەو ئێمە دەچین بۆ جەنگ..

ئای لە پیسیو چەپەڵی ئەبوجەهل!! دەزانێت لە کوێ شان دائەدات.. هەر بۆیە کاتێك ئومەییە گوێی لەم قسەو توانجانە بوو، تورە بوو.. بەرەوماڵەوە ڕۆیشتو بە خێزانەکەی وت: کەلوپەلم بۆ ئامادە بکە..

خێزانەکەی وتی: ئەی لەبیرت چوو براکەی شاری مەدینەت چی پێوتی؟!

ئومەییەش وتی: نەخێر بیرم نەچووە، دەمەوێت کەمێك لەگەڵیان بکەومە ڕێو پاشان بگەڕێمەوە..

ئومەییە دەیویست لەگەڵ سوپاکەدا بکەوێتە ڕێو لە ڕێگە خۆی لێیان بشارێتەوەو پاشان بگەڕێتەوە بۆ مەککە..

بەڵێ.. ئومەییە لەگەڵ سوپاکەدا کەوتە ڕێ، لە ڕێگە لە هەر شوێنێك لایان بدایە بۆ خواردنو خەوتن، وڵاخەکەی لە تەنیشت خۆیەوە دەبەستەوە، بۆ ئەوەی هەلێکی بۆ ڕێبکەوێتو ڕا بکات.. بەڵام ئەبوجەهل لە بۆسەدا بوو بۆیو بەردەوام چاودێری دەکرد، هەتا گەیشتنە شوێنی ڕوودانی جەنگی بەدرو ئومەییەش هەر وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووبووی، بە دەستی سوپای موسڵمانان کوژراو هەواڵەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە دی..

## هەوڵدان بۆ شەهیدکردنی پێغەمبەری خودا ﷺ..

لە دوای جەنگی بەدرو تێکشکاندنی بێباوەڕانی قوڕەیشو گەڕانەوەیان بۆ شاری مەککەو کوژرانی زۆرێکیانو بە دیل گرتنی زۆرێکی تریان.. دوای ئەوەی بەڵایەکی گەورە تووشی خەڵکی مەککە هاتو زۆر بە خراپی تووشی شکست بوون.. کەسوکاری کوژراوەکانی قوڕەیش ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەیان هەبوو.. حەزیان دەکرد زیانێك بە پێغەمبەری خودا ﷺ بگەیەنن..

ڕۆژێك عومەیری کوڕی وەهب دەچێت بۆ کەعبەو سەفوانی کوڕی ئومەییە دەبینێت کە لە ژێر سێبەری کەعبەدا دانیشتووە.. عومەیر دەچێت بۆ لایو قسەی دڵو خەمی خۆیان بۆ یەکتر باس دەکەن.. لەبەر ئەوەی هەردووکیان لە نارەحەتیەکانی جەنگی بەدردا بەشدار بوون.. عومەیر کوڕەکەی دیل بوو لە لای موسڵمانانو سەفوانیش لەو

جەنگەدا بە دەستی موسڵمانەکان باوکی کوژرا بوو..

سەفوان وتی: ژیان چەند ناشیرین و ناخۆشە لە دوای کوژراوەکانی بەدر..

عومەیریش وتی: زۆر ڕاستە، بە ڕاستی لە دوای ئەوان ژیان خێرو خۆشی تێدا نەماوە..

پاشان عومەیر بە پەرۆشەوە وتی: ئای ئەگەر قەرزار نەدەبووم و خێزانێکی زۆریشم بە سەردا نەدەکەوت، ئەکەوتمە ڕێ بۆ کوشتنی محمد، ئەگەر لە مەدینەش ببینرێم دەڵێم: بۆ ئازاد کردنی کورەکەم هاتووم..

سەفوان بەم قسانە زۆر دڵخۆش بوو.. هەستی کرد ئەمە هەلێکی زۆر بە نرخە بۆ تۆڵەسەندنەوە..

لەبەر ئەوە سەفوان بە عومەیری وت: قەرزەکانت لە سەر من و هەموویت بۆ دەدەمەوەو ماڵ و منداڵەکانیشت بە هاوشێوەی ماڵ و منداڵەکانی خۆم بەخێو دەکەم.. دەی بچۆ بۆ لای محمدو بیکوژە..

عومەیر هەستی کرد تازە ڕێگەیەك نیە بۆ پەشیمان بوونەوەو چاری نیە، سەفوانیش زۆر بە خێرایی کەل و پەلی پێویستی بۆ عومەیر حازر کردو شمشێرێکی ژەهراویشی پێدا..

عومەیر ماڵئاوایی لە کەس وکاری کردو شاری مەککەی بەجێ هێشت.. لەوانەشە سەیرکردنی بۆ ماڵ و منداڵ و شاخەکانی مەککە، کۆتا سەیرکردن بێت!!

عومەیر خۆی گەیاندە شاری مەدینەو بەرەو مزگەوتەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەوتە ڕێ و لە دەرگای مزگەوتەکە وەستاو ئاژەڵە سواریەکەی بەستەوەو شمشێرە ژەهراویەکەی لە ملی قایم کردو چووە ژوورەوە بۆ ناو مزگەوتەکەو بەرەو لای پێغەمبەری خودا ﷺ چوو..

ئا لەم کاتەدا عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه عومەیری بینی و هاواری کرد: ئەوە دوژمنی خودایە.. ئەو کەسەی کە لە جەنگی بەدردا بە گژماندا هات و جەنگی لە دژمان بەرپاکرد..

عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه ڕۆی بۆ لای، تا نەیەڵێت خۆی بگەیەنێتە پێغەمبەری خودا ﷺ، بەڵام عومەیر گەیشتە لای پێغەمبەری خودا ﷺ.. عومەیر لە بەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ وەستاو دەیویست لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ئاگای لە خۆی نەبێت

بە شمشــێرەکەی شــەهیدی بکات، ئیتر دوای ئەوە بە لایەوە گرنگ نەبوو چی بە سەر دێت، چونکە خەمی قەرزەکەی‌و بەخێوکردنی ماڵ‌و منداڵەکەی نەبوو..

عومەیری هەژار وای دەزانی شەهید کردنی پێغەمبەری خودا ﷺ ئاوا ئاسانە!!

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری عومەیری کردو شمشێرەکەی بینی‌و پرسیاری لێکرد: بۆچی هاتوویت؟!

عومەیر چاوەڕێی ئەم پرســیارەی دەکرد، هەر بۆیە وەڵامەکەی ئامادە کرد بوو.. لە وەڵامدا وتی: کوڕەکەم لە لای ئێوە دیلەو هاتووم فیدیەکەی بدەم‌و ڕزگاری بکەم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی ئەو شمشێرە چیە بە گەردنتەوە؟!

بەڵێ.. ئەگەر یەکێك بێت بۆ ئازاد کردنی دیل، تورەکەی پارە بە ملیەوە هەڵدەواسێت نەك شمشێر..

عومەیر وتی: ئای شمشێر چەندە ناشیرینە.. ئایا شمشێر هیچ سودێکی بۆمان هەبوو لە جەنگی بەدردا؟! کاتێك دابەزیم بیرم چوو شمشێرەکەم دابنێم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ڕاستم پێبڵێ.. بۆچی هاتوویت؟!

عومەیر وتی: تەنها بۆ لای کوڕە دیلەکەم هاتووم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی لە پەنای کەعبەدا چ مەرجێکت بۆ ســەفوان دانا؟!

عومەیر ترساو وتی: چ مەرجێك؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەوەی کە من بکوژێت، لە بەرامبەریشدا منداڵەکانت بەخێو بکات‌و قەرزەکانت بۆ بداتەوە..

عومەیر زۆر لە لای سەیر بوو، چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمەی زانی!! پاشان وتی: اشهد أن لا إله إلا الله وأنك رسول الله.. ئێمە سروش‌و نیگای ئاسمانمان بە درۆ دەزانی، کاتێك کە بۆت دادەبەزی!! ئەو قسەو مەرج‌و پەیمانەی کە لە نێوان من‌و سەفواندا ڕوویدا، هیچ کەسێك ئاگای لێنەبوو، ئەی جگەلە پەروەردگار کێ تۆی لێئاگادار کردەوە؟!

بەڵێ.. عومەیر موسڵمان بوو، هەروەها بوو بە یەکێك لە موسڵمانە هەرە باشەکان.. ئەمەش یەکێك بوو لە نیشــانەکانی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ کە بووە هۆی موسڵمان بوونی عومەیر..

## مەڕێکی ژەهراوی..

جولەکەکانیش بە هەمان شێوە، هەوڵی شەهید کردنی پێغەمبەری خودایان ﷺ دا.. پێغەمبەری خودا ﷺ لە جەنگی خەیبەردا گەمارۆی جولەکەکانیداو گەمارۆکە درێژەی کێشاو پاشان جولەکەکان خۆیان بە دەستەوەدا.. کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ چووە ناو قەڵاکەوە، ئافرەتێکی جولەکەی ڕق هەڵگری دەروون ڕەش، مەڕێکی برژاوی ژەهراوی ئامادە کردو پرسیاری کردو وتی: محمد حەزی لە کوێی مەڕی برژاوە؟

لە وەڵامدا پێیان وت: حەزی لە دەستەکانیەتی.. ئافرەتەکەش ژەهرێکی زۆری بە دەستەکانیەوە کرد..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانیدا بوو، ئافرەتە جولەکەکە بە خۆیو خواردنەکەیەوە هاتو لە بەردەم پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵەکانیدا دایناو خۆی وا دەرخست کە ئەمە وەك دیاریەك بۆی هێناون..

سەیرە!! کەسێکت بینیووە دیاریەکەی دەستی مردن بێت؟!

هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ برسیو ماندوو بوون، پێغەمبەری خوداش ﷺ بە هەمان شێوە برسی بوو، چونکە گەمارۆکە زۆر درێژەی کێشاو خواردنیان کەم پێبوو، زۆریش گەرم بوو، کاتێك هاوەڵان مەڕە برژاوەکەیان بینی، دەستیان بۆ برد، پێغەمبەری خوداش ﷺ پارچەیەکی لە دەستی مەڕەکە لێکردەوەو بەرزی کردەوە بۆ دەمی پیرۆزی، پاشان دەنگێك لە گۆشتەکەوە هات.. لەپڕ پێغەمبەری خودا ﷺ هاواری کردو بە هاوەڵەکانی فەرموو: دەست لە خواردن هەڵگرن!! بە سەرسوڕمانەو، هەموویان دەستیان هەڵگرت!!

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: هەرچی جولەکەیەك لەم ناوەدایە، کۆیان بکەنەوە.. جولەکەکانیان کۆکردەوەو پێغەمبەری خوداش ﷺ پێی فەرموون: من پرسیارتان دەربارەی شتێك لێدەکەم، ئایا ڕاستم پێدەڵێن؟!

وتیان: بەڵێ..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: باوکتان کێیە؟! لە ناو ئەو جولەکانەدا هۆزێك هەبوو باپیرەیان بە باپیری خۆیان نەدەزانیو وایان دەردەبڕی کە کەسێکی تر باپیریانە، بۆیە وتیان فلانە کەس باوکمانە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: درۆتان کرد، فلانە کەس باوکتانە..

وتیان: ڕاست دەکەیت..

پاشـان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئایا ڕاسـتم پێدەڵێن، ئەگەر پرسـیارتان دەربارەی شتێکی تر لێبکەم؟!

وتیان: بەڵێ.. ڕاسـتت پێدەڵێین، خۆ ئەگەر درۆمان کرد، وەك پرسیارەکەی پێشوو، دەزانی کە درۆ دەکەین..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: کێ لە خەڵکانی دۆزەخە؟!

وتیان: ئێمە کەمێك لە دۆزەخدا دەبین و لێی دەردەچین و پاشـان ئێوە لە دۆزەخدا جێگەمان دەگرنەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: سەرشۆڕبن.. سوێند بە خودا هەرگیز ئێمە جێگەی ئێوە ناگرینەوە..

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو گۆشتەتان ژەهراوی کرد بوو؟!

وتیان: بەڵێ.. بەڵێ..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بۆ واتان کرد؟!

وتیان: بۆ ئەوە ژەهراویمان کرد، وتمان: ئەگەر ڕاست نەکات کە دەڵێت پێغەمبەرم، ئەوا لە دەسـتی ڕزگارمان دەبێت.. خۆ ئەگەر ڕاستیش بکات، ئەوا زیانی پێناگەیەنێت، بەڵام کێ ئاگاداری کردیت؟!

پێغەمبـەری خودا ﷺ دەسـتی مەڕەکەی بەرز کردەوە و فەرمـووی: ئا ئەمە ئاگاداری کردم. رواه البخاري..

درووددو سـەلات و سەلامی پەروەردگارت لە سـەر بێت، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، تەنانەت دەسـتی مەڕەکەش پەروەردگار دەیهێنێتـە زمان، بۆ ئەوەی زەرەرو زیان بەو ئازیزە نەگات ﷺ ..

## پەروەردگارم خوداکەتانی کوشت..

هــەر لەو شــتە نادیارانەی کە پێغەمبــەری خودا ﷺ هەواڵــی پێداوین، ئەوە بوو پێغەمبــەری خــودا ﷺ عبداللەی کوڕی حوزافەی نارد ؓ بۆ لای کیســرای پادشــای فارس، بۆ ئەوەی بانگی بکات بۆ ئیســلامو موســڵمان بێت.. نامەو پەیامی پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشــت بە کیســرا، کیسرا پادشایەکی دەســەڵاتدار بوو، فەرمانڕەوا بوو بە ســەر هەموو فارسدا.. ئێران.. ئەفغانستان.. پاکستان.. چەندان شوێنی دیکەشی لە ژێر دەستدا بوو.. کاتێك کیسرا نامەکەی خوێندەوە، توڕە بوو.. هەروەها دڕاندیو نامەیەکی نارد بۆ فەرمانڕەوای یەمەنو بۆی نوســی: پێم گەیشــتووە کە پیاوێك هەیە لە خاکی تۆدا وای دەردەبڕێت کە پێغەمبەرە، دوو پیاو لە پیاوەکانی خۆتی بۆ بنێرەو بە دەست بەستراوی با بیهێنن بۆ لام..

فەرمانــڕەوای یەمەن دوان لە پیاوەکانی نارد بۆ ئــەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە دەست بەستراوی بێنن!!

ئــای کە هەژارو نەزانن!!! دوو پیاوەکە ڕۆیشــتن، هەتا گەیشــتنە شــاری مەدینەو چوونە لای پێغەمبەری خودا ﷺ و پێیان وت: لەگەڵماندا بکەوە ڕێ، ئەگەر نا کیســرا خۆتو هۆزەکەشت لەناودەباتو شارەکەشت وێران دەکات!!

پێغەمبەری ئازیز ﷺ سەیرێکی کردنو بینی ڕیشیان تاشیووەو سمێڵیان هێشتۆتەوە، پێــی فەرموون: هاوار بۆ ئێوە، کێ فەرمانی پێکردوون، ڕیشو ســمێڵتان ئاوا لێبکەن؟! وتیان: کیسرای خودامان فەرمانی پێکردووین.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بەڵام خوداکەی من فەرمانی پێکردووم کە ڕیشم هەبێتو سمێڵم کورت بکەمەوە، پاشان زۆر بە ئارامی پێی فەرموون: بەیانی وەرنەوە بۆ لام..

بۆ ڕۆژی دوایی سروشی خودایی دابەزی بۆ سەر پێغەمبەری خوداو ئاگاداری کرد، کە کیســرا لە لایــەن کوڕەکەیەوە کوژراوە.. کاتێك دوو پیاوەکــە هاتنەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: خوداکەی من لە خوداکەی ئێوە توڕە بوو، خوداکەتانی کوشتو هێشتا خوێنەکەی گەرمە، واتە ئێستا کوشتیو هێشتا خوێنی لێدەڕوات..

دوو پیاوەکــە لایان ســەیر بــوو، وتیان: دەزانــی چی دەڵێیت؟! ئەم قســانە بۆ

پادشاکەمان بگێڕینەوە؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویی: بەڵێ.. بە دڵنیاییشەوە ئاینەکەی من هەموو ناوچەکانی ژێر فەرمانڕەوای کیسرا دەگرێت، هەروەها بە پادشاکەی یەمەن بڵێن: ئەگەر موسڵمان بێت، ئەوا هەر بە فەرمانڕەوایی خۆی دەمێنێتەوە..

دوو پیاوەکە بەرەو یەمەن گەڕانەوە، هەتا گەیشتنەوە لای فەرمانڕەوای یەمەنو هەواڵەکەیان پێڕاگەیاند، بەڵام هێشتا ئەم هەواڵەکەی نەبیستبوو، لەبەر دووری ناوچەی فارس لێیانەوە.. فەرمانڕەواکەی یەمەن وتی: سوێند بە خودا ئەم قسانە، قسەی پادشا نیە، من وا دەبینم ئەم پیاوە پێغەمبەر بێت، هەر وەك وا دەڵێت.. چاوەڕێ بکەن بزانن قسەکەی وا دەردەچێت!! ئەگەر وابوو، ئەوا بە ڕاستی پێغەمبەری خودایە، ئەگەر واش نەبوو، ئەوا بۆچوونی خۆمان دەردەبڕین..

هەر لەو کاتەدا نوسراوێك لە لایەن شیرەویەی کوڕی کیسراوە گەیشت، هەواڵی دابوو کە بووە بە پادشاو پێویستە ملکەچی بکرێت.. کاتێك وردبوونەوە، ئەو کاتەی کە کیسرای تیادا کوژرا بوو، هەمان ئەو کاتە بوو، کە پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵەکەی پێڕاگەیاند بوون..

پاشان فەرمانڕەواکەی یەمەن بە ناوی (باذان) وتی: بە دڵنیاییەوە ئەو پیاوە پێغەمبەری خودایەو موسڵمان بوو.. هەروەها خەڵکانی وڵاتی یەمەنیش موسڵمان بوون..

## سەلامی خودات لێبێت، ئەی خوبەیب..

لە دوای جەنگی بەدر، چەند کەسێك لە هەر دوو هۆزی (عضل و قارة) هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە دوو هۆزینو لە ناوماندا موسڵمان هەیە، لەبەر ئەوە هەندێك لە هاوەڵانت لەگەڵماندا بنێرە، بۆ ئەوەی لە ئیسلام شارەزامان بکەنو قورئانمان بۆ بخوێننو لە حەڵاڵو حەرام تێمان بگەیەنن..

پێغەمبەری خوداش ﷺ شەش لە هاوەڵە بەرێزەکانی لەگەڵ ناردن، ئەوانیش بریتی بوون لە (مرثدی کوڕی أبي مرثد.. خالدی کوڕی البکیر.. عاصم ی کوڕی ثابت.. خوبەیبی کوڕی عەدی.. زیدی کوڕی دثنة.. عبداللەی کوڕی طارق (خودالێیان ڕازیبێت)..

بەڵێ.. هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کەوتنە ڕێو

بە ناو چەند هۆزێکی بێباوەڕدا ڕۆیشــتن، هەتا گەیشتنە شــوێنێك بە ناوی (الرجیع) کە لە نزیك هۆزی (هذیل) بوو، سەد سواریان بە پەلە خۆیان گەیاندە ئەو شوێنەی کە شــەش هاوەڵەکەو پیاوەکانی تر لێی لایان دابوو.. شوێنەکە ناوکی خورمای لێ بەجێما بــوو، بۆیە کە بینیــان وتیان: ئەمە ناوکــی خورمای مەدینەیە، ڕۆیشــتن هەتا پێیان گەیشتن‌و هێرشیان کردە سەر شەش هاوەڵە ئازیزەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ..

شــەش هاوەڵــە ئازیزەکــەش ســەرکەوتنە ســەر بەرزاییــەك.. ئــەو هۆزانــەش چواردەوریاندان‌و هەوڵیاندا سەرکەونە لایان، بەڵام نەیانتوانی، بۆیە پەیمانیان پێدان‌و وتیان: ئەگەر دابەزن، هیچ کەسێکتان ناکوژین..

عاصم ؓ فەرمووی من دانابەزم‌و خۆم نادەمە دەستی بێباوەڕان، پاشان چاوەکانی بەرەو ئاســمان بەرز کــردەوەو فەرمووی: ئەی پەروەردگــار، پێغەمبەری خودا ﷺ لە هەواڵمان ئاگادار بکە..

بێباوەڕان‌و پەیمان شــکێنان، هێرشیان کردە سەر شەش هاوەڵەکەو عاصم‌و دووانی تریان شەهید کردو تەنها (خوبەیب‌و زەید‌و عبدالله) مانەوەو لە سەر پەیمانی بێباوەڕان خۆیان دا بەدەستەوە، بەڵام کاتێك هاتنە خوارەوە یەکسەر دەستیان بەستن..

عبداللــەی کــوڕی طارق ؓ فەرمــووی: ئەمە یەکــەم فێڵ‌و غــەدرو خیانەتیانە بەرامبەرمان، دەســتەکانی ڕاپسکاند‌و دەستی دایە شمشێرو هیچ کەس نەیوێرا نزیکی بکەوێتەوە، هەتا لەدوورەوە بەرد بارانیان کردو گیانی سپارد..

خوبەیب‌و زەیدیشیان فرۆشت بە خەڵکی مەککە.. منداڵەکانی حارسی کوڕی عامر، خوبەیبیان کڕی، چونکە خوبەیب لە شەڕی بەدردا حارسی کوشت بوو.. سەفوانی کوڕی ئومەییــەش زەیدی کڕی، هەتا لەبری باوکی بیکوژێتەوە، لەبەر ئەوەی موســڵمانەکان لە شــەڕی بەدردا باوکیان کوشت بوو.. سەفوان یەکێك لە بەندەکانی خۆی ڕاسپارد کە زەید بکوژێت..

بەڵێ.. زەیدیان بەرەو دەرەوەی شــاری مەککە بردو خەڵکێکی زۆریش کۆببوونەوە، بۆ ئەوەی ئەم دیمەنە ببینن، ئەبو سوفیانیشــیان لەگەڵدا بوو.. ئا لەو کاتەی کە زەید بە کۆت‌و زنجیر بەسترابۆوە، ئەبو سوفیان پرسیاری لە زەید کردو وتی: ئەی زەید، ئایا حەزت دەکرد ئێستا محمد لە شوێنی تۆدا لە گەردنی بدرایەو تۆش لە ناو ماڵ‌و منداڵی خۆتدا بویتایە؟ زەیدیش ؓ لە وەڵامدا فەرمووی: سوێند بە خودای پەروەردگار، حەز ناکەم محمد ئێســتا لەو شــوێنەی کە لێیەتی، تەنها دڕکێك ئازاری بدات‌و منیش لە ناو

ماڵو منداڵی خۆمدا بم..

ئه‌بو سوفیان كاتێك گوێی له‌م قسانه‌ بوو، وتی: هه‌رگیز كه‌سم نه‌بینیوه‌ ئه‌وه‌نده‌ كه‌سێكی تری خۆش بووێت، وه‌ك هاوه‌ڵانی محمد، محمدیان خۆش ده‌وێت!! پاشان زه‌یدیان شه‌هید كرد، خودای په‌روه‌ردگار لێی ڕازی بێت..

به‌ڵام خوبه‌یبیان چه‌ند ڕۆژێك به‌ند كردو شتی سه‌رسوڕهێنه‌رو سه‌یریان لێبینی، له‌و شتانه‌ش ئه‌وه‌ بوو كه‌ ئافره‌تێكی جاریه‌ ده‌گێڕێته‌وه‌و ده‌ڵێت: خوبه‌یب له‌ ماڵه‌كه‌ی مندا به‌ند كرابوو، ڕۆژێك بینیم هێشووه‌ ترێیه‌كی گه‌وره‌ی به‌ ده‌سته‌وه‌ بوو ده‌یخوارد، هه‌ست ناكه‌م له‌و كاته‌دا له‌ سه‌ر زه‌ویدا ترێ هه‌بوو بێت بۆ خواردن!!

هه‌روه‌ها ده‌گێڕێته‌وه‌و ده‌ڵێت: ڕۆژێك خوبه‌یب پێی وتم: گوێزانێك یان چه‌قۆیه‌كی تیژم بۆ بنێره‌، بۆ ئه‌وه‌ی پێش كوشتنم خۆمی پێ پاك بكه‌مه‌وه‌و مووه‌كانی گیانمی پێ لێبكه‌مه‌وه‌.. ئافره‌ته‌كه‌ش ده‌ڵێت: منیش به‌ منداڵێكدا چه‌قۆیه‌كی تیژم بۆ ناردو پێم وت: بیبه‌ بۆ ئه‌و پیاوه‌.. به‌ڵام كاتێك منداڵه‌كه‌ ڕۆیشت، په‌شیمان بوومه‌وه‌و به‌ خۆمم وت: چیم به‌ خۆم كرد؟! ئه‌و پیاوه‌ داخی خۆی به‌و منداڵه‌ ده‌ڕێژێت‌و ده‌یكوژێت!! به‌ڵام به‌ پێچه‌وانه‌وه‌، كاتێك چووم بۆ لای سه‌یر ده‌كه‌م له‌ لای خۆی داینیشاندووه‌و ده‌ست به‌ سه‌ریدا ده‌هێنێت..

پاشان خوبه‌یبیان برد بۆ ئه‌وه‌ی شه‌هیدی بكه‌ن، داوای كرد كه‌ مۆڵه‌تی بده‌ن، بۆ ئه‌وه‌ی دوو ڕكات نوێژ بكات.. نوێژه‌كه‌ی ته‌واو كردو به‌ خه‌ڵكه‌كه‌ی فه‌رموو: سوێند به‌ خودا له‌به‌ر ئه‌وه‌ نه‌بووایه‌، گومانی ئه‌وه‌م پێده‌به‌ن، كه‌ له‌ مردن ده‌ترسم، نوێژه‌كه‌م زۆر درێژ ده‌كرده‌وه‌..

خوبه‌یب ﷺ یه‌كه‌م كه‌سێك بوو كه‌ له‌ پێش مردندا ئه‌م دوو ڕكات نوێژه‌ی ئه‌نجامدا.. پاشان بۆ سه‌ر دارێك به‌رزیان كرده‌وه‌و به‌ستیانه‌وه‌..

ئا له‌م ساته‌دا چاوه‌كانی به‌ره‌و ئاسمان به‌رز كرده‌وه‌و فه‌رمووی: خودایه‌ ئێمه‌ په‌یامه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌تمان گه‌یاند.. په‌روه‌ردگار سڵاوم بگه‌یه‌نه‌ به‌ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ت‌و حاڵو هه‌واڵی ئێمه‌ی پێ ڕابگه‌یه‌نه‌، كه‌ چیان لێكردین..

پاشان فه‌رمووی: (اللهم أحصهم عدداً.. وقتلهم بدداً.. ولاتغادر منهم أحداً). واته‌: (خودایه‌ یه‌كه‌ یه‌كه‌یان بژمێره‌و به‌ جیا جیا بیانكوژه‌و له‌ناویان به‌ره‌و یه‌ك كه‌سیان لێ ڕزگار مه‌كه‌).. پاشان تیر بارانیان كردو شه‌هید بوو..

هه‌ر له‌و كاته‌داو له‌ دووری زیاترله‌ (٤٠٠كم)ـه‌وه‌ پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ ئه‌م

هەواڵەی بیســتو ئەو خیانەتو ناپاکیەی بە هاوەڵەکانی ڕاگەیاندو وەڵامی سڵاوەکەی خوبەیبیشی دایەوەو فەرمووی: وعليك السلام خبيب..

## ڕەحمەتی خودا لە ئەبوزەڕ بێت..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ بەرەو جەنگی تەبوك کەوتە ڕێ، ڕێگەکە زۆر نارەحەتو ناخۆش بوو، هەروەهــا زۆر زۆر گەرم بوو.. هەندێك لە خەڵکی لەم جەنگە دواکەوتن، پێغەمبەری خوداش ﷺ زۆری لە هیچ کەسـێك لــەو دواکەوتووانە نەدەکردو ناچاری نەکردن کە لەگەڵیدا بێن..

کاتێك بــە پێغەمبەری خودایان ﷺ دەوت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ فڵانە کەس دواکەوتووەو لەگەڵماندا نەهاتووە بۆ ئەم جەنگە، پێغەمبەری خوداش ﷺ دەیفەرموو: وازی لێبێنن، ئەگەر خێری تێدا بێت، ئەوا پەروەردگار پێتانی دەگەیەنێتەوە، ئەگەر نا، باشتر کە پەروەردگار ئەوی لێ دوورخستوونەتەوەو ئێوەی حەساندۆتەوە لێی..

پێغەمبــەری خودا ﷺو هاوەڵان، بە ســەر لی گەرمی بیاباندا دەڕۆیشــتن بەرەو ئەو جەنگە، بەڵام ئەبوزەڕ ﷺ لەبەر ئەوەی لە سەر وشترێکی لاوازو بێتوانا بوو، دواکەوت..

هەندێك لە هاوەڵان ســەیریان کرد، ئەبوزەڕ ﷺ هــەر چەندە لە هاوەڵە چاکەکانی پێغەمبــەری خودایە ﷺ کەچی دواکەوتــووەو دیار نیە.. بــە پێغەمبەریان فەرموو: ئەبوزەڕ ﷺ دواکەوتووە!!

پێغەمبەری خوداش ﷺ بە هەمان شێوەی پێشوو وەڵامیدانەوە..

کاتێــك ئەبوزەڕ ﷺ زانی کە وشــترەکەی زۆر بێتوانایەو ناتوانێت بڕوات، دابەزیو کەلوپەلەکانی دا بە ســەر کۆڵیداو وشــترەکەی جێهێشــتو کەوتە ڕێو زۆر بە پەلە دەڕۆیشــت، بۆ ئــەوەی بە پێغەمبەری خــودا ﷺ بگاتەوە.. ئا بەو گەرمایە، لە ســەر قاچەکانی دەڕۆیشت..

لە ڕێگە پێغەمبەری خودا ﷺو هاوەڵانی لایاندا، هەندێك لە موسڵمانان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پیاوێك لە سەر ڕێگەیەو بەرەو لای ئێمە هەنگاو دەنێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری پیاوەکەی کرد، کە لەو گەرمایەدا کەلوپەلەکانی دابوو بە سەر شانیداو تەپوتۆزی بیابان جار جارە لەبەر چاویان ونی دەکرد، فەرمووی: ئەوە ئەبوزەڕە ﷺ.. کاتێك خەڵکەکە وردبوونەوە، وتیان: بەڵێ.. ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ سوێند بە خودا خۆیەتی..

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ وەك ئەوەی زۆر بۆ دوور بڕوانێت فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە ئەبوزەڕ بێت.. بە تەنها دەڕوات.. بە تەنهاش دەمرێت.. بە تەنهاش زیندوو دەکرێتەوە..

دوای چەند ساڵێك، پێغەمبەری خودا ﷺ کۆچی دوایی کردو دواتر ئیمامی ئەبوبەکر ﷺو ئیمامی عومەر ﷺ کاروباری موسڵمانانیان گرتە دەست.. پاشان لە سەر دەمی ئیمامی عوسماندا ﷺ، ئەبوزەڕ ﷺ لە شاری مەدینە چووە دەرەوەو لە دەرەوەی شارەکە لە ڕەشماڵێکدا لەگەڵ خێزانەکەیدا نیشتەجێ بوو..

کاتێك چووە تەمەنەوەو کاتی ماڵئاوایی کردنی لە ژیانی دونیا نزیك بۆوە، خێزانەکەی لە لای سەریەوە دانیشتو دەستی کرد بە گریان..

ئەبوزەڕ ﷺ لای کردەوە بە لای خێزانەکەیداو فەرمووی: بۆچی دەگریت؟!

خێزانەکەشی وتی: چۆن نەگریەم؟! تۆ وا لەم شوێنە چۆڵو بیابانەدا گیان دەسپێریتو هیچ شتێکم لە لانیە، بۆتی بکەم بە کفن..

ئەبوزەڕ ﷺ فەرمووی: مەگریو موژدە بێت، چونکە من گوێم لێبوو پێغەمبەری خودا ﷺ بە کۆمەڵێکی فەرموو کە منیشیان لە ناودا بوو: یەکێك لە ئێوە لە زەویەکی چۆڵو بیاباندا دەمرێتو کۆمەڵێك لە ئیماندارانیش ئامادەی ناشتنو بە خاك سپاردنی دەبن، هیچ کەسێکیش لەو کۆمەڵە کەسە لە ئاوەدانیدا نەبێت نەمردوونو تەنهاش من ماوم، کەواتە ئەو کەسە منم.. پاشان زۆر بە دڵنیاییەوە فەرمووی: سوێند بە خودا ڕاست دەکەم، پاشان بە خێزانەکەی فەرموو: سەیری ڕێگەکە بکە..

خێزانەکەشی وتی: بۆچی؟! حاجیەکان هەموو ڕۆیشتوونو ڕێگە چۆڵەو کەسی پێدا ناڕوات..

ئەبوزەڕ ﷺ فەرمووی: بڕۆ سەیری ڕێگەکە بکە..

خێزانەکەی ڕۆیشتو سەرکەوتە سەر بەرزاییەكو سەیری خوارەوەی ڕێگەکەی کرد، بەڵام کەسی نەبینیو گەڕایەوە بۆ لای هاوسەرەکەی.. کاتێك هاوسەرەکەی نارەحەت بوو، دوبارە گەڕایەوە سەیری ڕێگەکەی کرد، کەسی نەبینی.. خەریك بوو بگەڕێتەوە، لە دوورەوە کاروانێکی بینیو وەستا هەتا گەیشتنە لایو پێیان وت: ئەوە چیە، ئەی بەندەی خودا؟!

ئەویش وتی: پیاوێکی موسڵمان خەریکە دەمرێت، کفنی دەکەن؟!

وتیان: کێیە؟!

وتی: ئەبوزەڕ ﷺ..

وتیان: هاوەڵی پێغەمبەری خودا ﷺ؟!

وتی: بەڵێ.. هاواریان کرد: ئەبوزەڕ.. ئەبوزەڕ.. بە پەلە چوونە خێمەکەوە.. کاتێك لــە لای ســەریەوە دانیشــتن، زۆر پێیان دڵخۆش بوو، پاشــان فەرمــووی: من گوێم لە پێغەمبــەری خودا بوو ﷺ بــە کۆمەڵێکی فەرموو کە منیش لە ناویاندا بووم: پیاوێك لە ئێوە لــە زەویەکی چۆڵو بیابانــدا دەمرێتو کۆمەڵێك لــە ئیماندارانیش ئامادەی ناشــتنو بە خاك ســپاردنی دەبن، هیچ کەســێکیش لەو کۆمەڵە کەســە لە ئاوەدانیدا نەبێت نەمردوون.. ئێســتاش من وا لە زەویەکی بیابانو چۆڵەوانیدا گیان دەســپێرم.. ئەگــەر جلوبەرگێکم هەبوو بەشــی کفنی خۆم یان خێزانم بــکات، ئەوا کەس کفنم نەکات.. داواتان لێدەکەم، کەسێك لە ئێوە کفنم نەکات، کە کاربەدەست، یان پۆستەچی بێت.. کەسیان بەو شــێوەیە نەبوون، تەنها گەنجێکی خەڵکی مەدینە نەبێت، کە وتی: مامــە گیان من بە جلوبەرگی خۆم کفنت دەکەم، بــەو جلوبەرگانەی کە دایکم بۆی چنیووم..

پاشان گیانی سپاردو کفنیان کردو ئامادەیان کرد بۆ ناشتن، ئا لەو کاتەدا عبداللەی کــوڕی مەســعود ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێــك لە هاوەڵانی کە خەڵکی کوفــە بوون، بە لایدا تێدەپەڕنو دەفەرموێت: ئەمە چیەو کێیە؟!

دەڵێن: ئەوە جەنازەی ئەبوزەڕە ﷺ..

عبداللەی کوڕی مەسعود ﷺ دەست دەکات بە گریانو دەفەرموێت: بە ڕاستی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕاســتی فەرموو، کە فەرمــووی: ڕەحمەتی خودا لە ئەبــوزەڕ بێت.. ئەبوزەڕ بە تەنها دەڕوات..بە تەنهاش دەمرێت.. بە تەنهاش زیندوو دەکرێتەوە.. پاشان عبداللەی کوڕی مەسعود ﷺ دابەزیو بە خاکی سپارد..

# کردەوەکەتان لە لای خودا سەیر بوو..!!

پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوداو وتی: زۆر برسی‌و ماندووم.. برسیەتی بە ڕوخساری پیاوەکەوە، بەئاشکرا دیار بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ ناردی بۆ لای هەندێك لە خێزانەکانی، بۆ ئەوەی داوای خواردنیان لێبکات.. کاتێك چوو بۆ لای یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ و داوای خواردنی کرد، ئەو خێزانەی پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: سوێند بە خودا جگەلە ئاو لە ماڵماندا نیە..

پاشان ناردی بۆ لای یەکێکی تر لە خێزانەکانی‌و پرسیاری لێکرد بوو، ئایا نان، یان خورما، یان شیرتان هەیە؟ بە هەمان شێوەی وەڵامەکەی پێشوو وەڵامدرابۆوە.. هەتا بۆ لای هەموو خێزانەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشت‌و لە ئاو زیاتریان لە لا نەبوو!!

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری هاوەڵەکانی کردو فەرمووی: کێ ئەم شەو میوانداری ئەم پیاوە دەکات، ڕەحمەت‌و بەزەیی خودای لێ بێت؟! زۆربەی هاوەڵانیش حاڵیان هاوشێوەی حاڵی پێغەمبەری خودا ﷺ وابوو، چونکە ئەگەر نانی بەیانییان هەبووایە، نانی ئێوارەیان نەبوو.. ئەگەر نانی ئێوارەیان هەبووایە، نانی بەیانییان نەبوو.. بۆیە هاوەڵان هەموو بێدەنگ بوون.. پیاوەکەش چاوەڕێ بوو، یەکێك میوانداری بکات..

بەڵێ.. ئەو میوانە، میوانی پێغەمبەری ئازیز بوو ﷺ.. پیاوێکی خەڵکی شاری مەدینە لە هاوەڵان هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، من میوانداری ئەم پیاوە دەکەم.. پاشان میوانەکەی بردەوە بۆ ماڵەوەو بە خێزانەکەی وت: ئایا هیچ خواردنێکمان هەیە؟!

خێزانەکەشی لە وەڵامدا وتی: نەخێر.. تەنها کەمێك خواردن نەبێت، ئەویش بۆ منداڵەکان.. ئەو کەمە خواردنەش تەنها بەشی نانی ئێوارەی منداڵەکان دەکات‌و جگە لەم ژەمە خواردنەی کە بەتەمام بیاندەمێ، ئەمڕۆ خواردنیان نەخواردووە، خواردنەکەش زۆر کەمە..

حاڵەتەکە زۆر سەخت‌و دژوار بوو، بەڵام پێویستی بە هەڵوێستێکی ئازایانە هەبوو.. پاشان پیاوەکە وتی: منداڵەکان خەریك بکە، هەتا دەخەون بە بێ نان‌و بە برسیەتی، پاشان کاتێك میوانەکەمان دادەنیشێت‌و خواردنەکە دەهێنی، دەستکاری چراکە بکە، وەك ئەوەی بتەوێت چاکی بکەیت‌و خۆتی لێبدەو بیکوژێنەرەوە، ئەوسا دەست دەجوڵێنم‌و لە تاریکیەکەدا نامبینێ‌و وا دەزانێت لەگەڵیدا نان دەخۆم..

بەڵێ.. بەم شێوەیە میوانەکە نانی دەخواردو هاوەڵەکەی پێغەمبەر ﷺ و خێزانەکەشی تەنها دەمیان دەجوڵاندو بە دەستەکانیان خشە خشێکیان دروست دەکرد، بۆ ئەوەی

میوانەکەیان وا بزانێت نانی لەگەڵ دەخۆن..

میوانداریەکە تەواو بوو، میوانەکە تێری خواردو ڕۆیشت.. بۆ بەیانی خاوەن ماڵەکە ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺو کاتێك پێغەمبەر ﷺ بینی، فەرمووی: بە ڕاستی پەروەردگار تەعەجوبو سەیری لە میوانداری کردنی میوانەکەتان هات.. لە ئاسمانەوە پەروەردگار هەواڵی ئەو میوانداریەی بە پێغەمبەرەکەی خۆی گەیاند بوو..

ئەمـــە جۆری یەکەم بوو لە موعجیزەکانی پێغەمبـــەری خودا ﷺ.. ئەم هەواڵانەش کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەیزانی، بە بێگومان لە لایەن پەروەردگارەوە ئاگادار کرابۆوە، ئەگەر نـــا ئێمە دەزانین کە تەنها پەروەردگـــار زانایە بە غەیبو نادیارەکان، هەر وەك پەروەردگار دەفەرموێـــت: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾ لِّيَعۡلَمَ أَن قَدۡ أَبۡلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمۡ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيۡهِمۡ وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ عَدَدَۢا ﴿٢٨﴾﴾ الجن. واتـــە: (ئەو زاتە زانای نهێنیو شـــاراوەکانە، کەســـیش لە نهێنیو شـــاراوەکانی ئاگادار نـــاکات* مەگەر بۆ پێغەمبەرێك خودا خـــۆی ڕازی بێ (بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت)، ئەو کاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لە بەرو پشتەوە (تا پەریو شەیتانەکان نەتوانن زەفەری پێبەرن)..* تا خودا چاك بزانێتو ئاگادار بێت لەوەی بە ڕێكوپێکی پەیامو ڕێنموویی پەروەردگاریان گەیاندووە، هەر چەندە خودا بە هەموو ئەو شتانەش ئاگادارە کە کردوویانەو پێی هەستاونو هەموو شتێك لای ئەو زاتە بە ژمارە ئامار کراوە)..

هەروەهـــا پەروەردگار فەرمان بـــە پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە ئاگادارمان بکاتەوە بەوەی کە غەیبو نادیارەکان نازانێت، هەر وەك دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٨٨﴾﴾ الأعراف. واتە: (ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: کـــە من ناتوانم هیچ قازانجێك یان زەرەرێك بە خۆم بگەیەنم، مەگەر ویســـتی خودای لە ســـەر بێت، خۆ ئەگەر غەیبو شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکەی زۆرم کۆ دەکردەوە بۆ خۆمو هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو، من هیچ شتێك نیم تەنیا ترسێنەرم (بۆ یاخیەکان)و مژدەدەریشم بۆ کەسانێك کە باوەر دەهێنن)..

کاتێکیـــش کە پێغەمبەری خودا ﷺ هەندێ لە غەیـــبو کارە نادیارەکانی زانیووە، ئەوە نیشانەیە بۆ پێغەمبەرایەتیەکەی.. دروستیش نیە هیچ کەسێك بانگەشەی زانینی نادیارەکان بکات، بەڵکو بە ڕاست زانینیشیان دروست نیەو نابێت بە هیچ شێوەیەکیش پرسیار یان داوایان لێبکەین، بۆ ئەوەی هەواڵێکی نادیارو نەبینراومان پێبڵێن..



## دووەم..
## موعجیزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ لە بواری گەردونیدا..
## لەتبوونی مانگ..

پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە هەموو ڕێگەو شێوازێك بانگی بێباوەرانی دەکرد، بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنن، بەڵام ئەوان باوەڕیان نەدەهێناو بە دوای بیانوودا دەگەڕانو داوای بەڵگەیان لێدەکرد، هەتا ڕۆژێك داوایان کردو وتیان:ئەی محمد مانگمان بۆ لەت بکە!!

ئا لەم کاتەدا ئەم پێغەمبەرە بە سۆزو میهرەبانە لە پێناو باوەڕهێنانی ئەو کەسانەداو بۆ ئەوەی لە بەندایەتی بەردو دار ڕزگاریان بکات، هەروەها بۆ ئەوەی لە تاریکی نەفامیەوە بەرەو ڕوناکی ئیمان ڕێنماییان بکات، بە دڵو بە کوڵ داوای لە پەروەردگاری کرد..

لەپڕ مانگ بوو بە دوو بەشەوەو لەت بوو!!

عبداللەی کوڕی مەسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: لە شاری مەککە مانگم بینی ببوو بە دوو لەتەوەو بە تەواوی لێك جیاببوونەوە.. کاتێك بێباوەران مانگیان بەم شێوەیە بینی، چاویان ئەبڵەق بوو، بەڵام شەیتان بە سەریاندا زاڵ بووو پێی وتن: ئەوە جادووەو محمد جادووی لێکردن..

پاشان بۆ ئەوەی لەم حاڵەتە ڕزگاریان بێتو خۆیان لە گێلی بدەن، وتیان: لەو کاروانانە بپرسن کە دێن، ئەگەر ئەوانیش لەت بوونی مانگیان بینی بوو.. ئەوا محمد ڕاست دەکات.. ئەگەر نەشیان بینی بوو، ئەوا جادووی کردووە، چونکە بە دڵنیاییەوە ناتوانێت جادوو لە هەموو خەڵکی بکات..

کاتێك کاروانەکان گەیشتنە شاری مەککە، قوڕەیشیەکان پرسیاریان لێکردنو وتیان: ئایا لەت بوونی مانگتان بینی؟

ئەوانیش وتیان بەڵێ.. لە فلانە شەودا مانگمان بینی لەت ببوو.. پاشان خەڵکانێکی تریش لە دەرەوەی مەککە گەیشتنو بە هەمان شێوە لەت بوونی مانگیان بینی بوو..

بێباوەرانی قوڕەیش ئەم جارەش لە باتی باوەڕهێنان، وتیان: محمد جادووی لە ئێ لە خەڵکیش کردووەو پێغەمبەرایەتی محمدیان ﷺ نەسەلماند..

پەروەردگاریش هەواڵ دەفەرموێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ۝٢ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ ۝٣ وَلَقَدۡ جَآءَهُم

﴿مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾ خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾﴾ القمر. واتە: (ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوەو مانگیش لەت بوو★ خۆ ئەگەر ئەوانە هەر موعجیزەو بەڵگەیەك ببینن پشت هەڵدەکەنو دەڵێن: ئەمە جادوویەکی بەردەوامە★ حەقیقەتو ڕاستی بە درۆ دەزانن‌و شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتوون، لە کاتێکدا هەموو شت تەواو دەبێتو هەموو کارێك کۆتایی دێتو دنیا تەواو دەبێتو بەرپابوونی لەنگەر دەگرێت★ بێگومان ئەوەندە هەواڵی تیاچوونی ستەمکارانیان پێگەیشتووە تا داچڵەکێن (تێفکرن‌و لە چەوتی دەست هەڵگرن)★ ئەو بەسەرهاتانە حیکمەتو پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە، بەڵام بۆ ئەوانە بێدارکردنەوە بێ سوودە★ گوێ مەدە بە ناپوختی ئەوانە ڕۆژێك دێت کە بانگ بێژێك بانگ دەکات بۆ بارودۆخێکی زۆر ناخۆش‌و نالەبار★ خوانەناسان چاویان شۆڕەو شەرمەزارن، لە ناخی زەویەوە دێنە دەرەوە، هەر وەك لێشاوی کوللەی زۆر (ڕووکاری زەوی دادەپۆشن)..

لە ڕۆژگاری ئەمرۆشدا لێکۆڵینەوە زانستیەکانی تایبەت بە مانگ، ئەوەیان سەلماندووە کە مانگ شێوەی لەت بوونێکی بۆ دوو بەش پێوە دیارە، وەك ئەوەی لە ڕابوردوودا تووشی کارەساتێکی لەت بوون بوو بێت..

## بە ئاماژەیەك ئاسمان ملکەچی دەبێت..

پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئاماژە بۆ ئاسمان دەکاتو بە ویستی خودا ملکەچی دەبێت.. ئەمەش لە کاتێکدا دەبێت، کە محمد ﷺ ببوو بە پێغەمبەرو وڵات بێبارانی ڕووی تێکرد بوو.. زەویوزارو کشتوکاڵ وشك ببوون..

پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر دوانگە لە ڕۆژی هەینیدا وتاری دەدا.. لە پڕ پیاوێك هاتە ژوورەوەو ڕووی کردە پێغەمبەری خودا ﷺو چاوەڕێی نەکرد تا پێغەمبەری خودا ﷺ لە وتارەکەی دەبێتەوە، بەڵکو وتارەکەی پێبڕیو بە دەنگی بەرز هاواری کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ماڵو حاڵمان تیاچوو.. داوای باران لە پەروەردگار بکەو بپارێرەوە، بۆ ئەوەی بێت بە هانامانەوەو ماڵو سەروەتو سامانو ئاژەڵو کشتوکاڵمان ڕزگاری بێت..

پیاوەکە زۆر بە کوڵ قسەی دەکردو دەیزانی کە برسیەتی چی بە منداڵەکانی کردووەو مەڕومالاتیان بە دەست بێبارانیەوە چی بەسەرهاتووە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ هاوخەمی هاوەڵەکانی بوو.. غەمو ناڕەحەتیەکانی خەڵکی، بە غەمو ناڕەحەتی خۆی دەزانی.. هەر بۆیە یەکسەر دەستە پیرۆزەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو دەســتی کرد بە دۆعا کردنو دەیفەرموو: خودایە بارانمان بۆ ببارێنە.. خودایە بارانمان بۆ ببارێنە..

ئەنەســی کوڕی مالیك ﷺ کە لە نێوان ئامادەبوواندا بوو، دەفەرموێت: ســوێند بە خــودا کاتێك کــە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دۆعای دەکردو دەپاڕایەوە، بە هیچ شــێوەیەك ئاســمان تەنها پەڵە هەورێکیشــی پێوە نەبوو، بەڵکو ئاسمان هاوشــێوەی شوشە پاكو بێگەرد بوو.. ســوێند بە خودا دەستەکانی هێشتا دانەگرتبوو، هەتا پەڵەی هەور وەکو چیای گەورە گەورە دروســت بوونو هێشــتا پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر دوانگەکەی دانەبەزی بوو، باران دەستی بە بارین کردو بینیم ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەری خودا ﷺ تەڕ بوو..

حــەوت ڕۆژی بــەردەوام باران باری.. هەتــا زەوی تێر ئاو بــوو.. ئاژەڵەکان تێریان خــوارد.. لە هەینی داهاتــوودا، پێغەمبەری خودا ﷺ وتــاری دەدا.. هەمان پیاوەکەی هەفتەی ڕابوردوو، یان کەســێکی تر هاتــە ژوورەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خەریکە ماڵو حاڵمان تیادەچێتو داوا لە پەروەردگار بکە بارانەکە کۆتایی بێت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەســتەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: خودایە بارانەکە دەورمــان بگرێتو بە ســەرماندا نەبارێت.. خودایە بە ســەر چــرۆو ڕووەکەکاندا ببارێ.. خودایە بە ســەر قوڵایی شیوەکاندا ببارێ.. پاشان بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ هەورەکان کرد..

ئەنــەس ﷺ دەفەرموێــت: پێغەمبەری خودا ﷺ بە دەســتەکانی ئاماژەی بۆ هەر لایەکــی هەورەکان بکردایە، دوور دەکەوتنەوەو بڵاو دەبوونەوە.. هەتا شــاری مەدینە وەك دوورگەیەکی وشکی لێهاتو دەوروبەرەکەشی هەموو ئاو بوو. رواه البخاري ومسلم..

ئەمــەش توانایەك بــوو، پەروەردگار پێی بەخشــی بوو، هەموو ئــەم کارانەش بە ویســتو ڕەزامەندی پەروەردگار نەبووایە، نەدەبوو.. هەروەك عیســا ﷺ کەڕو لاڵو بەڵەکی چاك دەکردەوە، هەروەها بە یارمەتیو پشت بەستن بە پەروەردگار، مردووشی زیندوو دەکردەوە.. ئەگەر ویستو ڕەزامەندی پەروەردگار نەبێت، ئەوا نەپێغەمبەرانو نەهیچ کەسێکی تریش، ناتوانێت هیچ شتێك لەو کارانە ئەنجام بدات..

## سێیەم..
## موعجیزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر گیانداران..
## مەڕەکەی ئوم مەعبەد..

کاتێك جەورو ستەمی قوڕەیش لە سەر موسڵمانانی شاری مەککە زیادی کرد، موسڵمانان ویستیان کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینە، پێغەمبەری خوداش ﷺ لە شەوێکدا لەگەڵ ئەبوبەکردا ﷺ کەوتنە ڕێ بەرەو شاری مەدینەو، کۆچە پیرۆزەکەیان دەست پێکرد..

قورەیش خەڵاتێکی گەورەی دیاری کرد بوو، بۆ ئەو کەسەی کە بتوانێت دەستگیریان بکات، لەبەر ئەم خەڵاتە کەسانێکی زۆر لە هەوڵی دۆزینەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ و ئیمامی ئەبوبەکردا بوون ﷺ..

لە ڕێگەدا ئەو خواردنەی کە پێیان بوو، تەواو بوو.. بە لای ڕەشماڵی ئافرەتێکدا تێپەڕین کە ناوی (ئوم مەعبەد) بوو.. ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی خانەدانو بەڕێز بوو.. لەبەردەم ڕەشماڵەکەیدا دادەنیشتو کاتێك کەسێك بە بەردەم ڕەشماڵەکەیدا تێدەپەڕی، ئەگەر لە لای بووایە خواردنو خواردنەوەی پێدەدا..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺو ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ ئافرەتەکەیان بینی، پێیان وت: گۆشت یان شیرت لە لایە پێمانی بفرۆشیت؟

ئافرەتەکەش لە وەڵامدا وتی: هیچ شتێکم لە لانیە..

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری ناو ڕەشماڵەکەی کرد، مەڕێکی لاوازی بینیو فەرمووی: ئەم مەڕە چیە، ئەی (ئوم مەعبەد)؟!

ئافرەتەکەش وتی: ئەوە مەڕێکە لەبەر لاوازی لە ڕانەکە بەجێماوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: شیری تێدایە؟

ئافرەتەکە وتی: زۆر لەوە لاوازترە، کە بتانەوێت بیدۆشن!!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: مۆڵەتم دەدەیت بیدۆشم؟

ئافرەتەکە وتی: ئەگەر شیری تێدایە بیدۆشن..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی بە سەر مەڕەکەدا دەهێناو زیکرو یادی پەروەردگاری دەکرد.. هەروەها دەستی بە سەر گوانەکانی مەڕەکەدا دەهێناو داوای قاپێکی گەورەی کرد.. لەپڕ گوانی مەڕەکە گەورە بوو.. پڕ بوو لە شیرو قاچەکانی لەیەکتر دوورخستەوە، وەك ئامادەکارییەك بۆ ئەوەی بیدۆشن..

پێغەمبــەری خودا ﷺ مەرەکەی دۆشــیو قاپەکەی پڕ کردو (ئــوم مەعبەد) لێی خواردەوە.. هەروەها غولامەکەی ئیمامی ئەبوبەکرو ئەو پیاوەی رێگەی نیشان دەدان‌و شــارەزای رێگەکە بوو، هەروەها ئیمامی ئەبوبەکریش ﷺ لە شــیرەکەیان خوارد، هەتا تێر بوون.. پاشان پێغەمبەری خوداش ﷺ لێی خواردەوەو دوبارە قاپەکەی پڕ کردەوە لە شیر، هەتا پڕ بوو، پاشان بۆ (ئوم مەعبەد)ی جێهێشت‌و رۆیشتن..

کاتێك مێردەکەی (ئوم مەعبەد) هاتەوەو شیرەکەی بینی، سەری سورماو وتی: ئەم شیرە چیە؟!

(ئوم مەعبەد) لە وەڵامدا وتی: پیاوێکی زۆر پیرۆز لە لای رەشماڵەکەمانەوە تێپەڕی‌و رووداوەکەی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە..

مێردەکەشــی وتی: باسی ئەو پیاوەم بۆ بکە.. ســوێند بە خودا وا دەزانم ئەوە ئەو پیاوە بێت، کە قورەیش بە دوایدا دەگەڕێت‌و داوای دەکات..

ئوم مەعبەد وتی: ئەو پیاوەی کە من بینیم، پیاوێکی زۆر رووخۆش بوو.. رەوشتی زۆر جوان بوو.. دەم‌و چاوی زۆر گەشاوە بوو.. ماندوویێتی پێوە دیار نەبوو.. چاوەکانی گەش‌و رەش بوون.. ریشێکی پڕی هەبوو.. لە کاتی بێدەنگیدا سەنگێکی تایبەتی هەبوو.. لە کاتی قسە کردندا، قسەکانی روون‌و ئاشکرا بوو.. قسە شیرین بوو.. برگە برگە قسەی دەکردو پەلە پەلی نەدەکرد.. قســەکانی وەکو دەنکە تەسبیح بە شوێن یەکدا دەهاتن.. بــە نرخترین کەس بــوو.. لە دوورەوە زۆر جــوان بوو.. لە نزیکیشــەوە جوانتر بوو.. وەکو نەمامێك وابوو.. زۆر گەشاوە بوو.. کاتێك قسەیەکی بکردایە، هاوەڵەکانی گوێیان لێدەگرت.. کاتێك فەرمانێکی بکردایە، لە جێبەجێ کردنیدا پێشبرکێیان دەکرد..

پاشان پیاوەکەی وتی: ئەگەر بمبینیایە، دەبووم بە هاوەڵی‌و لە پێناویدا خۆم ماندوو دەکردو لە خزمەتیدا دەبووم..

## وشترێکی یاخی..

لە شـاری مەدینەماڵێك هەبوو، وشـترێکیان هەبوو، ئاویان لە بیر پێهەڵدەکێشـا.. ئەم وشـترە لە خاوەنەکـەی چوو بە ڤینداو هیچـی تر ئامادە نەبوو بە پشـتی ئاوی پێهەڵکێشـن.. وشـترەکە ئەوەندە یاخی ببـوو، نەیان دەتوانی هیچ ئیشـێکی پێبکەن، تەنانـەت نەیاندەتوانی سواریشـی ببن.. خاوەنی وشـترەکەش، کەسـێکی هەژار بوو، نەیدەتوانی وشترێکی تر بکڕێتو کارەکانی پێڕاپەڕێنێت..

ئەو ماڵەی وشترەکەیان هەبوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺو وتیان: وشترێکمان هەیە، ئاودێریمان پێدەکرد، ئێستا ناتوانین سوودی لێ ببینینو چووە بە ڤینداو کشتوکاڵو دارخورماکانیشمان لە بێئاویدا خەریکە وشك دەبن..

پێغەمبەری خوداش ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: هەسـتن.. هاوەڵەکانی هەسـتانو لەگەڵیدا کەوتنە ڕێ، هەتا گەیشـتنە ئەو کێڵگەیەی کە وشترەکەی لێبوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ بەرەو لای وشترەکە چوو.. خاوەنی وشترەکەو هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر ترسـان کە ئازاری پێغەمبەری خودا ﷺ بداتو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دڵنیابە وەکو سەگی هاری لێهاتووە، ئەترسین ئازارت بدات..

پێغەمبـەری خودا ﷺ فەرمووی: ترسـی منتان نەبێتو زیاتـر لێی نزیك بۆوە.. وشـترەکەش کاتێك پێغەمبـەری خودای ﷺ بینی، بـەرەو لای پێغەمبەری خودا ﷺ هاتو لە بەردەمیدا کڕنوشـی بۆ برد.. پێغەمبەری خودا ﷺ ناوچەوانو سەری گرت.. وشـترەکەش زۆر بە ملکەچیەوە لە بەردەمیدا چۆکـی دادابوو، هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ بەستیەوەو ڕەشمەکەی کردە ملی..

هاوەڵان، سـەریان سـوڕماو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئـەو گیاندارە، هەر چەندە عەقڵی پێناشـکێت، بەڵام کڕنوشو سوجدەت بۆ دەبات!! خۆ ئێمە پەروەردگار عەقڵو ژیریشـی پێبەخشـیوین، کەواتە ئێمە زیاتر شـایەنی ئەوەیـن، کە کڕنوشو سوجدەت بۆ بەرین..

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: دروست نیە بۆ هیچ مرۆڤێك کڕنوشو سوجدە بۆ مرۆڤێکی تر بەرێت، ئەگەر دروستو چاك بووایە، کە مرۆڤێك کڕنوشو سوجدە بۆ مرۆڤێکی تر بەرێت، ئەوا فەرمانم بە ئافرەت دەکرد، کڕنوشو سوجدە بۆ هاوسەرەکەی بەرێت، لەبەر گەورەیی مافی هاوسەرەکەی لە سەری..

ئـەم هەڵسوکەوتەی پێغەمبەری خـوداش ﷺ یان ئەوەیە کـە وەکو پێغەمبەر

سـولەیمان ﷺ زمانی گیاندارانی زانیـووە، یان لە ڕێگەی نیگاو سروشـەوە ئاگادار کراوەتـەوە، هـەر یەکێکیـان بێت، بە ڕاسـتی جێگـەی سەرسـوڕمانەو یەکێکە لە موعجیزەکانی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ..

تێبینی: ئەم بە دەنگەوە هاتنەی گیانداران، بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ بەپێی ویستی پەروەردگار بووە، چونکە جاری وا هەبووە، پێغەمبەری خودا ﷺ شتێکی لە گیاندارێك ویسـتووە، کەچی ئـەو گیاندارە وای نەکـردووە، هەر وەك ئەوەی ڕوویـدا، کاتێك کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە سـەر وشـترەکەی دەبێتو بە مەبەستی ئەنجامدانی عومرە پێش ڕزگارکردنی شـاری مەککە، دەکەوێتە ڕێ.. لەپڕ وشترەکەی دەوەستێتو ناڕوات، پێغەمبەری خودا ﷺ دەیەوێت وشـترەکەی بەرەو پێشـەوەو بۆ شاری مەککە بەرێت، بەڵام ناڕوات..

خەڵکەکە وتیان: ئەو وشترە یاخی بووە!!

پێغەمبەری خـوداش ﷺ فەرمووی: نەخێر.. یاخی نەبووەو یاخی بوونیش ڕەوشـتی ئەو نیە، بەڵکو ئەو خودایەی کە نەیهێشـتو ڕێگـەی بە فیلەکەی ئەبرەهە نەدا، هەر ئەو خودایەیە کە ئێسـتا ئەم وشترەی لە ڕۆشتن خسـتووەو نایەڵێت بڕوات.. پاشان ڕێکەوتنی حودەیبیە لە نێوان پێغەمبـەری خودا ﷺ و بێباوەڕاندا مۆرکراو پێغەمبەری خوداش ﷺ بەرەو شاری مەدینە گەڕایەوە. رواه البيهقي..





## چوارەم..
## کاریگەری پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ شیفای نەخۆش..
## شیفای قاچی عبداللەی کوڕی عەتیک رضي الله عنه..

ئەبوڕافیعی کوڕی سـەلام، یەکێك بوو لە سەرکردەکانی جولەکەو زۆر مایەی ئازارو نارەحەتی بوو بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ.. هەروەها زۆر هانی بێباوەڕانی مەککەی دەدا بۆ ئەوەی جەنگ و کوشـتاری پێغەمبەری خودا ﷺ بکەن و بە سەروەت و سامانیش، لە دژی پێغەمبەری خودا ﷺ هاوکاری بێباوەڕانی عەرەبی دەکرد..

ئەم جولەکەیە بە بێباوەڕانی مەککەی دەوت: وەرن بۆ کوشـتنی محمدو هاوەڵانی، خـۆ ئێوە خاوەنـی هێزو توانایەکـی بەهێزن.. هەروەها دەسـتێکی بـاڵای هەبوو لە کۆکردنەوەی تیرەو هۆزەکان بۆ دژی موسـڵمانان لە جەنگی خەندەقدا.. هەروەها هەر ئەم جولەکەیە بوو، کە هانی جولەکەکانی (بني قريظة)یداو داوای لێکردن کە ناپاکی و خیانەت لەو پەیمانە بکەن، کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستبوویان..

ئـەم جولەکەیـە لـە قەڵایەکدا دەژیا، کـە لە شـاری مەدینەوە دوور بـوو، نزیك خەیبەر..

پێغەمبـەری خودا ﷺ چەند پیاوێکی لە خەزرەج نارد بۆ لەناوبردنی ئەو جولەکە نەگریسـە.. عبداللەی کوڕی عەتیك رضي الله عنه سـەرکردەی ئەو پیاوانە بوو، کە پێغەمبەری خودا ﷺ ناردنی بۆ ئەو قەڵایە..

لە پێش خۆرئاوابووندا لە شـاری مەدینە دەرچـوون و کەوتنە ڕێ بەرەو قەڵاکەی ئەبوڕافیع لە نزیك خەیبەر.. کاتێك گەیشـتنە ئەوێ، خۆرئاوا ببوو.. ئەو قەڵایەش کە ئەبوڕافیعـی تێدا بوو، داخراو بوو.. دەرگایەکی تێدا بـوو لە بەیانیاندا دەکرایەوە، بۆ ئەوەی جوتیارو شوانەکان، بڕۆن بە دوای ئیش و کاریانداو پاشان دایان دەخستەوەو لە کاتی خۆرئاوابووندا دوبارە دەیانکردەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسـانەی بەیانی ڕۆیشتبوونە دەرەوە بێنە ژوورەوە..

عبداللەی کوڕی عەتیك رضي الله عنه بە هاوەڵەکانی فەرموو: لە شوێنی خۆتان دانیشن، من دەچم بۆ لای دەرگاوانەکە، سا بەڵکو بچمە ژوورەوە..

عبدالله رضي الله عنه ڕۆیشـت، هەتـا لە دەرگاکە نزیك بـۆوە.. دەرگاوانەکە زۆر بە وردی و چاکی سـەیری دەکردو، نەیدەهێشـت کەس بچێتە ژوورەوە، هەتا بە جوانی سـەیری نەکردایەو نەیزانیایە کێیە..

لە کاتی خۆرئاوابووندا، ئەو خەڵکانەی کە بەیانی لە قەڵاکە دەرچوو بوون، هاتنەوەو دەرگاکەیان بۆ کرایەوەو چوونە ژوورەوە.. لەم کاتەدا گوێدرێژێکی دانیشتوانی قەڵاکە ون ببــوو.. هەندێــك لە خەڵکەکە بە چراو مەشــخەڵەوە، لە قەڵاکــە هاتنە دەرەوەو بــە دوای گوێدرێژەکــەدا دەگەڕان، ئەمەش لە کاتێکدا بــوو خۆرئاوا ببوو.. عبداللەی کوڕی عەتیکیش ﷺ لە نزیك قەڵاکەوە بوو، بۆ ئەوەی نەناســرێتەوە، سەری داپۆشی بوو.. جولەکەکانی قەڵاکە گوێدرێژەکەیان دۆزیەوەو گەڕانەوە بۆ ناو قەڵاکە، پاشــان دەرگاوانەکــە بانگی کــردو وتی: کێ دەیەوێــت بێتە ژوورەوە با بێــت، کاتێکیش کە عبدالله ﷺ ویســتی بچێتە ژوورەوە، دەرگاوانەکە وایزانــی لە خۆیانەو وتی: ئەگەر دێیتــە ژوورەوە، وەرە چونکــە دەرگاکــە دادەخەم.. عبدالله ﷺ چــووە ژوورەوەو لە شــوێنێکی ئارام دەگەڕا، تا خۆی تیا بشــارێتەوە.. کاتێك کــە خەڵکەکە هەموو هاتنە ژوورەوە، عبداللــە ﷺ چاودێری دەرگاوانەکەی کرد، بۆ ئــەوەی بزانێت کلیلەکان لە کوێدا دەشارێتەوە..

عبدالله ﷺ لەو شوێنەی کە خۆی تیا حەشار دابوو، ماوەیەك مایەوە، تا خەڵکەکە ئارام بوونەوەو چراکانیان کوژاندەوە.. پاشان کلیلەکانی هێناو لە ناوەوە دەرگای قەڵاکەی کردەوەو بە کەمێك کراوەیی بەجێی هێشت.. پاشان بە بەردەم ئەو ماڵانەدا ڕۆیشت، کە لە ناوەوەی قەڵاکەدا بوون و لە دیوی دەرەوە، دەرگاکانی لە سەر داخستن..

شــەوەکە، شــەوێکی مانگە شــەو بوو.. عبدالله ﷺ کەوتە ڕێ، هەتا گەیشــتە لای خانووەکــەی (ئەبورافیع).. خانووەکەش لە شــوێنێکی بەرزدا بوو، بە پەیژە نەبووایە نەدەتوانرا بیگەیتێ.. عبدالله ﷺ گوێی لە دەنگی (ئەبورافیع) بوو، کە لەگەڵ کۆمەڵێك لە دارودەستەکانیدا خەریکی پیلانگێڕان بوون..

عبدالله ﷺ لە شــوێنێکدا، کە نەدەبینرا دانیشــت و چاوەڕێی دەکرد.. کاتێك شەو درەنگ بوو، دەست و پێوەندەکەی ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەکانیان.. عبدالله ﷺ کاتێك ئەوانی بینی کە ڕۆیشــتن، سەرکەوتە ســەرەوەو زۆر بە وریایی بەرەو ژوورەکەی (ئەبورافیع) کەوتــە ڕێ و هەر دەرگایەکــی دەکردەوە، لە ناوەوە دای دەخســتەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر پاسەوانەکانیش زانییان درەنگ بگەنە لای..

کاتێك چووە ژوورەکەی (ئەبورافیع)، سەیری کرد زۆر تاریکە و چراکان کوژاونەتەوە، عبداللەی کوڕی عەتیکیش ﷺ هەر وەك مێژوونوسان باسی دەکەن، کەسێك بووە چاوی کــز بووە، لەبەر ئەوەی چاوی کز بووەو زۆریــش تاریك بووە، (ئەبورافیع)ی نەبینی..

هەر بۆیە بانگی کردو وتی: (ئەبوڕافیع)..

(ئەبوڕافیع) بە ئاگا هاتو وتی: ئەوە کێیە؟!

عبدالله ﷛ بەرەو ئاراستەی دەنگەکە کەوتە ڕێو شمشێرێکی لە (ئەبوڕافیع)دا، بەڵام بە تەواوی بەری نەکەوتو نەمرد..

(ئەبوڕافیع) هاواری کردو عبدالله بە پەلە بەرەو دەرگاکە ڕایکرد، کاتێك گوێی لە (ئەبوڕافیع) بوو دەیناڵاند، زانی کە نەمردووەو دوبارە گەڕایەوە، وەك ئەوەی یەکێك بێت لە پاسەوانەکان.. ژوورەکە زۆر تاریك بوو، ئەمجارەیان دەنگی خۆی گۆڕیو وتی: ئەوە چیە؟! (ئەبوڕافیع)یش وتی: پیاوێك بە شمشێر برینداری کردم.. بە پەلە عبدالله ﷛ بەرەو لای ڕۆیشتو جارێکی تر بە شمشێرەکەی لێیدا، بەڵام ئەمجارەشیان نەمرد، دوبارە عبدالله ﷛ بەرەو دەرگاکە ڕایکرد.. جوڵە کەوتە ماڵەکەوەو هەندێك لە پاسەوانەکان بەخەبەرهاتن، ئەمجارەشیان عبدالله ﷛ دەنگی خۆی گۆڕیو وتی: (ئەبوڕافیع) ئەوە چیە؟!

پاشان بەرەو ئاراستەی ناڵە ناڵەکەی ڕۆیشتو شمشێرەکەی کرد بە سکیداو خۆی دا بە سەر شمشێرەکەدا، هەتا لە پشتیەوە دەرچوو.. عبدالله ﷛ دەفەرموێت: گوێم لە دەنگی شکانی ئێسقانەکانی پشتی (ئەبوڕافیع) بوو، ئەوسا زانیم کوشتوومە..

عبدالله ﷛ بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتو دەرگا بە دەرگا هەتا گەیشتە پەیژەکەو بە پەلە دابەزی، وایزانی گەیشتووەتە کۆتایی پەیژەکەو خۆی هەڵداو کەوتە سەر زەویو قاچی شکا، بە پەڕۆکەی سەری قاچی بەستو لە سەر یەك قاچ بەرەو دەرگای قەڵاکە کەوتە ڕێ.. بە هەر شێوەیەك بوو، لە دەرگای قەڵاکە دەرچوو، پاشان خۆی گەیاندە هاوەڵەکانی، کە لە چاوەڕوانیدا بوون..

عبدالله ﷛ بە هاوەڵەکانی وت: ئێوە بڕۆنو مژدەی خۆشی بە پێغەمبەری خودا ﷺ ڕابگەیەنن، بەڵام من ئێرە جێناهێڵم هەتا گوێم لە بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانەکەی نەبێت..

لە زەمانی نەفامیدا ئەگەر پیاوێکی بە ناوبانگ بمردایە، ئەوا پیاوێك لە بەرەبەیاندا دەچووە شوێنێکی بەرزو خەڵکی ئاگادار دەکردەوەو هۆنراوەی دەخوێندەوە.. عبدالله ﷛ دەیویست بە تەواوی دڵنیا بێت، کە (ئەبوڕافیع)ی کوشتووە..

هاوەڵەکانی عبدالله ﷛ ڕۆیشتنو گیانداریکیان بۆ سواری بۆ جێهێشت.. کاتێك ڕۆژ بۆوە، عبدالله ﷛ لە دەرەوەی شورای قەڵاکەوە سەیری دەکرد، بینی کەسێك سەرکەوتە

سـەر دیوارێــك و وتی: ئەی خەڵكینــە هەواڵی مردنی (ئەبورافیع)ی گـەورە بازرگانی حیجازتــان پێرادەگەیەنم.. عبدالله ﷺ بە بیســتنی ئەم هەواڵە زۆر خۆشــحاڵ بوو.. پێــش ئەوەی هاوەڵەكانی بگەنەوە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ پێیان گەیشــتەوە.. گەیشــتنەوە بە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ، بەڵام عبدالله ﷺ قاچێكی شـكا بوو، بە شەلە شەل دەڕۆی..

كاتێــك پێغەمبەری خــودا ﷺ عبداللەی بەم شـێوەیە بینی، فەرمــووی: قاچت بكەرەوە، عبدالله ﷺ قاچی كردەوە.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی پیرۆزی بە قاچی عبداللەدا دەهێناو خەڵكەكەش سەیریان دەكرد.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی لانەبرد، هەتا عبدالله ﷺ هەستایە سـەر پێ و بە هیچ شـێوەیەك ئازار لە قاچیدا نەما.. ئەمەش یەكێكی تر بوو لە موعجیزەكانی پێغەمبەری خودا ﷺ. رواه البخاري..

## شیفای چاوەكانی ئیمامی عەلی ﷺ..

پێغەمبــەری خودا ﷺ لەگــەڵ هاوەڵەكانیدا بەرەو جەنگــی خەیبەر كەوتنە رێ.. ماوەیەكی زۆر گەمارۆی قەڵاكانی خەیبەریانداو بۆیان ئازاد نەكرا، چونكە ئازادكردنی ئەو قەڵایانە كارێكی ئاســان نەبــوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ بــە هاوەڵەكانی فەرموو: ســبەینێ ئاڵاو بەیداخی موســڵمانان دەدەم بە پیاوێك، پەروەردگار لە سەر دەستی ئەو پیاوە ســەركەوتنمان پێدەبەخشـێت و قەڵاكانــی خەیبەر رزگار دەكەیــن.. ئەو پیاوە خــوداو پێغەمبەری خودای خۆشــدەوێت و خوداو پێغەمبەری خــوداش ئەو پیاوەیان خۆشدەوێت..

هاوەڵانــی پێغەمبەری خودا ﷺ بە درێژایی ئەو شــەوە بیریــان دەكردەوەو لە دڵــی خۆیاندا دەیان وت: دەبێت ئەو كەســە كــێ بێت، خودای گــەورە ئەو رێزەی پێدەبەخشـێت؟! هەمــووان خۆزگەیان دەخواســت، ئەو كەســەی بەیانی ئاڵاكەی پێدەدرێــت، ئەو بێت.. هەمووان لە چاوەڕوانیدا بوون، هەتا ئەو كاتەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: كوا عەلی؟!

هــاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خــودا ﷺ، عەلی هاواری چاوەكانی دەكات.. ئیمامــی عەلی چاوەكانی ئەوەندەیان ئازار هەبوو، هیچی نەدەبینی.. پێغەمبەری خودا ﷺ ناردی بە شوێنی ئیمامی عەلیداو هێنایان بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ ..

پێغەمبــەری خودا ﷺ هەر دوو چاوی ئیمامی عەلی كــردەوەو تفی پیرۆزی خۆی

کردە هەردوو چاویەوەو پاشان دوعای بۆ کردو لە پەروەردگار بۆی پارایەوە.. هەر لەو ساتەدا، پەروەردگار شیفای بۆ چاوەکانی ئیمامی عەلی ناردو بە هیچ شێوەیەك ئازار لە چاوەکانیدا نەما.. پاشان پێغەمبەری خودا ئاڵاو بەیداخی موسڵمانانی دایە دەستیو پێی فەرمووی: کوشتاریان بکە، هەتا وەکو ئێمە باوەڕ دێنن.. ئەم کارە لەسەرخۆو بە هێمنی جێبەجێ بکە، هەتا دەگەیتە لایان.. پاشـان بانگیان بکە بۆ ئەوەی موسـڵمان بنو ئەو مافانەی پەروەردگاریان تێبگەیەنە، کە بە سەر بەندەکانیەوە هەیەتی، سوێند بە خودا، ئەگەر بە هۆی تۆوە پەروەردگار هیدایەتی تەنها پیاوێك بدات، خێرو پاداشـتەکەی لە وشتری سور بۆ تۆ باشترە. رواه البخاري..

## پێنجەم..
## کاریگەری پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر درەخت..
## کۆڵەکەی دارخورما..

لە کۆندا خەڵکی لە دروسـت کردنی خانووەکانیاندا، پشـتیان بە قەدی دارخورماو قورو بەرد دەبەسـت.. مزگەوتەکـەی پێغەمبەری خوداش ﷺ بریتـی بوو لە چەند دیوارێك، لەگەڵ چەند کۆڵەکەیەك لە قەدی دارخورما، سەری مزگەوتەکەش بە گەڵاو پەلکی دارخورما داپۆشـرا بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژی هەینی بە پێوە وتاری بۆ موسـڵمانان دەخوێندەوە، کاتێکیش ماندوو دەبوو، پاڵی دەدا بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەوە..

ئافرەتێك بە پێغەمبەری خودای ﷺ وت: کوڕێکم هەیە دارتاشە، داوای لێبکەمو پێی بڵێم دوانگەیەکت بۆ دروسـت بکات؟ پێغەمبـەری خوداش ﷺ فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی پێی بڵێ.. ئافرەتەکە بە کوڕەکەی وتو دوانگەیەکی دروسـت کردو هێناییو لە مزگەوت داینا..

ڕۆژی هەینـی پێغەمبـەری خودا ﷺ چووە سـەر دوانگەکەو پاشـان سـڵاوی لە ئامادەبووان کردو دانیشت.. بیلال ﷺ بانگی فەرموو.. لەم کاتەدا خەڵکەکە گوێیان لە دەنگی گریانێك بوو.. دەنگی ناڵە ناڵ دەهات.. ئەو دەنگەش دەنگی کۆڵەکە دارخورماکە بوو، کە پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژانی هەینی پاڵی پێوە دەدا.. کۆڵەکەکە ئەوەندە گریا، خەڵکەکە هەموو گوێیان لێبوو.. هەتا مزگەوتەکەش کەوتە لەرزە..

پێغەمبـەری خـودا ﷺ لـە سـەر دوانگەکە هاتە خـوارەوەو بـەرەو کۆڵەکەی

دارخورماکە ڕۆیشتو باوەشی پێدا کرد.. کۆڵەکەکە دەینالآند، وەکو ناڵە ناڵی منداڵ، هەتا بەرەبەرە بێدەنگ بوو!!

پێغەمبەری خودا ﷺ رووی کردە هاوەڵانیو فەرمووی: (بكى.. لما فقد من الذكر.. أما والذي نفس محمد بيده، لو لم ألتزمه لما زال هكذا إلى يوم القيامة). رواه مسلم واحمد. واتە: (بۆ ئەوە دەگریا کە ئەو زیکرو وتارو ئامۆژگاریانەی لە نزیك نەما.. سوێند بە خودا ئەگەر باوەشم پێدا نەکردایەو دەستم بە سەردا نەهێنایە، هەتا ڕۆژی دوایی گریانەکەی نەدەوەستا)..

هەروەها لە ڕوداوێکی تر کە جابر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتین، هەتا لە شوێنێکدا دابەزینو پێغەمبەری خودا ﷺ چوو پێویستیەکانی خۆی جێبەجێ بکاتو منیش بە هەندێك ئاوەوە کەوتمە شوێنی..

پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ شتێکی نەبینی، کە لە پەنایدا دەست بە ئاو بگەیەنێ.. لە پڕ دوو درەخت بە لای پێغەمبەری خوادا ﷺ لار بوونەوە.. پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆی بەرەو لای یەکێکیانو دەستی برد بۆ چڵێك لە چڵەکانیو فەرمووی: لار بەرەوە بە سەرمداو پەنام لێبکە.. بە فەرمانی خودا.. دارەکە وەکو وشترێکی جڵەو کراو لار بۆوە بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ..

پێغەمبەری خوداش ﷺ درەختێکیانی ڕاکێشا، هەتا لەوەی تریان نزیك بۆوە.. پاشان هەمان فەرمانی بە دارەکەی تر کردو بە ویستی خودا ئەویش نزیك بۆوەو خۆی کەوتە نێوانیانو هەردووکیان ئەوەندە لە یەك نزیك بوونەوە، وەك یەك درەختیان لێهات..

جابر ﷺ دەفەرموێت: ڕۆیشتم لە ترسی ئەوەی نەوەکو پێغەمبەری خودا ﷺ پێم بزانێ.. ڕۆیشتمو لەبەر خۆمەوە قسەم دەکرد، کاتێکم زانی پێغەمبەری خودا ﷺ وا بەرەو ڕووم دێتو هەر دوو درەختەکەش بەرە بەرە لە یەك دوور دەکەوتنەوە، هەتا وەکو یەکەم جاریان لێهاتەوە. رواه مسلم..

## شەشەم..
## کاریگەری پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر خواردن و خواردنەوە..
## زیاد بوونی ئاو..

لە رۆژێکی زۆر گەرمدا، پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی لە گەشتێکی دوورو درێژدا بوون.. رێگەکەش رێگەیەکی زۆر وشــك و بێئاو بوو.. هاوەڵان سکاڵای تینوویەتیان بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ هێنا، بۆ ئەوەی چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی ئیمامی عەلی و پیاوێکی تری کردو داوای لێکردن بچن بە دوای ئاودا بگەرێن..

ئیمامــی عەلی ﷺ لەگەڵ پیاوەکەی تردا رۆیشــتن و بە دوای ئــاودا دەگەران، لەم کاتەدا ئافرەتێکیان بینی، لە ســەر وشــترەکەی لە نێوان دوو مەرکانە ئاودا بوو.. پێیان وت: ئەو ئاوەت لە کوێ دەستکەوتووە..

ئافرەتەکــەش وتی: نێوانی ئێوەو ئاوەکە شــەوو رۆژێك دوورە.. پاشــان پێیان وت: کەواتە بابرۆین..

ئافرەتەکە وتی: بۆ کوێ؟!

وتیان: بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ..

ئافرەتەکە وتی: بۆ لای ئەو پیاوەی کە ئاینەکەی خۆی گۆریووە؟!

دوو هاوەڵەکە لەگەڵ ئافرەتەکەدا درێژەیان بە قسـە نەداو کەوتنە رێ.. ئافرەتەکە بە ســەر وشترەکەیەوە لەگەڵیاندا کەوتە رێ و گەیشــتنە لای پێغەمبەری خودا ﷺ و پرسیاری ئاوی لێکرد، ئافرەتەکەش وتی: ئاوەکە لێرەوە زۆر دوورەو راشیگەیاند کە ئافرەتێکی لاوازەو دایکی کۆمەڵێك منداڵی بێ باوك و هەتیوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەســتی بە سەر هەر دوو مەرکانە ئاوەکەدا هێناو پاشان داوای جامێکی گەورەی کردو ئاوی هەر دوو مەرکانەکەی تێکرد.. پاشان بانگی هاوەڵەکانی کرد بۆ ئەوەی بێن ئاو بخۆنەوە.. هەیان بوو ئاوی دەخواردەوەو هەیان بوو دەفرو کەلوپەلەکانی پر لە ئاو دەکردو ئافرەتەکەش سەیری ئاوەکەی دەکرد، کە چی لێدەکەن..

هاوەڵان ئاویان خواردەوەو دەفــرو کەلوپەلەکانیان لێ پر کرد، ئاوەکە هیچ کەمی نەکرد، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ ویســتی چاکەیەك لەگەڵ ئافرەتەکەدا بکات، بۆیە



داوای لــە هاوەڵانی کرد کە خواردنی بۆ کۆ بکەنەوە.. هاوەڵان خورمای عەجوەو ئاردی جۆیان بۆ کۆ کردەوەو کردیانە پریاسـکەیەکەوەو بۆیان خستە سەر پشتی وشترەکەی، پاشـان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: خۆ دەزانی کە لە ئاوەکەتمان کەم نەکردەوە، چونکە پەروەردگار تێر ئاوی کردینو تینوویەتی ڕەواندینەوە..

ئافرەتەکـە بـۆ لای کـەسوکاری گەڕایـەوە، کاتێـك گەڕایەوە پێیـان وت: بۆچی دواکەوتیت؟! ئافرەتەکە وتی: تووشـی دوو پیاو بوومو بردمیان بۆ لای ئەو پیاوەی کە دەڵێن ئاینەکەی خۆی گۆڕیووە، پاشـان ڕووداوی ئاوەکەی بۆ باس کردنو وتی: سوێند بـە خودا یـان گەورەترینو بە تواناتریـن جادووگەرە لە نێوان ئاسـمانو زەویدا، یان پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودایە.. پاشان لە دوای ئەو ڕووداوەوە ئافرەتەکەو هۆزەکەشی موسڵمان بوونو باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ هێنا. رواه البخاري ومسلم..

## قاپی دەست نوێژ..

پێغەمبەری خودا ﷺو هاوەڵانی بە هەمان شـێوەی پێشـوو، لە گەشـتێکدا بوونو ئاوێکی کەمیان پێبوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ئێوە ئەمشـەو بە ڕێگەوە دەبن، إنشاءالله سبەینێ دەگەن بە ئاو..

خەڵکەکە کەوتنە ڕێو ڕێگەکەشـیان دوور بـوو.. تینوویەتی تاوی بۆ هێنان، ئاوی دەسـت نوێژیشیان دەسـت نەدەکەوت.. پێغەمبەری خودا ﷺ داوای جامێکی کرد، کە لە لای ئەبوقەتادە بـوو.. جامەکەش، جامێکی بچوك بوو.. ئەبوقەتادە ﷺ جامەکەی هێناو کەمێك ئاوی تێدا بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ دەسـت نوێژی لێگرتو کەمێکیش ئاوی تێدامایەوەو بە ئەبوقەتادەی فەرموو: ئەم جامە بپارێزەو بەم نزیکانە دەبێت بە مایەی هەواڵو خۆشیەك بۆمان.. پاشان لە سەر ڕۆیشتن بەردەوام بوون..

بۆ ڕۆژی دوایی خۆر هەڵهاتو هەموو شـتێك گەرم داهاتو خەڵکەکەش دەیان وت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە هیلاك چووینو زۆرمان تینووە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: ئێوە بە هیلاك ناچن، پاشـان فەرمووی: جامی دەسـت نوێژگرتنەکەم بـۆ ئامادە بکەن.. پاشـان داوای قاپی دەسـت نوێژگرتنەکەی ئەبوقەتادەی کرد..

ئەبوقەتادە جامی دەست نوێژگرتنەکەی هێنا، کە کەمێك ئاوی تێدا بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ لێی وەرگرتو جامەکەی سەر بەرەو خوار کردەوە، کاتێك خەڵکەکە ئاوەکەیان



بینی، هێرشیان بۆ بردو قەرەباڵغییان دروست کرد..

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: بە جوانی شتەکانتانی لێ پڕ بکەن، هەمووتان تێر ئاو دەبن.. پێغەمبەری خودا ﷺ ئاوی دەکردە یەکێك لە جامەکانەوەو ئەبوقەتادەش ﷺ ئاوی دەدا بە خەڵکەکە، هەتا هەموو تێر ئاو بوون و کەلوپەلەکانیشیان لێ پڕ کرد.. تەنها پێغەمبەری خودا ﷺو ئەبوقەتادە ﷺ مانەوە..

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ بە ئەبوقەتادەی فەرموو: بخۆرەوە..

ئەبوقەتــادەش ﷺ فەرمووی: من ناخۆمەوە، هەتا تۆ نەخۆیتەوە ئەی پێغەمبەری خودا..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئاوگێڕ یاخود ئەو کەسەی ئاو بۆ خەڵکی تێدەکات، دەبێت لە کۆتاییدا ئاو بخواتەوە.. هەردووکیان ئاویان خواردەوەو هەموو تێر ئاو بوون، کە نزیکەی ســێ ســەد پیاو دەبوون.. ئەمەش یەکێکی تر بوو لــە موعجیزەکانی ئەو پێغەمبەرە نازدارە ﷺ. رواه احمد ومسلم..

## لە غەزای تەبوکدا..

غەزای تەبوك، زۆر شــتی سەرســوڕهێنەری تێدا بوو.. موســڵمانان تووشی برسیەتی و تینوویەتی و نارەحەتیەکی زۆر بوون.. ڕێگەکەیان زۆر دوورو درێژو نەبڕاوە بوو، ژمارەشیان زۆر بــوو.. پێغەمبەری خــودا ﷺ هەر دوو نوێژی نیوەڕۆو عەســری بەیەکەوە بۆ کردن، پاشان شێوان و عیشاشی بەیەکەوە بۆ ئەنجامدان..

پێغەمبــەری خــودا ﷺ فەرمــووی: بە ویســتی خــودای پەروەردگار ســبەینێ دەگەنە ســەرچاوەی ئاوی تەبوك، هەر کەسێك لە ئێوە گەیشــت بە ئاوەکە، دەست لە ئاوەکە نەدات، هەتا من دێم.. سوپاکە لە ڕۆیشتندا بوو.. لە پێش گەیشتنی پێغەمبەری خودا ﷺ بە ئاوەکە، دوو پیاو گەیشتبوونە سەر ئاوەکە، ئاوەکەش زۆر کەم بوو..

کاتێــك پێغەمبــەری خودا ﷺ دووپیاوەکــەی بینی، لێی پرســین و فەرمووی: ئایا دەستکاری ئاوەکەتان کردووەو دەستتان بەری کەوتووە..

وتیان: بەڵێ..

پێغەمبەری خودا ﷺ لێیان تووڕە بوو.. فەرمووی: چۆن دەستکاری ئاوەکەتان کرد، لە کاتێکدا بە خەڵکەکەم وتووەو ئاگادارم کردوون کە دەستکاری نەکەن؟!

پاشــان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بە هەندێك لە هاوەڵان کرد، لە ســەرچاوەی



ئاوەکە ئاو هەڵبگۆزن.. کەم کەم ئاویان هەڵگۆزیو کردیانە قاپێکی بچووکەوە.. پاشـان پێغەمبەری خودا ﷺ هەر دوو دەسـتو دەمو چاوی تیادا شـۆری.. پاشان ئاوی دەست نوێژەکەی پرژاند بە سەر سەرچاوەی ئاوەکەدا..

بەڵـێ.. ئاوی سـەرچاوەکە زۆر بوو.. خەڵکەکە هەموو ئاویان لێخواردەوەو دەسـت نوێژیان لێگرت.. پاشـان پێغەمبەری خودا ﷺ ئـاوڕی بۆ لای مەعاز ﷺدایەوەو پێی فەرمـوو: ئـەی مەعاز ئەگەر تەمەنت درێژ بێت، ئەم شـوێنە دەبینیت، کە دەبێت بە باخو باخاتێکی چڕوپڕ. رواه مسلم..

## زۆربوونی خواردن..

جابـر ﷺ دەفەرموێـت: لـە رۆژی خەندەقـدا، خەریك بوویـن خەندەقەکەمان هەڵدەکەند.. تاشـە بەردێك هاتـە رێگەمانو چووین بـۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺو پێمان ڕاگەیاند.. پێغەمبەری خوداش ﷺ هاتو لەبرسا بەردی بە سکیەوە بەست بوو، چونکە سێ رۆژ بوو هیچ شتێکمان نەخوارد بوو..

پێغەمبـەری خودا ﷺ پاچەکەی وەرگـرتو بەردەکەی ورد کرد.. لە دوای ئەوە بە پێغەمبـەری خودام ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خـودا ﷺ مۆڵەتم بدەرێ دەچمەوە بۆ ماڵەوە.. چوومەوە بۆ ماڵەوەو بە خێزانەکەم وت: پێغەمبەری خودام ﷺ بە شێوەیەك بینـی، ئارامـم نەماوە، زۆر بە برسـیەتی بینیم، چیمان هەیە؟! خێزانەکەشـم وتی: هەندێك جۆو گیسکێکمان هەیە.. گیسکەکەم سەربڕیو جۆیەکەشم هاڕی.. ویستم بچم بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ، خێزانەکەم وتی: لە لای پێغەمبەری خودا ﷺ ئابرووما نەبەیو خەڵك زۆر بانگ نەکەی، پاشان چووم بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺو پێم وت: پێغەمبـەری خودا ﷺ میوانی منیو خۆتو پیاوێك یـان دوو پیاو لە خزمەتتاندامو پێشم وت: کە چیمان هەیەو خواردنەکەمان چیەو چەندە..

پێغەمبـەری خـودا ﷺ فەرمووی: ئـەی خەڵکانی خەندەق.. جابـر خواردنی بۆ دروسـت کـردوون.. دەی با بڕۆین، پاشـان فەرمووی: دەسـتکاری گۆشـتەکە مەکەو نانەکەش مەبرژێنن هەتا دێم.. ئەو هەموو هاوەڵەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەسـتانو کەوتنە ڕێ..

کاتێك ڕۆیشـتمەوە بـۆ ماڵەوە، بە خێزانەکەمم وت: هاوار بـۆ تۆ!! پێغەمبەری خودا ﷺو هاوەڵەکانی هەموو هاتن..

بەڵـێ.. پێغەمبەری خودا ﷺ هاتو دۆعای بە سـەر گۆشـتو هەویرەکەدا خوێندو پاشـان بانگی کەسـێکی کرد کە نانەکە ببرژێنێت.. سـوێند بە خـودای پەروەردگار، نزیکـەی هەزار کەس دەبوون، هەموو نانیان خوارد، کەچی گۆشـتو هەویرەکە وەك خۆی مابۆوە. رواه البخاري..

## زۆربوونی شیر..

ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: سوێند بە خودای پەروەردگار، ئەوەندەم برسی بوو خەریك بوو بکەومە سەر زەوی‌و لە برساندا بەردم بە سکمەوە بەستبوو..

ڕۆژێك لە سـەر ڕێگەیەك دانیشتم، کە خەڵکی لێوەی تێدەپەڕین، وەك ڕێگەی بەر دەرگای مزگەوت.. ئەبوبەکر ﷺ بە لامدا تێپەڕی‌و پرسیاری ئایەتێکی قورئانم لێکرد، تەنها لە برسا پرسیارم لێکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بمباتەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەڵام لەگەڵ خۆی نەیبردم..

پاشـان عومـەر ﷺ بە لامـدا تێپـەڕی‌و پرسـیارێکم لەویش کـرد، ئەویش لێم تێنەگەیشتو وەڵامی پرسیارەکەی دامەوەو لەگەڵ خۆی نەیبردم..

پاشـان پێغەمبەری خودا ﷺ بە لامدا تێپەڕی‌و کاتێـك بینیمی زەردەخەنەیەکی بۆ کردم‌و زانی چی لە ڕوخسـارو دەروونمـدا هەیەو پێی فەرمـووم: ئەبوهورەیرە لەگەڵم وەرە.. شـوێنی کەوتـم‌و مۆڵەتی وەرگرت‌و چووینە ژوورەوە.. پەرداخێك شـیری لێبوو.. فەرمووی: ئەم شیرە لە کوێوە هاتووە؟!

وتیان: فڵانە کەس بە دیاری بۆی ناردووی..

فەرمـووی: ئەبوهورەیـرە بچۆ بانگی (أهـل الصفة) بکە ، کـە کۆمەڵێك ئیمانداری هەژار بوون.. چونکە ئەو موسـڵمانە هەژارانە میوانی موسڵمانانن‌و کەس‌وکارو ماڵیان نیـە.. هەر کاتێـك پێغەمبەری خـودا ﷺ خێرێکی بۆ بهاتایە، ئـەوا دەینارد بۆ ئەو موسـڵمانە هەژارانە، هەروەها ئەگەر دیاریەکیشـی بۆ بهاتایە، دەینارد بە شوێنیانداو بەشی دەدان..

ئەبوهورەیرەش ﷺ لەبەر ئەوەی زۆری برسی بوو، بانگ کردنی ئەو هەموو موسڵمانەی زۆر پێخۆش نەبوو، چونکە خۆی بە خاوەن مافو برسی تر دەزانی لەوان، بەڵام فەرمانی پێغەمبەری ئازیزە ﷺو دەبێت جێبەجێی بکات..

بــە هەر حاڵ دەفەرموێت: چووم‌و بانگم کردن، هاتن‌و چوونە ژوورەوە بۆ خزمەت پێغەمبــەری خودا ﷺ و پێغەمبەری خوداش ﷺ پێی فەرمووم: ئەبوهورەیرە شــیرەکە بگرەو بەشیان بدە.. پەرداخە شیرەکەم لە دەستی پیرۆزی وەرگرت‌و یەك یەك دەمدا بەو موســڵمانانە، هەتا تێریان خوارد.. بەم شێوەیە هەموویان تێریان خواردو پەرداخەکەم گەڕاندەوە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ..

پێغەمبەری خودا ﷺ بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کردم‌و فەرمووی: ئەبوهورەیرە تەنها من‌و تۆ ماوین..

وتم: بەڵێ.. ئەی پێغەمبەری خودا..

فەرمووی: دانیشــەو بخۆرەوە.. ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: منیش دانیشــتم‌و دەستم کرد بە خواردنەوەی شیرەکە..

پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوام دەیفەرموو: بخۆ.. هەتا وتم: سوێند بەو خودایەی تۆی بە ڕاست ناردووە، هیچی ترم بۆ ناخورێ‌و شوێنم نەماوە تێی بکەم!!

پاشــان فەرمووی: بیدە بە من.. پەرداخەکەم دایە دەســتی‌و سوپاسی خودای کردو پاشان ناوی خودای هێناو پاشماوەی شیرەکەی خوارد. رواه البخاري..

## حەوتەم..

## یارمەتیدانی پەروەردگار بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕێگەی فریشتەو سەربازەکانیەوە..

ســەعدی کوڕی ئەبی وەقــاص ﷺ دەفەرموێت: لە ڕۆژی غــەزای ئوحوددا، لە لای ڕاســت‌و لە لای چەپــی پێغەمبەری خــوداوە ﷺ دوو پیاوی جل‌وبەرگ ســپیم بینی پارێزگاریــان لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکردو دەجەنگان، هەرگیز نە لەوەو پێش‌و نە لــەوەو دوا، ئەو دوو پیاوەم نەبینی بوو.. ئەو دوو پیاوەش جوبرەئیل‌و میکائیل بوون. رواه البخاري ومسلم..

﴿ إِنَّا كَفَيْنَكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴾

بێباوەڕانی قوڕەیش زۆر ئازاری پێغەمبەری خودایان ﷺ دەدا.. گاڵتەیان پێدەکردو ناڕەحەتیان دەکرد.. ئەو کەسانەش کە زۆر ئازاری پێغەمبەری ئازیزیان ﷺ دەدا، بریتی بوون لە (وەلیدی کوڕی موغیرە، ئەسوەدی کوڕی عبد یغوث، ئەسوەدی کوڕی مطلب، حارسی کوڕی عیطل، عاصی کوڕی وائل)..

ڕۆژێك جوبرەئیل دێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ و پێغەمبەری خوداش ﷺ سکاڵای ئەو بێباوەڕانە لە لای جوبرائیل دەکات.. لە پاش کەمێك وەلید بە لایاندا تێپەڕی، جوبرائیل ئاماژەی بۆ سەری پەنجەی دەستی وەلید کردو فەرمووی: من بۆی بەسم، یان بۆی بمێنم..

پاشان ئەسوەدی کوڕی مطلبیان بینی، جوبرائیل ئاماژەی بۆ گەردنی ئەسوەد کردو فەرمووی: با بۆی بمێنم.. پاشان ئەسوەدی کوڕی عبد یغوثیان بینی، جوبرائیل ئاماژەی بۆ سەری کردو فەرمووی: لە دەستی ڕزگارت دەکەمو با من بۆی بمێنم..

پاشان حارسی کوڕی عیطلیان بینی، جوبرائیل ئاماژەی بۆ سکی حارس کردو فەرمووی: با بۆی بمێنم..

پاشان عاصی کوڕی وائلیان بینی، جوبرائیل ئاماژەی بۆ پاژنەی پێی عاص کرد، بە هەمان شێوەی کەسەکانی تر فەرمووی: با بمێنم بۆی..

ماوەیەکی کەم تێپەڕی، ئەو سزایانەی کە جوبرائیل پەیمانی بە پێغەمبەری خودا ﷺ دابوو، هاتنە دیو ڕوویاندا..

وەلید بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت، لەو کاتەشدا پیاوێك لە هۆزی خوزاعە تیرو کەوانەکەی چاك دەکرد، تیرێکی لە دەست دەردەچێتو بەر پەنجەی وەلید دەکەوێتو لە دوای چەند ڕۆژێکی کەم دەمرێت..

ئەسوەدی کوڕی مطلبیش چاوەکانی لە دەستداو کوێر بوو، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئەسوەد لەگەڵ منداڵەکانیدا لە ژێر دارێکدا دانیشتبوون، لەپڕ بە منداڵەکانی دەڵێت: وا کوشتمی، ئا لێمی دوورناخەنەوە؟!

منداڵەکانیشی دەڵێن: ئێمە هیچ شتێك نابینین!! دوبارە ئەسوەد بە منداڵەکانی دەڵێت: لەناوی بردمو درك دەکات بە چاوەکانمدا، لێمی دوورناخەنەوە؟!

منداڵەکانیشی دەڵێن: هیچ نابینین!! ئەسوەد چاوەکانی کوێر دەبێتو پاش ماوەیەکی کەم دەمرێت..

ئەسوەدی کوڕی عبد یغوثیش برینێك لە سەری دروست دەبێتو پێی دەمرێت..

حارسی کوڕی عیطلیش سکی بادەکاتو زۆر گەورە دەبێت، هەتا وای لێدێت، لە دەمیەوە پیسایی دەردەچێتو پاشان دەمرێت..

عاصی کوڕی وائلیش بە گوێدرێژ بەرەو طائف دەچێت، لە ڕێگە گوێدرێژەکەی فڕێی دەداتو دەیدات بە دارێکی دڕکاویدا، دڕکێك دەچێت بە پاژنەی پێیداو دەمرێت. رواه البیهقي..

بە ڕاستی پەروەردگار ڕاستی فەرمووە، کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾ الحجر. واتە: (ئێمە تۆ دەپارێزین (لە شەڕو پیلانی) گاڵتەچیو گاڵتەجاڕان)..

## لە جەنگی خەندەقدا..

بە هەزارەها لە بێباوەڕان کۆبوونەوەو هێرشیان هێنایە سەر شارەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ..

پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، دەبووایە ئەوەی لە توانایاندا بووایە بۆ بەرەنگاربوونەوەی بێباوەڕان ئەنجامیان بدایە، بەڵام یارمەتی پەروەردگاریش بۆ بەندەکانی لە سەرووی هەموو هێزو تواناکانەوەیەو بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن بە ئیمانداران دەبەخشێت..

بەڵێ.. پەروەردگار ڕەشەبایەکی بەهێزی هەڵکرد، ئاگرو ڕوناکیەکانیانی کوژاندەوە.. ڕەشماڵو دەوارەکانیانی شڕو شێواو کرد.. جێگەو ڕێگەی لێ تێکدان.. ئەسپو ماینو وشترەکانیانی پەرشو بڵاوە پێکرد..

پەروەردگار کۆمەڵێك لە سەربازەکانی نارد، کە نەدەبینران بۆ یارمەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئیمانداران .. ئا ئەو سەربازە نەبینراوانە.. ئەو فریشتە پاكو بێگەردانە، زەوییان لە ژێر پێی بێباوەڕاندا هێنایە لەرزە، بە شێوەیەك بێباوەڕان وایان لێهات کە لە کوێوە هاتبوون، بە سەر شۆڕیو دۆڕاویەوە، بۆ ئەو شوێنە گەڕانەوەو گەمارۆی سەر شارەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ شکا..

پەروەردگاریش باسی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەکات، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الأحزاب. واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانو باوەڕتان هێناوە، یادی نیعمەتی خودا بکەنەوە لە سەرتان (مەبەست جەنگی خەندەقە کە

خــودای گەورە فریای ئیمانداران کەوت)، کاتێك ســەربازانی کوفر هاتنە ســەرتان ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێزو سەربازانێکمان ناردە سەریان کە نەتاندەبینین، خوای گەورە بینا بوو بە هەوڵو کۆششــتان (چۆن پاســەوانیتان دەکرد، چۆن ئەو چاڵە قوڵو درێژەتان هەڵکەند...هتد)..

## یارمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ لە ڕێگەی بارانەوە..

لە جەنگی بەدردا، چەندان ڕووداوی گەورەو بەرچاو ڕوویاندا.. چەندان موعجیزەو نیشانەی ڕوونو ئاشکرا لە لایەن پەروەردگارەوە، پێشکەش بە ئیمانداران کرا، بۆ ئەوەی ئیمانــداران بەهێزو ورە بەرزبنو بتوانن بەو ژمارە کەمەیانەوە، بەرامبەر بەو ســوپا گەورەیەی قوڕەیش بجەنگن..

ئیمانداران وەك ژمارەیان کەم بوو، چەكو هۆیەکانی جەنگیشــیان کەمو لاواز بوو.. زۆربەشــیان گەنجو لاو بوونو یەکەمجاریان بوو لــە جەنگێکی ئاوا گەورەو مێژوویدا بەشــداری بکەن، بە پێچەوانەشــەوە قوڕەیش شــارەزاییەکی تەواویان لە هونەرەکانی جەنگدا هەبوو..

بێباوەڕان گەیشــتنە شــوێنی ڕوودانی جەنگــی بەدرو لە شــوێنێکی ڕەقو پتەودا کەلوپەلەکانیان خست.. بەڵام شوێنی ئیمانداران، شوێنێکی لماویو نەرم بوو، شوێنەکە بە شــێوەیەك بوو، موسڵمانان قاچیان تیایدا دەچەقیو ڕۆیشتنو هاتوچۆکردن تیایدا نارەحەت بوو..

ئا لەم کاتە ناســکەدا پەروەردگار بارانی باراند بە سەر ئەو زەویەی کە موسڵمانەکانی تیادا بوونو شوێن پێیانی جێگیر کردو زەویەکەش پتەو بوو..

بەڵێ.. موســڵمانەکان لــە ئاوی بارانەکەیان خواردەوەو خۆیان لێشــۆریو دەســت نوێژیان لێگرتو بارانەکە بووە مایەی سوودێکی گەورە بۆیان..

پەروەردگاریــش دەفەرموێت: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ ﴾ الأنفـال. واتــە: (ئەو مــژدەو ئارامی دڵە کاتێك بــوو کە خودای گــەورە بــە وەنەوز دایگرتن، بۆ ئــەوەی هێمنیەك بێت بۆتان، لــە لایەن خۆیەوە ئاوێکیشــی لە ئاسمانەوە بە ســەرتاندا باراند بۆ ئەوەی خاوێنتان بکاتەوەو پیسو

پۆخڵی شـــەیتانتان لێ دوور بخاتەوە (تا لە ڕووی جەستەو دڵو دەروونەوە خاوێن بـــن) و دڵەکانتان بەهێزو دامەزراو بکاتو بیان بەســـتێت بە خـــوداوەو بەو ئاوە پێیەکانیشتان جێگیرو قایم بکات)..

## پەروەردگار پێغەمبەرەکەی ﷺ دەپارێزێت..

یەکێکـــی تـــر لـــە نیشـــانەکانی پێغەمبەرایەتـــی پێغەمبـــەری خـــودا ﷺ ئەوەیـــە، پەروەردگـــار ئـــەو پێغەمبـــەرە نـــازدارەی ﷺ پاراســـتووە، هـــەر وەك دەفەرموێـــت: ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الحجر. واتە: (هەر فەرمانێکت پێدراوە (ئەی محمد ﷺ بە ڕێكوپێکی) ئەنجامی بدەو گوێ مەدە بە بوختانو ڕەفتاری موشریكو هاوەڵگەران⋆ ئێمە تۆ دەپارێزین (لە شـــەڕو پیلانی) گاڵتەچیو گاڵتەجاڕان⋆ ئەوانەی لەگەڵ خودای گەورەدا خودایەکـــی تر بڕیـــار دەدەن، جا لە ئایندەدا هەموو ڕاســـتییەکیان بـــۆ ڕوون دەبێتەوەو دەیزانن)..

فیرعەونـــی ئـــەم ئوممەتەو گـــەورەی نەفـــامو نەزانـــەکانو ئەبوجەهلی خۆ بە گـــەورەزان، ڕۆژێـــك بەرەو کەعبـــەی پیرۆز دێتو ســـوێند بە خـــودا درۆینەکانیان دەخواتو بە هاوەڵەکانی دەڵێت: ســـوێند بە لاتو عوززا، ئەگەر محمد بێت، دەبێت ئاواو ئاوای لێبکەم..

زۆری نەبرد پێشەوای مرۆڤایەتی هات، ئەو کەسەی ڕزگارکەری مرۆڤەکان بوو، ئەو کەســـەی بەندەکانی لە بەندایەتی کردنی بەنـــدەوە، ڕزگار کرد بۆ بەندایەتی کردن بۆ خودای بەندەکان..

پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر بە هێمنیو لەســـەرخۆیی، هەنگـــاو هەنگاو لە کەعبەی پیرۆز نزیك بۆوەو الله أكبری فەرمووو نوێژی دابەست.. پاشان چووە سوجدەوەو لەگەڵ پەروەردگاریدا کەوتە ڕازو نیاز..

ئەم هاتنەی پێغەمبەری خودا ﷺ تاقیکردنەوەیەکی بە پەلە بوو بۆ ئەوەی ئەبوجەهل ئازایەتی خۆی بنوێنێت، لە بەردەم دەســـتو پێوەندو هاوەڵەکانیدا.. ئەبوجەهل زۆر بە تونـــدی پێیەکانی دەدا بە زەویداو بەرەو لای پێغەمبەری خودا ﷺ کەوتە ڕێ.. گومانی وابوو ئێســـتا دەتوانێت دەســـتە گڵاوەکانی لە قورگی پێغەمبـــەری خودا ﷺ بچێتە سەر ملی پیرۆزی..

بەڵێ .. هێشتا ئەبوجەهل بە تەواوی نەگەیشتبووە لای پێغەمبەری خودا ﷺ و هاواری کردو پاشــەو پاش گەڕایــەوەو وەك ئەوەی ئازارو گڕو گەرمیەکی پێگەیشــتبێت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو..

بەڵێ .. گەڕایەوە لای هاوەڵەکانیو پێیان وت: ئەوە چیە؟! بۆچی وات لێهات؟!

ئەبوجەهلیــش بە هەناســکە بڕکێو بە شــڵەژاویەوە دەڵێت: لە نێــوان منو محمددا چاڵێکی گەورەی پڕ لە ئاگر هەبوو!!

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لە نوێژەکەی بۆوە، فەرمووی ئەگەر لێم نزیك بووایەتەوە فریشــتەکان دەیانفڕاندو پارچە پارچەیان دەکرد، پەروەردگاریش ئەم ئایەتە پیرۆزانەی نــاردە خوارەوە، کە دەفەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ۝٩ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ۝١٠ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ۝١١ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ۝١٢ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١٣ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ۝١٤ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ۝١٥ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ۝١٦ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ۝١٧ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ۝١٨ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ۝١٩﴾ العلق. واتە: (باشــە، پێم بڵێ ئایا ئەو کەســەی کە فەرمان دەداتو ڕێگری دەکات؟!...* لە بەندەیەکی خودا کاتێك نوێژ دەکات!!...* ئەی ئەگەر ئەو کەســەی قەدەغەی لێدەکرێت لە سەر ڕێبازی هیدایەتو چاکە بێت!!* یان فەرمان بە خوداناسی بکات!!...* ئەی ئەگەر (کابرای خودانەناس) بەرنامەی خودا بە درۆ بزانێتو پشــتی تێ بکات* ئایا نەیزانیووە کە خودا دەیبینێتو ئاگای لە (گوفتارو کرداریەتی)؟!* نەخێر.. ســوێند بە خودا ئەگەر کۆڵ نەداتو کۆتایی (بە دوژمنکاری) نەهێنێت، ئێمە پێشــە ســەری دەگرین(بۆ دۆزەخ کێشــی دەکەین)* ئەو پێشە ســەرە درۆزن و تاوانکارە (پێشە سەر: جێگەی بیرکردنەوەو تێفکرانە)* ئینجا وازی لێبهێنە، با هاوەڵو هاوبیرو باوەڕانی بانگ بکاتو (کۆیان بکاتەوە بۆ دژایەتی ئیمانداران)* ئێمەش فریشتەکانی کاربەدەستی دۆزەخی بۆ بانگ دەکەین (تا تۆڵەی لێ بســێنن و لە دۆزەخ توندی بکەن)* نەخێر بە گوێی ئەو جۆرە کەســانە مەکە، تۆ هەر ســەر گەرمی نوێژو ســوجدە ببەو بە بەندایەتی خــۆت لە پەروەردگارت نزیك بەرەوە). رواه البخاري ومسلم..

## چیرۆکی سوراقە رضي الله عنه..

یەکێکی تر لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ، ڕووداوێك بوو لە کاتی کۆچی پێغەمبەری خودا ﷺ دا بوو، کاتێك کۆچی کرد لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە..

قورەیش دیاریەکی زۆر گەورەیان دیاری کرد، بۆ ئەو کەسەی کە بتوانێت بە زیندوویی یان بە مردوویی پێغەمبەری خودا ﷺ یان ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه دەستگیر بکات.. یەکێك لەو کەسانەی کە ویستی ئەم دیاریە گەورەیەی دەست بکەوێت، سوراقەی کوری مالیك بوو..

بەڵێ.. سوراقە پێغەمبەری خودا ﷺ و ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه ی دۆزیەوەو بەرە بەرە لێیان نزیك بۆوە..

ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆمان هاتن و وا پێمان گەیشتن..

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: دڵتەنگ و غەمبار مەبە، خودامان لەگەڵە..

پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ دۆعای لە سوراقە کرد، ئەسپەکەی سوراقە قاچەکانی چوو بە ناخی زەویدا..

سوراقە ویستی ئەسپەکەی دەربهێنێت، بەڵام نەیتوانی.. پاشان هاواری لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردو داوای یارمەتی و ڕزگار بوونی لێکرد، پەیمانیشیدا کە ڕێگەیان لە بێباوەڕانی مەککە ون بکات و پێیان نەڵێت لە کوێوە ڕۆیشتوون..

پێغەمبەری خودا ﷺ دۆعای بۆ کردو خۆی و ئەسپەکەی ڕزگاریان بوو.. سوراقە گەڕایەوە بۆ مەککەو هەر کەسێکی ببینیایە بە شوێن پێغەمبەری خودا ﷺ و ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه دا دەگەڕێت، ڕێگەی لێ ون دەکردو دەیووت: لەم ڕێگەیەوە نەڕۆیشتوون، بچن لە ڕێگەیەکی ترەوە بۆی بگەڕێن..

بەم شێوە پەروەردگار پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ پاراست، هەر وەك دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧﴾ المائدة. واتە: (دڵنیاش بە کە خودا دەتپارێزێت لە شەڕو خراپەی خەڵکی، چونکە بە ڕاستی خودا هیدایەت و ڕێنموویی قەوم و هۆزی بێباوەڕان نادات)..

سوراقە لە دوای ئەم ڕووداوەوە ئەبوجەهل بەم دێڕە هۆنراوانە

دەدوێنێت و دەڵێت:

أباحكـم والله لـو كنـت شـاهـداً     لأمـر جـوادي إذ تسـيخ قوائمـهُ
عـجبـت ولم تشـكـك بـأن محمداً     نبـي وبـرهان فمـن ذا يقـاومـهُ
عليـك بكـف النـاس عنـه لأننـي     ارى امره يومـاً سـتبدء معـالِمهُ
بأمـر يـود النصـر فيـه بإلبهـا     لـو أن جميع الناس طـراً يحاربَهُ

رواه البخاري ومسلم..

## کێ دەتپارێزێت..؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی لە کاتی گەڕانەوەمیان، لە یەکێك لە غەزاکاندا، لە شوێنێکی نزیك ڕێگە لایاندا، بۆ ئەوەی کەمێك پشوو بدەن.. خەڵکەکە بڵاوەیان کردو چوونە ژێر سێبەری دارو درەختەکانەوەو زۆربەیان خەویان لێکەوت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ ڕۆیشتە ژێر سێبەری دارێکەوەو شمشێرەکەشی بە لقی دارێکەوە هەڵواسی و خەوی لێکەوت..

ئا لەم کاتەدا یەکێك لە بێباوەڕان بەرە بەرەو لە سەرخۆ لە پێغەمبەری خودا ﷺ نزیك بۆوە، هەتا هاتە دیار سەری پیرۆزی پێغەمبەری خودا ﷺ.. پێغەمبەری خوداش ﷺ خەوتبوو.. بێباوەڕەکە شمشێرەکەی پێغەمبەری خودای ﷺ لە دارەکە کردەوەو پاشان بۆ سەر سەری پێغەمبەری خودا ﷺ بەرزی کردەوەو بە هیوای سەرکەوتن بە سەر پێغەمبەری خوادا ﷺ و شەهید کردنی بوو، پیاوەکە هاواری دەکردو دەیوت: ئەی محمد کێ لە من دەتپارێزێت؟! کێ لە دەستی من ڕزگارت دەکات؟!

ئا لەم کاتەدا پێغەمبەری ئازیز ﷺ چاوە پیرۆزەکانی کردەوەو بینی پیاوێك بە شمشێرەوە بە سەر سەریەوە وەستاوە.. هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ هەموو دوور کەوتبوونەوەو خەریك بوون ئیسراحەتیان دەکرد..

پیاوەکە، یەکێك بوو لە جەنگاوەرانی بێباوەڕان و قسە کردن لەگەڵیدا، هیچ سودێکی نەبوو.. نەشدەتوانرا ئارام بکرێتەوەو کاتەکەش زۆر ناسك بوو.. ئەوەی پیاوەکە دوبارەی دەکردەوەو دەیووتەوە، تەنها ئەم وشانە بوو: محمد کێ لە دەستی من ڕزگارت دەکات؟! کێ لە من دەتپارێزێت؟!

ئا لەم کاتەدا پێغەمبەری خودا ﷺ بەوپەڕی متمانەوە فەرمووی: خودای پەروەردگار لە تۆ دەمپارێزێ.. پیاوەکە شڵەژاو شمشێرەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ شمشێرەکەی هەڵگرتەوەو فەرمووی: ئەی تۆ کێ لە دەستی من ڕزگارت دەکات؟!

پیاوە بێباوەڕەکە، نەیدەزانی بڵێ چی؟!

بەڵێ.. پیاوەکە زانی هیچ چارێکی نیە، وتی: هیچ کەسێك نیە لە دەستی تۆ ڕزگارم بکات، ئەی محمد باشبە لەگەڵم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: موسڵمان دەبیت؟

پیاوەکـــە وتی: نەخێر، بەڵام پەیمان دەدەم هەرگیز لە دژت نەجەنگم.. لەگەڵ هیچ کۆمەڵو هۆزێکیشدا نەبم، کە شەڕو جەنگت لەگەڵدا بکەن..

پێغەمبەری خودا ﷺ پیاوەکەی بەخشیو بەریدا.. ئەم پیاوەش گەورەی هۆزەکەی بوو، کاتێك کە گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی، موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو باوەڕی هێنا. رواه البخاري ومسلم..

## زەویش یارمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ دەدات..

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێکی گاور موسڵمان بوو.. سورەتی (البقرة و آل عمران) یش فێر بوو.. خوێندەواریو نوسینیشی دەزانی.. جاری واش هەبوو شتی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ دەنوسی..

لەپـــڕ کابرای تازە موســـڵمان بـــوو، هەڵگەڕایەوەو بووەوە بە گـــاورو پەیوەندی بە هۆزەکەیەوە کردو لە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ قسەی دەکردو گومانو ڕاڕایی دەخستە دڵی خەڵکیەوەو دەیوت: محمد هیچ شـــتێك نازانێت، تەنها ئەو شـــتانە نەبێت کە من بۆم نوسیووە..

کاتێـــك پێغەمبـــەری خودا ﷺ ئەمەی زانـــی.. دوعای لێکردو فەرمـــووی: خودایە بیکەی بە نیشـــانەو بەڵگەو پەندو عیـــبرەت.. زۆری نەبرد، پیاوەکە مردو هاوەڵەکانی ناشتیان..

کاتێك ڕۆژ بووەوە، بینیان زەویەکە لاشـــەی پیاوەکەی فرێداوەتە دەرەوە!! خەڵکانی هۆزەکەی وتیان: ئەمە محمدو هاوەڵەکانی وایان لێکردووە.. ئەمجارەشیان ناشتیانەوەو بە هەمان شـــێوەی ڕۆژی یەکەم بینیان لاشـــەی پیاوە هەڵگەڕاوەکە دەرچۆتە دەرەوەی گۆڕەکـــەو لە ســـەر زەوی کەوتووە!! دوبـــارە وتیان: ئەم کارە محمـــدو هاوەڵەکانی پێی هەڵساون..

بۆ جاری سێیەم گۆڕێکی زۆر قوڵیان بۆ هەڵکەند.. بۆ بەیانی ڕۆژی سێیەم، بە هەمان شێوەی ڕۆژی یەکەمو دووەم، لاشەکەیان لە سەر زەویەکە بینیو سەیریان کرد، لاشەکەی لە گۆڕەکەدا نەماوە!!
ئەمجارەیان بۆیان دەرکەوت، کە ئەمە دەستی محمدو هاوەڵەکانی تێدا نیە، بۆیە بە بێزراوی لە سەر زەوی فڕێیانداو کەس نەچوو بینێژێت.. بەم شێوەیە لاشەکەی لە سەر زەوی فڕێدراو گورگ یاری پێدەکردو باڵندەکانیش ئەندامەکانی لاشەیان پارچە پارچە کرد. رواه البخاري ومسلم..

## هەواڵێک لە ئاسمانەوە..

شاری مەدینە، سێ هۆزی جولەکەی تێدا بوو.. یەکێك لەو هۆزانە هۆزی (بني النضير) بوو.. لە نێوان پێغەمبەری خودا ﷺ و ئەو سێ هۆزەدا، پەیمانێك هەبوو.. پەیمانەکەش ئەوە بوو، لە کاتی خوێن باییو بژاردنەوەی خوێندا، یارمەتیو هاوکاری یەکتر بکەن..
پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژێك لەگەڵ هاوەڵانیدا ڕۆیشتن بۆ لای هۆزی (بني النضير)، بۆ ئەوەی یارمەتیان بدەن لە بژاردنەوەی خوێن بایی هۆزی (بني عامر)دا.. لەبەر ئەوەی عەمری کوری ئومەییە ﷺ بە هەڵە دوو کەسی لە هۆزی ( بني عامر) کوشت بوو، لە نێوان موسڵمانانو هۆزی (بني عامر) یشدا پەیمانو ڕێکەوتن هەبوو، لەبەر ئەوە دەبووایە موسڵمانان خوێن بایی ئەو دوو کوژراوەیان بدایە..
پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵانی گەیشتنە لای هۆزی (بني النضير)و داوای هاوکاری کردنیان لێکردن، بۆ بژاردنەوەی خوێن بایی هۆزی (بني عامر)..
جولەکەکان وتیان: بەڵێ.. یارمەتیتان دەدەینو هاوکاریتان دەکەین، بەڵام جولەکە بەردەوام خەریکی خیانەتو ستەمو کاری خراپەو ناڕەوان..
جولەکەکان پێغەمبەری خودایان ﷺ لە ژێر سێبەری دیوارێکدا دانیشاندو خۆیان ون کرد، وەك ئەوەی بچن خەریکی کۆکردنەوەی پارەو ماڵ بن، بۆ هاوکاری کردنی موسڵمانان.. کاتێك جولەکەکان بە تەنها مانەوە، بە یەکتریان وت: هەرگیز محمدتان بەم شێوەیە چنگ ناکەوێت!! هەرگیز ئاوا بە ئاسانی نایەتە بەر دەستتان!! کێ دەتوانێت لە سەر ئەو خانووە بەرزەوە بەردێکی گەورەی بە سەردا بەر بداتەوەو لە دەستی

رزگارمان بێت؟!

بۆ ئەو کارە پڕ ستەمو خراپە، یەکێکیان بە ناوی (عەمری کوڕی جەحاش) وتی: من بەو کارە هەڵدەستمو ئەنجامی دەدەم..

ئەو جولەکە نەگریسە، سەرکەوتە سەر ئەو خانووەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە ژێر سێبەری دیوارەکەیدا دانیشتبوو، بۆ ئەوەی بەردەکەی بە سەردا بەرداتەوە..

بەڵام جولەکەکان خەیاڵیان خاو بوو!! پەروەردگار لە ئاسمانەوە ئەو هەواڵەی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاگەیاندو ئاگاداری کرد، کە جولەکەکان بە تەمای خیانەتێکی ئاوا گەورەن..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم هەواڵە ئاسمانیەی پێگەیشت، یەکسەرو بە پەلە لە جێگەکەی هەڵساو گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە.. هاوەڵەکانی گومانیان وابوو پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ پێویستیەکی خۆی ڕۆیشتووەو دێتەوە بۆ لایان، بۆیە هەر چاوەڕێی جولەکەکانیان دەکرد.. کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ هەر نەگەڕایەوەو زۆری پێچوو، هاوەڵانی هەستانو بە دوایدا گەڕان.. پیاوێکیان بینی کە لە شاری مەدینەوە دەهاتەوە، پرسیاریان لێکردو وتیان: ئایا پێغەمبەری خودات ﷺ نەبینیووە؟!

پیاوەکەش وتی: بەڵێ.. پێغەمبەری خودام ﷺ لە ناو شاری مەدینە بینی..

هاوەڵان زۆریان لەلا سەیر بوو!! کاتێك گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە پرسیاریان دەربارەی گەڕانەوەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ کرد، ئەویش هەواڵەکەی بۆ باس کردنو ئاگاداری کردن کە جولەکەکان بە تەمای کارێکی ئاوا بوون..

پاشان ئەوە ڕوویدا، کە ڕوویدا لە نێوان موسڵمانانو جولەکەکانی (بني النضير)دا.. موسڵمانان گەمارۆیاندان، هەتا جولەکەکان خۆیان بە دەستەوەداو لە شاری مەدینە شاربەدەریان کردن..

## هەشتەم..
## گیرابوونی دۆعاکانی پێغەمبەری خودا ﷺ..
## پاڕانەوە بۆ دایکی ئەبوهورەیرە رضي الله عنه..

پێغەمبەری خـودا ﷺ دۆعاکانی گیرا بووە.. پەروەردگار دۆعاو پاڕانەوەکانی وەڵام داوەتەوەو لێی وەرگرتووە..

پێغەمبەری خودا ﷺ دۆعای بۆ پێویسـتی موسـڵمانان کردووە.. دۆعای بۆ نەمانی نارەحەتی لە سـەر موسڵمانان کردووە.. دۆعای بۆ شیفاو چاك بوونەوەو هیدایەتدانی موسڵمانان کردووە.. پەروەردگاریش وەڵامی داوەتەوەو پاڕانەوەکانی وەرگرتووە..

لە پێشـەوە هەندێك لە گیرابوونی پاڕانەوەکانیمان باسـکرد، بەڵام ئێستا هەندێکی تریان باس دەکەین..

دایکی ئەبوهورەیرە هێشتا لە سەر دینی هۆزەکەی مابوو.. بتی دەپەرستو بێباوەڕ بوو.. ئەبوهورەیرەش رضي الله عنه بەردەوام بانگی دەکردو داوای لێدەکرد موسڵمان بێت، بەڵام دایکی بە گوێی نەدەکرد..

ڕۆژێـك دوبـارە بانگی دایکـی کرد، بۆ ئەوەی بـاوەڕ بهێنێت، بـەڵام ئەم جارەیان سـەرەرای باوەڕ نەهێنان، قسەشـی بە پێغەمبەری خـودا ﷺ وت.. ئەبوهورەیرە رضي الله عنه دەسـتی کرد بە گریانو بەرەو لای پێغەمبەری خـودا ﷺ کەوتە ڕێو ڕووداوەکەی بۆ باس کردو داوای لە پێغەمبەری خودا ﷺ کە لە خودا بپاڕێتەوە، بۆ ئەوەی دایکی باوەڕ بهێنێتو موسڵمان بێت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ لـە پەروەردگار پاڕایەوەو فەرمـووی: خودایە هیدایەتی دایکی ئەبوهورەیرە بدەیت.. ئەبوهورەیرە، بەم پاڕانەوەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر دڵخۆش بوو.. بە پەلە بەرەو ماڵەوە گەڕایەوەو لە دەرگایدا بۆ ئەوەی بچێتە ژوورەوە.. دایکی گوێی لە دەنگی پێی ئەبوهورەیرە بوو، پێی وت: ئەبوهورەیرە لە شـوێنی خۆت چاوەڕێبـە.. ئەبوهورەیرە رضي الله عنه گوێی لە دەنگی خـوڕە خوڕی ئاو دەبێتو دەزانێت کە دایکی خۆی دەشوات..

کەمێـك لەبـەر دەرگـا چاوەڕێی کـرد، هەتا دایکی خۆی شـۆریو خـۆی گۆڕیو جلوبەرگەکانی لەبەر کرد.. پاشان دایکی دەرگاکەی کردەوەو وتی: ئەبوهورەیرە اشهد ان لاإله إلا الله واشهد أن محمداً رسول الله..

ئەبوهورەیرە ئەوەندە دڵخۆش بوو، دەستی کرد بە گریان، بەڵام گریانی ئەمجارەیان

گریانی خۆشی بوو، بۆیە زۆر بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ، بۆ ئەوەی ئەم هەواڵە خۆشەی پێڕابگەیەنێت.. کاتێك گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مژدە بێت.. دۆعاکەت گیرا بوو.. دایکم باوەڕی هێناو موسڵمان بوو.. پێغەمبەری خوداش ﷺ بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو..

پاشان ئەبوهورەیرە ﷺ حەزی کرد پێغەمبەری خودا ﷺ دۆعای زیاتری بۆ بکاتو زیاتر تووشی خێرو خۆشی بێت، بۆیە داوای لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە خودا بپاڕێوە، بۆ ئەوەی منو دایکم لە لای هەموو ئیمانداران خۆشەویست بینو هەموو ئیماندارانیش لە لای ئێمە خۆشەویست بن..

پێغەمبەری خوداش ﷺ ئەم دۆعایەی بۆ کردنو فەرمووی: پەروەردگار، ئەم بەندەیەی خۆتو دایکی لە لای ئیمانداران خۆشەویست بکەیتو ئیماندارانیش لە لای ئەمان خۆشەویست بکەیت..

ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: لە دوای ئەم پاڕانەوەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەر ئیماندارێك منی بینی بێت، خۆشی ویستوومو لە دڵیدا شیرین بووم. رواه احمد والبيهقي..

## پاڕانەوە بۆ ئەبوتەلحەو خێزانەکەی..

ئوم سولەیم شوی کرد بە ئەبوتەلحەو پەروەردگار کوڕێکی پێبەخشین، ناوی (ئەبوعومەیر) بوو.. ئەبوتەلحە زۆر زۆری ئەم کوڕەی خۆش دەویست، بەڵکو پێغەمبەری خوداش ﷺ ئەم منداڵەی خۆش دەویست.. جاری وا هەبوو پێغەمبەری خودا ﷺ بە لای ئەم منداڵەدا دەڕۆی، کاتێك ئەو منداڵەی دەبینی یاری لەگەڵ باڵندەکەیدا دەکرد، پێی دەفەرموو: يا أبا عمير.. مافعل النغير؟

منداڵەکە نەخۆش دەکەوێتو ئەبوتەلحەش زۆر بۆی بێتاقەتو غەمبار دەبێت، هەتا ڕۆژێك منداڵەکە نەخۆشیەکەی زیاد دەکاتو زۆر نارەحەت دەبێت، ئەبوتەلحەش ﷺ بۆ کارێك دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺو لە گەڕانەوەدا دوا دەکەوێت..

بەم شێوەیە منداڵەکە حاڵی تێکدەچێتو گیان دەسپێرێتو دەمرێت.. کەسوکارو دەرو دراوسێ دەست دەکەن بە گریان.. دایکی منداڵەکە خەڵکەکە ئارام دەکاتەوەو پێیان دەڵێت: کەس ئەم هەواڵە بۆ ئەبوتەلحە باس نەکات، هەتا خۆم بۆی باس دەکەم..

ئوم سولەیم لاشەی منداڵە مردووەکەی لە سوچێکی خانووەکەدا دادەنێتو دایدەپۆشێت.. پاشان هەڵدەستێتو خواردنو خواردنەوە بۆ هاوسەرەکەی ئامادە

دەکات..

کاتێـــك ئەبوتەلحـــە ﷺ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، پرســـیار دەکاتو دەڵێت: منداڵەکە چۆنە؟

خێزانەکەشی لە وەڵامدا دەڵێت: ئارامو لە سەرخۆیەو هیوادارم پشووی دابێت..

ئەبوتەلحە ﷺ بەرەو لای منداڵەکە دەچێت، بۆ ئەوەی بیبینێت، بەڵام خێزانەکەی پێـی دەڵێت: مەیجوڵێنە با پشـوویەك بدات.. پاشـان نانی ئێـوارەی خواردو کەمێك پشوویدا..

کاتێك ئوم ســولەیم بینی کە هاوســەرەکەی نانی خـواردو ماندوویەتی ڕەویەوەو ئیســراحەتی کردووە، پێی وت: ئەبوتەلحە، ئەگەر کەســێك شتێك لە ماڵێك بخوازێت، پاشان ماڵەکە داوای شتەکەیان بکەنەوە، ئەو کەسە دەبێت شتە خوازراوەکە نەگێڕێتەوەو نەیداتەوە بە خاوەنەکەی؟!

ئەبوتەلحەش ﷺ فەرمووی: نەخێر..

ئوم ســولەیم فەرمووی: دەی دراوسێکەمان شتێکیان خواستو پاشان کردیان بە هی خۆیـانو نەیاندایەوە بە خاوەنەکەی.. ئەبوتەلحە ﷺ فەرمووی: بە ڕاســتی شــتێکی خراپیان کردووە..

ئا لەم کاتەدا ئوم سولەیمی شارەزاو ئیماندار وتی: دەی ئەوە منداڵەکەتە.. سپاردەی پەروەردگــارت بــوو، بەڵام لە لای ئێمــە بــوو.. پەروەردگار بردیەوەو ئێســتا لە لای خۆیەتی..

ئەبوتەلحە ﷺ هاواری کردو فەرمووی: بە ڕاســتی بە ئارام گرتنەکەت ئەمشەو بە ســەرمدا زاڵ بوویتو سەرکەوتیت بە ســەرمدا.. پاشان منداڵەکەی کفن کردو ئامادەی کرد بۆ ئەوەی بینێژن..

بۆ بەیانی ڕووداوەکەی بــۆ پێغەمبەری خودا ﷺ باس کرد.. پێغەمبەری خوداش ﷺ داوای بەرەکەتو پیرۆزی بۆ ئەو دوو هاوســەرە بەڕێزە کردو لە خودا بۆیان پارایەوە.. پاشان ئەبوتەلحەو ئوم سولەیم منداڵێکیان بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ ناوی نا عبدالله، بەهۆی پیرۆزی دۆعاکەی پێغەمبەری خوداوە ﷺ، پەروەردگار نۆ کوڕی بەو عبداللەیە بەخشی، کە هەموویان قورئانی پیرۆزیان لەبەر بوو. رواه احمد والبیهقي..





## گیرابوونی پارانەوەکانی، لە دژی دوژمنانی..

سـەیری پێغەمبەری خـودا ﷺ بکـە، کاتێك لە نـاو هاوەڵانیدا دانیشـتووەو پەروەردگار سـەرکەوتنی پێبەخشیووەو بەرنامەکەی بڵاوبۆتەوە بە ناو خەڵکیداو پەروەردگار بە یەك ناسـراوەو بە تەنها دەپەرسترێت، خەڵکیش پۆل پۆل دەهاتن‌و موسـڵمان بوونی خۆیـان ڕادەگەیاند.. هەندێکیش بە ڕق‌وکینـەوە دەهاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ..

ڕۆژێـك یەکێك لە سـەرۆك‌و گەورەکانی عەرەب دێت بـۆ لای پێغەمبەری خودا بە ناوی عامری کوڕی طوفەیل.. هۆزەکەی عامر پێی دەڵێن: ئەی عامر وا زۆربەی خەڵکی موسـڵمان بوون، تۆش موسڵمان بە.. بەڵام عامر زۆر خۆی بە گەورە دەزانی‌و لە وەڵامدا وتی: من بە تەمام ببم بە گەورەی هەموو عەرەب، ئێسـتا شوێنی ئەو منداڵە دەکەوم؟! مەبەستی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو..

بەڵام کاتێك زانی ژمارەی موسـڵمانان زۆر بووەو هێزو دەسـەڵاتیان پەیدا کردووە، لەگەڵ هەندێك لە دارودەستەکەیدا بەرەو لای پێغەمبەری خودا ﷺ کەوتە ڕێ.. کاتێك گەیشـتە مزگەوتەکەی پێغەمبـەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خـودای ﷺ بینی لە ناو هاوەڵانیدا دانیشـتبوو.. عامر چووە بـەردەم پێغەمبەری خودا ﷺ و وتی: ئەی محمد، من‌و تۆ با بە تەنها بین..

پێغەمبەری خوداش ﷺ ئەم جۆرە کەسـانەی زۆر چاك دەناسی، هەر بۆیە فەرموی: هەتا باوەڕ نەهێنی بە تەنها لەگەڵتدا نابم.. دوبارە وتی: ئەی محمد، من‌و تۆ با بە تەنها بین.. ئەی محمد با بە تەنها بین، هەندێك قسەت لەگەڵ دەکەم..

زۆر دوبـارەی کـردەوە، هەتا پێغەمبەری خـودا ﷺ ڕازی بوو.. عامـر یەکێك لە هاوەڵانی بۆ لای خۆی ڕاکێشـا، کە ناوی ئیربەد بوو، پاشـان پێی وت: من لە پێشـەوە محمد خەریك دەکەم‌و تۆش لە دواوە بە شمشێر لێی بدەو بیکوژە..

ئیربەد دەستی لە سەر شمشێرەکەی داناو خۆی ئامادەکرد.. پێغەمبەری خودا ﷺ و عامریـش لە پەنای دیوارێکدا بـە تەنها مانەوە.. عامرو پێغەمبەری خودا ﷺ قسـەیان دەکرد، ئیربەدیش هەر کاتێك دەیویست شمشێرەکەی دەربکێشێت، دەستی لە جوڵە دەکەوت‌و نەیدەتوانی ئەو کارە بکات.. عامر بەردەوام پێغەمبەری خودای ﷺ خەریك دەکردو لە هەمان کاتیشدا سەیری ئیربەدی دەکرد.. ئیربەدیش بە بێ جوڵە وەستا بوو..

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری ئیربەدی کردو زانی مەبەستیان چیە، هەر بۆیە بە عامری فەرموو: ئەی عامر موسڵمان بەو باوەڕ بهێنە..

عامریش وتی: ئەی محمد ئەگەر موسڵمان بم، چیم بۆ بڕیار دەدەی؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەوەی بۆ موسڵمانان هەیە بۆ تۆش دەبێت، ئەوەش لە سەر موسڵمانانە لە سەر تۆش پێویست دەبێت..

عامر وتی: ئەگەر موسڵمان بم، لە دوای خۆت گەورەیی‌و سەرۆکایەتیم پێدەبەخشیت؟

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: نەخێر..

عامر وتی: موسڵمان دەبم، بەو مەرجەی تۆ دەسەڵاتداری شارەکان بیت‌و منیش فەرمانڕەوایی دەشت‌و دەرو دێهاتەکان بم..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: نەخێر .. بەو مەرجە ڕازی نیم..

عامر زۆر تووڕە بوو.. ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو بە دەنگێکی بەرز هاواری کردو وتی: ئەی محمد سوێند بە خودا سوپایەکی گەورەت دێنمە سەر.. سوپایەك بە چەندان ئەسپ‌و ماینەوە.. سوپایەك بە چەندان گەنج‌و لاوی ئازاو چاونەترسەوە، پاشان ڕۆی..

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری ئاسمانی کردو فەرمووی: خودایە لە عامر لامان بدەیت‌و ڕێنمایی هۆزەکەی بکەیت..

عامرو هاوەڵەکانی لە شاری مەدینە دەرچوون‌و ڕۆیشتن، لە ڕێگە هیلاك بوون‌و لە لای ڕەشماڵی ئافرەتێك لایاندا بە ناوی سەلولی..

عامر دابەزی‌و لە ڕەشماڵەکەدا خەوی لێکەوت.. لەپڕ گرێیەکی گەورە لە قورگی عامردا دروست بوو، لەو گرێیانەی کە تووشی وشتر دەبێت‌و دەیکوژێت.. خەبەری دەبێتەوەو زۆر دەترسێت.. پاشان سواری ئەسپەکەی دەبێت‌و ڕمەکەی بە دەستەوە دەگرێت‌و زۆر بە خێرایی دەسوڕێتەوەو لە تاو ئازار دەست دەکات بە هاوار.. هاوار.. هەر دەسوڕێتەوە، هەتا ئەسپەکەی فڕێی دەداتە خوارەوەو دەمرێت..

هاوەڵەکانی جێی دەهێڵن‌و دەگەڕێنەوە بۆ لای هۆزەکەیان.. کاتێك گەڕانەوە خەڵکەکە پرسیاریان لە ئیربەد کردو وتیان: چی بووەو چی ڕوویداوە؟!

ئیربەدیش دەڵێت: شتێکی وانەبووە..

لە پاش ڕۆژێك یان دووڕۆژ، ئیربەد دەچێت وشترێکی بفرۆشێت، خودای گەورە هەورە بروسکەیەکی بۆ دەنێرێت، خۆشی‌و وشترەکەشی دەسوتێنێت..

پەروەردگاریش لە سەر عامرو ئیربەد ئەم ئایەتە پیرۆزانەی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ دابەزاند ..﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾﴾ الرعد. واتە: (چونیەکە لای ئەو زاتە، ئەگەر کەسێکتان قسە بشارێتەوە، یان بیڵێت‌و ئاشکرای بکات، هەروەها ئاگاداری ئەو کەسەیە کە لە تاریکی شەودا خۆی دەشارێتەوە، ئەوەش کە بە ڕۆژدا دەڕواو ئاشکراو دیارە* بۆ خودا هەیە فریشتەی بێ شومار کە بە نۆرە بە دوای یەکدا دێن تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەرو پشت‌و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خودا، بێگومان خودا بارودۆخی هیچ قەوم‌و گەلێك ناگۆڕێت (لە خۆشییەوە بۆ ناخۆشی، یان لە زەلیلیەوە بۆ سەربەرزی، یان لە گرانیەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن‌و نەیکەن، کاتێکیش خودا بیەوێت بەڵایەك بە سەر هەر میللەتێکدا بهێنێت (لە دەرئەنجامی سەرکەشی‌و یاخی بوونیان)، ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لە خودا فریایان بکەوێت‌و رزگاریان بکات* خودا ئەو زاتەیە کە هەورە بروسکەتان نیشان دەدات، هاوڕێ لەگەڵ ترسدا (بە هۆی ڕوناکی بەهێزو دەنگی سامناکی، کە دەوریان هەیە لە بە پیز کردنی خاکی زەوی‌و تەقاندنەوەی تۆوەکاندا) هەروەها ئومێدو هیوا بەخشیشە (بە ساڵێکی پڕ بەرەکەت)، هەر ئەو زاتە هەوری قورس‌و سەنگین‌و ئاودار بەدی دەهێنێت* هەورە تریشقە (بە دەنگی گەورەو سامناکی) تەسبیحات‌و سوپاس‌و ستایشی (بەدیهێنەری دەکات)و فریشتەکانیش لە ترسی ئەو زاتە (سەرگەرمی تەسبیحات‌و ستایش‌و سوپاسگوزارین)، هەروەها (جاری وا هەیە) هەورە بروسکە دەنێرێت‌و دەیماڵێت بە کەسێکدا کە خودا ویستی لەسەرەو ڕۆژی تەواو بووە (جا لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگەو نیشانە بەهێزەدا) ئەوانە هەر لە دەمەدەمێ‌و مشت‌ومڕدان دەربارەی خودا (دوور لە بنەمای زانستی) لە کاتێکدا ئەو زاتە دەسەڵاتی زۆر بەهێزەو تۆڵەسەندنی (لە خودانەناسان) توندو تیژە)..

## ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆشمان دەوێت..

ئەمانەی باسکران، چەند موعجیزەیەك بوون، لە موعجیزەکانی ئەو پێغەمبەرە گەورەو نازدارەی کە مرۆڤەکانی لە تاریکی جەورو ستەم دەرهێناو بەرەو ڕۆشنایی‌و دادپەروەری ڕێنمایی کردن..

ئەو پێغەمبەرەی کە پەروەردگار بە چەندان موعجیزەو نیشانەی دیارو ئاشکرا پشتگیری لێکرد.. گەورەترین موعجیزەش کە پەروەردگار پێی بەخشی، بریتی بوو لە قورئانی پیرۆز..

ئەو قورئانەی هەموو ڕەوان بێژەکانی دونیای سەرسام کرد..

ئەو قورئانەی پەروەردگار دەیپارێزی‌و هیچ دوژمن‌و ستەمکارێك ناتوانێت، تەنها پیتێکی لێ زیادو کەم بکات..

ئەو قورئانەی کە پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر. واتە: (بە ڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین‌و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێبخات‌و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە)..

هەروەهـا دەفەرموێت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ یونس. واتە: (بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد ﷺ قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دە ئێوەش سورەتێك وەك سورەتەکانی دابڕێژن‌و بیهێنن، داوا بکەن لە هەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لە خودا (کە یارمەتیان بدات) دریغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن)..

بەڵێ.. قورئان گەورەترین موعجیزەی پەروەردگار بوو، بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ.. بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا پەروەردگار چاکترینی مرۆڤەکانی کردە هاوەڵ‌و هاودەمی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ.. ئەو هاوەڵانەی کە پێغەمبەری خودایان ﷺ لە خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان خۆشتر دەویست..

لە غەزای ئوحددا بێباوەڕان هێرشیان کردە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ‌و لێی نزیك بوونەوەو دەیانویست شەهیدی بکەن، بەڵام هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ جەستەیان کرد بە قەڵغان‌و شمشێرو تیریان لە پێغەمبەری خودا ﷺ دوور دەخستەوە..

ئەبوتەلحە ﷺ سنگی هێنایە پێشەوەو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، هیچ

تیرێکت بەرنەکەوتووەو بریندار نەبوویت؟ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ گیانی خۆمت فیدا دەکەمو بە قوربانت دەبم.. بە هەموو لایەکدا پارێزگاری لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکردو لە دژی بێباوەڕان دەجەنگا..

ئەبوتەلحە ؓ ئەوەندە کوشتاری بێباوەڕانی کرد، زۆر بە سەختی بریندار بوو، ئەوەندەی تیرو شیر بەرکەوتبوو، کەوتە سەر زەویو بورایەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەبوتەلحەی براتان هەڵگرنو ئاگاتان لێی بێت..

کاتێك سەیری جەستەیان کرد، پانزە تا نۆزدە برینی پێوە بوو..

کاتێك جەنگەکە کۆتایی هات، پێغەمبەری خودا ﷺ یادی یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی کرد.. ئەو هاوەڵە بەڕێزەی کە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ شەونوێژی دەکردو بە ڕۆژوو دەبوو.. لەو کەسانە بوو هەموو شتێکی کرد بوو بە قوربانی دینەکەی، تەنانەت ڕۆحو گیانیشی.. ئەو هاوەڵەش (سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری)بوو..

پێغەمبەری خودا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: کێ دەڕوات، سەیر بکاتو بزانێت سەعد ماوە یان شەهید بووە..

یەکێك لە هاوەڵان فەرمووی: من، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ.. هاوەڵەکە ڕۆیشتو گەڕا بە دوای سەعداو بە برینداری بینیەوە.. سەعد نزیك بوو گیان بسپێرێت.. برینەکانی خوێنیان لێدەڕۆیشت.. جلوبەرگەکانی دڕا بوون.. تەپوتۆزی جەنگ سەرو ڕوخساری داپۆشی بوو..

بەڵێ.. لە دوا ساتەکانی ماڵئاواییدا بوو.. هاوەڵەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی سەعد، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی پێکردم، بۆ ئەوەی بزانم کە لە ڕیزی شەهیداندایت، یان لە ڕیزی زیندووان؟

سەعد ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: من دەمرم.. بەڵام سڵاوم بگەیەنە بە پێغەمبەری خودا ﷺ و پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خودای پەروەردگار، لە باتی هەموو ئوممەتەکەت پاداشتی خێرت بداتەوە.. هەروەها سڵاوم بگەیەنە بە موسڵمانانو گەلو هۆزەکەمو پێیان بڵێ: لە لای پەروەردگار هیچ بیانوویەکیان نیە، ئەگەر بۆ چاوتروکانو ساتێکی کەمیش دەستیان بگاتە پێغەمبەری خودا ﷺ و ئازاری بدەن..

هەروەها بە پێغەمبەری خودا ﷺ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ سەعد بۆنی بەهەشت دەکات.. پاشان گیانی سپارد..

## بێباوەڕانیش شایەتی دەدەن..

بێباوەڕانیش شـایەدی ئـەوە دەدەن، کە پێغەمبەری خودا ﷺ لـە دڵی هاوەڵانیدا چەندە شـیرینو خۆشەویسـت بووە.. کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺو هاوەڵانی شـاری مەککەیـان ڕزگار کرد، پێغەمبەری خوداش ﷺ بە نیەتی ئەنجامدانی عومرە، هات بۆ کەعبەی پیرۆز..

ئا لەم کاتەدا قورەیش چەند نوێنەرێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ، یەکێك لەو کەسـانەی کە بە نوێنەری قورەیش هات بـۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ، (عورووەی کوری مەسعود) بوو..

عـوروە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەگەڵ محمددا قسـەم دەکردو سـەیری هاوەڵەکانیم دەکرد.. سـوێند بە خودا هەر کاتێك محمد تفێکی بکردایە، هاوەڵەکانی دەسـتیان بۆ تفەکە دەگرتەوەو بە دەموچاویاندا دەهێنا.. کاتێك فەرمانێکی دەربکردایە، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکەی پێشـبڕکێیان دەکرد.. لە سـەر پاشماوەی ئاوی دەست نوێژەکەشی، خەریك بوو شەڕیان دەکرد، کاتێك قسەی بۆ دەکردن، هەموو بێدەنگ دەبوونو گوێیان لێدەگرت..

کاتێك عوروە ئەم شـتانەی بینی، گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەکانیو پێی وتن: ئەی قورەیش.. ئەی گەلو هۆز.. سوێند بە خودا بە نوێنەرایەتی چوومەتە لای پادشاکان.. بۆ لای قەیسەری ڕۆم.. بۆ لای نەجاشـی.. هیچیانم نەبینیوە، بە هاوشـێوەی محمد لە ناو دۆستو هاوەڵانیدا گەورەو بەڕێزو خۆشەویست بوو بێت!!

## بەڵێ، خۆشیان دەویست..

هاوەڵانی ئازیزو بەڕێز، پڕ بە دڵ پێغەمبەری خودایان ﷺ خۆش دەویست.. بەڵکو پڕ بە دەم هاواریان دەکردو ئەو خۆشەویستیەیان دەردەبڕی..

ئەوەتـا ئیمامـی عومـەر ﷺ ڕۆژێك بە پێغەمبـەری خـودا ﷺی فەرموو: ئەی پێغەمبـەری خودا ﷺ لەماڵو منداڵم لە لام خۆشەویسـت تری.. بەڵکو سـوێند بەو خودایەی قورئانی بۆ دابەزاندی، لە گیانو ڕۆحیشـم لە لام خۆشەویست تری. رواه احمد والبیهقي..

هەروەهـا یەکێك لە هاوەڵان دێت بۆ لای پێغەمبـەری خودا ﷺ و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺکـەی ڕۆژی دوایی دێت؟ پێغەمبەری خوداش ﷺ پێی دەفەرموێت: چیت بۆ ئەو ڕۆژە

ئاماده کردووه؟

هاوه‌ڵه‌که‌ش ده‌فه‌رمووێت: نوێژو ڕۆژووو خێرو به‌خشینی زۆرم بۆ ئه‌و ڕۆژه ئاماده نه‌کردووه، به‌ڵکو خۆشه‌ویستی خوداو پێغه‌مبه‌ره‌که‌یم بۆ ئه‌و ڕۆژه ئاماده کردووه..

پێغه‌مبه‌ری خوداش ﷺ فه‌رمووی: ده‌ی تۆ له‌گه‌ڵ ئه‌و که‌سانه‌دا ده‌بیت، که خۆشت ده‌وێن.

رواه احمد والبيهقي..

هاوه‌ڵه‌که‌ زۆر دڵخۆش بوو.. چۆن دڵخۆش بوونێك؟! ئه‌ی چۆن دڵخۆش نه‌بێت، که له‌گه‌ڵ ئه‌و پێغه‌مبه‌ره خۆشه‌ویسته‌دا ﷺ حه‌شر بكرێت؟!

هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كاتێك له ته‌نیشتیه‌وه ده‌ڕۆیشتن، له تیشكی خۆر ده‌یان پاراستو سێبه‌ریان بۆ ده‌كرد.. كاتێكیش له‌گه‌ڵیدا سه‌فه‌ریان ده‌كرد، ئه‌و داره‌ی كه سێبه‌ره‌كه‌ی چڕوپڕ بووایه، بۆ پێغه‌مبه‌ری خودایان ﷺ جێده‌هێشت، بۆ ئه‌وه‌ی گه‌رمای نه‌بێتو له ژێر سێبه‌ره‌كه‌یدا پشوو بدات.. درودو سڵاوو به‌زه‌یی په‌روه‌ردگارت لێ بێت، ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ..

## چۆن خۆشمان بووێت..؟

له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌موو ڕێزو خۆشه‌ویستیه‌ی كه هاوه‌ڵان هه‌یان بوو، بۆ پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ، له هه‌مان كاتدا هه‌ر وه‌كو مرۆڤێك سه‌یریان ده‌كرد.. به‌ڵام وه‌كو مرۆڤێكی هه‌ڵبژێردراو، له لایه‌ن په‌روه‌ردگاره‌وه..

محمه‌دی كوڕی عبدالله، په‌یامبه‌رو نێردراوو به‌نده‌ی په‌روه‌ردگاره.. به‌ڵێ.. گه‌وره‌ی هه‌موو نه‌وه‌كانی ئاده‌مه عليه السلام.. شه‌فاعه‌تكاری ڕۆژی مه‌حشه‌ره.. به‌ڵام له‌گه‌ڵ هه‌موو ئه‌مانه‌شدا مرۆڤه، هه‌ر وه‌ك په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رمووێت: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ﴾ فصلت. واته: (ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ، پێیان بڵێ: دڵنیابن كه من هه‌ر به‌شه‌رێكم وه‌ك ئێوه، (جیاوازیه‌كه ته‌نها ئه‌وه‌یه): من وه‌حیو نیگام بۆ ده‌كرێت كه بێگومان خودای ئێوه خودایه‌كی تاكو ته‌نهایه، كه‌وا بوو ئێوه‌ش ڕووی تێبكه‌ن، به ڕاستی بیپه‌رستن؛ له ڕێبازه‌كه‌ی لامه‌ده‌ن، داوای لێخۆش بوونی لێبكه‌نو چاك بزانن كه وه‌یلو سزای سه‌خت بۆ موشریكو هاوه‌ڵگه‌ران ئاماده‌یه)..

بوونی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ وه‌ك مرۆڤێك، له ڕێزو پله‌و پایه‌ی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره ئازیزه ﷺ كه‌م ناكاته‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زۆر به جوانی په‌یامه‌كه‌ی په‌روه‌ردگاری

گەیاند.. زۆر نارەحەتیو ئازاری چەشت، هەتا پەروەردگار سەرکەوتنی پێبەخشیو بەرنامەکەی گەیاندە مەنزڵ.. دەی مادام وایە، مافی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ بە سەر ئوممەتەکەیەوە چیە؟

★ مافی پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر ئێمە، تەنها بەوە دەبێت بڵێین خۆشمان دەوێت؟! تەنها بەوە دەبێت پیایدا هەڵبدەینو شوێنی نەکەوین؟!

نەخێر.. هەر وەك لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتووە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:(لاتطروني كما أطرت النصارى إبن مريم، إنما أنا عبدالله ورسوله). واتە: (لە سنوری خۆم دەرم مەکەن، هەر وەك گاورەکان عیسای کوڕی مەریەمیان لە سنور دەرکرد، چونکە بە دڵنیاییەوە من بەندەو نێردراوی پەروەردگارم)..

★ ئایا خۆشەویستیمان بۆ ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ بەوە دەبێت، کە هاواری لێبکەینو بە دەوری گۆڕەکەیدا بسوڕێینەوە؟! یان بەوە دەبێت، کە سوێندی پێ بخۆین؟!

نەخێر.. نەخێر.. هەموو ئەم کارانە هاوبەشی دانانن بۆ پەروەردگار..

★ دەی کەواتە مافەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ بە سەر موسڵمانانی ئوممەتەکەیەوە چین؟!

یەکەم: باوەڕت وا بێت کە محمد ﷺ بەندەو پێغەمبەری خودایە.. دەبێت خۆشەویستی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ بخەینە پێش خۆشەویستی خۆمانو باوكو دایكوماڵو منداڵمانەوە.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف. واتە: (جا ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوەو پشتیوانیان لێکردووەو پشتگیریان کردووەو شوێنی ئەو نورە کەوتوون (کە قورئانە)و هاورێ لەگەڵیدا ڕەوانە کراوە، هەر ئەوانە سەرفرازو ڕزگارن)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ ﴿٦﴾﴾ الأحزاب. واتە: (پێغەمبەر ﷺ نزیکترە بە ئیمانداران لە خودی خۆیان (واتە: دەبێت پێغەمبەریان لە خۆیان زیاتر خۆش بووێتو فەرمانەکانی لە سەروو فەرمانو داخوازی خۆیانەوە بێت) خێزانەکانیشی دایکی ئیماندارانن)..

دووەم: بە ڕاستی زانینی هەموو ئەو هەواڵانەی کە پێی ڕاگەیاندووین، چونکە ئەو

ئازیــزە ﷺ هیچ شــتێکی لە خۆیەوە نەفەرمــووە.. ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤) ﴾النجم. واتە: (قســەو گوفتاریشی (ئەوەی کە قورئانە) لە ئارەزووبازیو هەواوهەوەسەوە نیە٭ ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خوداییە)..

بۆیە پێویســتە باوەڕمــان بە هەموو ئــەو هەواڵانە هەبێت، کە دەربــارەی هاتنی ڕۆژی دوایــیو نیشــانەکانی فەرموویەتــی، هەروەها هــەر هەواڵێکی تریــش کە پێی ڕاگەیاندووین..

سێیەم: زۆر سەڵاواتی لە سەر بدەین، هەر وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ ۚ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا (٥٦) ﴾ الأحزاب. واتە: (بە ڕاستی خوداو فریشتەکانی سەڵاوات دەدەن لە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوەش ســەلامو سەڵاواتی لە سەر بدەنو (بەردەوام یادی خێری بکەن)..

هەروەهــا پێغەمبەری خوداش دەفەرموێت: (رغم أنف رجل ذكرت عنده فلم يصلى عليَّ). رواه الترمذي. واتە: (لوتی ئەو کەســە بشکێت، کاتێك ناوی من دەبرێتو سەڵاواتم لە سەر نادات)..

هەروەها سوننەتە لە کاتی چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە لە مزگەوت، سەڵاوات لە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ بدەین..

هەروەها لە ســەرەتاو کۆتایی دۆعاو پاڕانەوەدا، ســەڵاوات لە ســەر پێغەمبەری ئازیــز ﷺ بدەین، هەر وەك ئیمامــی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتــی: (الدعاء موقوف بين الســماء والأرض، لايصعد منه شــيء، حتى تصلي علــى نبيك). رواه الترمذي. واتــە: (دوعاو پاڕانەوە لە نێوان ئاســمانو زەویدا دەمێنێتەوەو بەرز نابێتەوە، هەتا سەڵاوات لە سەر پێغەمبەرەکەت نەدەیت)..

هەروەها هەوڵ بدەین لە شەوو ڕۆژی هەینیدا زۆر سەڵاوات لە سەر پێغەمبەری خــودا ﷺ بدەین، چونکــە ڕۆژی هەینــی ڕۆژێکی پیرۆزە، هــەر وەك پێغەمبەری ئازیــز ﷺ دەفەرموێت: (باشــترین ڕۆژەکانتــان ڕۆژی هەینیە، لــە ڕۆژی هەینیدا ئادەم دروســت کراو لەو ڕۆژەشــدا گیانی کێشــرا.. لە ڕۆژی هەینیشدا قیامەت ڕوو دەداتو فوو دەکرێت بە (صور)دا.. لە هەینیدا زۆر ســەڵاواتم لە سەر بدەن، چونکە سەڵاواتەکانتانم نیشان دەدرێتو پێم دەگات)..

چوارەم: شـارەزا بوون لە ژیانی پێغەمبەری خودا ﷺ و هەوڵدان بۆ شـارەزا کردنی خەڵکیش لە ژیان‌و موعجیزەکانی ئەو خۆشەویستە ﷺ..

پێنجەم: کار کردن بە شـەریعەتەکەی‌و جێبەجێ کردنی سوننەتەکانی.. گەیاندن‌و بانگەواز کردن بۆ بەرنامەکەی‌و دوورکەوتنەوە لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی..

شـوێنکەوتنی سـوننەتەکانی، ڕێگەیەکە بۆ بە دەسـت هێنان‌و بە ڕاستی بانگەشە کردن بۆ دەربڕینی خۆشەویستی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ..

پێویستە شوێن هەموو سوننەتەکانی بکەوین، چونکە بە شوێنکەوتنی سوننەتەکانی خێرو پاداشتمان دەست دەکەوێت..

دەی با لە هەڵس‌وکەوت‌و قسـەکردندا شـوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە بین ﷺ.. لە خواردن‌و خواردنەوەدا.. لە خەوتن‌و لە هەستاندا، شوێنکەوتەی بین..

کاتێك گوێمان لەم فەرموودەیە دەبێت: (خالفوا اليهود أعفوا اللحي وحفوا الشوارب). واتە: (بە پێچەوانەی جولەکەوە هەڵس‌وکەوت بکەن، ڕیشتان بهێڵنەوەو سمێڵتان کورت بکەنەوە).. هەوڵ بدەین جێبەجێی بکەین..

هەروەهـا کاتێك گوێمان لـەم فەرموودەیە دەبێت (ماتحـت الكعبين من الإزار ففي النـار). واتە: (لە جل‌وبەرگدا ئەوەی دەکەوێتـە خوار ڕەقێنەی قاچەوە لە ئاگردایە).. هەوڵ بدەین جێبەجێی بکەین..

دەی بـا پەلە بکەین لـە جێبەجێ کردنـی فەرمانەکانی پێغەمبـەری خودا ﷺ.. پەروەردگاریـش دەفەرموێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحـزاب. واتـە: (سـوێند بە خودا بە ڕاسـتی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواوو ڕێك‌وپێك هەیە تا چاوی لێبکەن‌و شـوێنی بکەون، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خودایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشـەو بەردەوام یادی خودا بـە زۆری ئەنجام دەدەن‌و زمانیان پاراوە بە یادی ئەو)..

کاتێك فەرمانمان پێدەکات، دوور بکەوینەوە لە گوێ گرتنی گۆرانی.. کاتێك فەرمانمان پێدەکات، کە دوور بکەوینەوە لە خواردنی ڕیباو دوور بکەوینەوە لە تێکەڵی، پێویستە زۆر بە پەلە بە گوێی بکەین‌و بڵێین: بەڵێ.. فەرمانت لە سـەر چاوو لە سـەر سەرمان، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ..

کاتێك پێمان دەفەرموێت: ماڵو سامان ببەخشن.. لەگەڵ دایكو باوكتاندا باش بن.. پێویستە بە گوێی بکەینو بڵێین: بەڵێ.. ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ملکەچو فەرمانبەردارین.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾ النور. واتە: (بەڵام گوفتاری ئیمانداران کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای خوداو پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمانو گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرع، هەر ئەوانەشن سەرفرازو سەرکەوتوو)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ النساء. واتە: (نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لاف بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوو دەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵو دەروونیاندا هیچ نارەزاییەك دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لە سەر کردووەو دەبێت بە تەواویی تەسلیم بنو ڕازی بن)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوا أَنفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾﴾ النساء. واتە: (هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێت بە فەرمانی خودا، خۆ ئەگەر ئەو خەڵکە بە ڕاستی کاتێك ستەمیان لە خۆیان کرد (بە لادان لە شەریعەت) بهاتنایە بۆ لای تۆو داوای لێخۆش بوونیان لە خودای گەورە بکردایە، پێغەمبەریش داوای لێخۆش بوونی بۆ بکردنایە، ئەوە بێگومان ئەو کاتە دەیانزانی کە خودا تەوبەو پەشیمانی وەرگرەو میهرەبانو دلۆڤانە (ئەگەر بە ڕاستیان بووایە))..

بە دڵنیاییشەوە، پەروەردگار چوونە بەهەشتی پەیوەست کردووە بە ملکەچ بوونو گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ.. ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾﴾ النساء. واتە: (ئەوەی فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەر بکات، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لە بەهەشتی بەریندا) کە خودا نازو نیعمەتی ڕژاندووە بە سەریاندا لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو

پیاوچـاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵو هـاوڕێو هاودەمێکی چاكو بێ وێنەن!٭ ئەو ڕێزو بەهرە گەورەیە هەر لە لایەن خوداوەیە (بۆ ئەو بەختەوەرانە)، خودا خۆی بەســە کە زانایە بە هەموو شتێك)..

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت: هەموو ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشت، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە نایەوێت..

هاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کێ نایەوێت؟!

پێغەمبــەری خوداش ﷺ فەرمووی: ئــەوەی گوێڕایەڵیم بکات، دەچێتە بەهەشــت.. ئــەوەش کە بــێ فەرمانیم بکاتو لێم یاخی بێــت، ئەوا نایەوێت بچێتە بەهەشــت. رواه البخاري..

پەروەردگاریــش جوانتریــن ڕەوشــتو ئاکارمــان فێــر دەکات بەرامبـــەر پێغەمبەرەکەمــان ﷺ، هەروەك دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝١ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ۝٢﴾ الحجرات. واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پێشی خوداو پێغەمبەری خودا مەکەون لە بڕیارو پێشــنیازداو لە خودا بترســنو پارێزکار بن، چونکە بە ڕاستی خودا بیسەرە بە گوفتارتان، زانایە بە نیازو نهێنیەکانتان٭ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە؛ دەنگتان بە سەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز مەکەنەوە لە کاتی گفتوگۆدا، قســە بێ پەردە مەکەن لە خزمەتیدا، وەکو بۆ یەکتری دەکەن، نەوەکو کردەوەکانتان پووچ بێتەوەو هەستیشی پێ نەکەن)..

کاتێــك هــاوەڵان گوێیان لــەم ئایەتە پیرۆزانە بــوو، زۆر لە پێشــتر هەوڵیان دەدا، لەگــەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هەڵسوکەوتو کردارو گوفتاریان جوانتر بێت، تەنانەت هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ داوای لێنەکردنایە، ڕاو بۆچوونی خۆشــیان دەرنەدەبڕیو بێدەنگییان هەڵدەبژارد..

ئەوەتا لە حەجیماڵئاواییدا، بە ئامادە بوونی ســەد هەزار موســڵمان، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ ئەی چ مانگێکە؟ ئەی ئێرە چ شارێکە؟ لە کاتێکدا کە هەموو دەیانزانی، بەڵام وتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن..

بەڵــێ.. پرســیاریان لێدەکرێــتو هەمووان وەڵامــی پرســیارەکەش دەزانن، بەڵام



دەڵێن: خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن.. ئەمەش ئەوپەڕی ڕەوشـــتی جوانی ئەو هاوەڵە ئیماندارانەیە.. ئەمەش ئەوپەڕی ملکەچیە بۆ ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ..

عبداللــەی کوڕی عومەر(خودایان لێ ڕازیبێـــت) دەفەرموێت: پێش ئەوەی کەعبەی پیرۆز ببێت بە قیبلەی موســڵمانان، خەڵکی لە کاتی نوێژدا ڕوویان دەکردە (قودس).. کاتێـــك قورئانی پیرۆز دابــەزیو کەعبەی پیرۆز بوو بە قیبلەی موســڵمانان ، پیاوێك لــە لایــەن پێغەمبەری خوداوە ﷺ هات بــۆ مزگەوتی (قوباء).. کاتێــــك پیاوەکە هات، موســڵمانان لە نوێژی بەیانیدا بوون.. پیاوەکە بە دەنگی بەرز وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەمشەو قورئانی بۆ دابەزیووەو کەعبەی پیرۆز بووە بە قیبلەی موسڵمانان.. هێشتا پیاوەکە قسەکانی تەواو نەکرد بوو، موسڵمانانی مزگەوتی (قوباء) لە ناو نوێژەکەیاندا، ڕوویان لە (قودس) وەرگێڕاو ڕوویان کردە کەعبەی پیرۆز. رواه مسلم..

بەڵێ.. یەکســـەرو بـــە بێ دوو دڵیو ڕاڕایی فەرمانەکـــەی پێغەمبەری خودایان ﷺ جێبەجێ کرد..

ئەنەســـی کوڕی مالیك دەفەرموێت: پێش ئـــەوەی عەرەق حەرام بکرێت، ڕۆژێك لە ماڵی ئەبوتەلحە عەرەقم دەگێڕا.. لەپڕ پیاوێك هاتو وتی: ئایا هەواڵەکەتان نەبیستووەو ئاگادار نین؟!

ئێمەش وتمان: چی بووە؟!

وتی: عــەرەق حەرام کــراوەو پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمانی بە کەســێك کرد، بـــە خەڵکەکە ڕابگەیەنێت، کە عەرەق حەرام کراوە، پاشــان ئــەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ المائدة. واتە: (ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەقو قومارو گۆشـــتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خودا لەو شـــوێنانەی کە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیســـلام، بورجو حەرامو حەڵاڵ زانین بە هۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسنو لە کارو کردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانـــی لێ دوور بگرنو خۆتانی لـــێ بپارێزن، بۆ ئەوەی ســـەرفرازییو بەختەوەری بە دەســـت بهێنن (لە هەر دوو جیهاندا)★ بە ڕاستی شـــەیتان هەر دەیەوێت لە ڕێگەی عەرەقو قومارەوە دوژمنایەتیو بوغزو کینە بخاتە نێوانتانەوەو لە یاد کردنی خوداو

ناوه پیرۆزەکانی ویڵتان بکات، هەروەها سستو تەمەڵتان بکات لە ئەنجامدانی نوێژەکان بە شێنەیی، ئایا ئیتر بەس نیە؟ ئایا کۆڵ نادەن؟!)..

سوێند بە خودا کاتێك گوێمان لەم ئایەتە پیرۆزانە بوو، یەکسەر دەستمان هەڵگرت، تەنانەت هەندێك کەسمان پەرداخە عەرەقەکانیان بە دەستەوە بوو، بەرزیان نەکردەوە بۆ دەمیانو ڕشتیانو وتیان: بەڵێ.. ئەی پەروەردگار وازمان هێنا.. وازمان هێنا..

بەڵێ.. کاتێك موسـڵمانانی شـاری مەدینە ئەم هەواڵەیان بیسـت، بـە بێ دوو دڵی وازیان لە عەرەق هێناو کوپەی عەرەقەکانیان شکاندو ئەوەی تیایدا بوو ڕشتیان، هەتا وای لێهات عەرەق لە کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا جۆگەلەی بەست..

بەڵێ.. هیچ کەسـێك نەیووت: خوومان بە عەرەق خواردنەوە گرتووە.. خۆ باوكو باپیرانمـان بەردەوام بوون لە عەرەق خواردنو لەوانەوە بۆمان ماوەتەوە، چۆن ئاوا بە زوویی دەستی لێهەڵگرینو وازی لێبێنین؟!

نەخێـر.. هەموو بە یەك دەنگ وتیان: ئەوا وازمان هێناو دەسـتمان هەڵگرت، ئەی پەروەردگار..

شەشەم: جێبەجێ کردنی هەموو سوننەتەکانی.. گاڵتە نەکردن بە هیچ سوننەتێکی پێغەمبەری خودا ﷺ، وەك جلوبەرگو شـێوەو شـێوازی ژیانی، چونکە گاڵتە کردن بە سـوننەتو ڕەوشـتو ڕەفتـاری پێغەمبەری خـودا ﷺ، هەروەها گاڵتـە کردن بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، نیشـانەی مرۆڤی دەروون نەخۆشو دووڕووە، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴿٦٦﴾ ﴾ التوبـة. واتـە: (کاتێك تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لە گوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت)و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بە ڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێو گەمەو گاڵتەمـان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا بـە خوداو ئایەتو فەرمانەکانـیو پێغەمبەرەکەی گاڵتەتـان دەکرد؟!* (ئیتر بێ سـوودە) پاکانە مەکەن، چونکە بە ڕاسـتی ئێوە بێباوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنا بوو...)..

# لە کۆتاییدا..

خوشکانو برایان..

ئەی ئوممەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان..

ئەی ئەوانەی خۆتان بە شوێنکەوتەی بەرنامەکەی ئەو پێغەمبەرە نازدارە دەزانن..

دڵنیابن کەم شـارەزایی موسڵمانانە، کەوا ئێستا سووکایەتی بە ئایینو پێغەمبەرەکەمان دەکرێت.. ئەو کەسـانەی کە سـووکایەتی بە ئایینو پێغەمبەرەکەمان دەکەن، هەر چەندە هەندێکیان لە رقو کینەدا ئەو کارانە ئەنجام دەدەن، بەڵام بە دڵنیاییەوە زۆرێکیان نەشارەزان بەرامبەر ئاینەکەمان.. زۆرێکیان پێغەمبەرە بەسۆزو میهرەبانەکەمانیان نەناسیووە..

ئـەو پێغەمبەرەی پەروەردگار دەربـارەی دەفەرموێت:﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة واتە: (ئەی خەڵکینە) سـوێند بە خودا بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ رەوانە کراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بە لایەوە تووش بوونتان بە بەڵاو ناخۆشی، زۆر بە تەنگیشـتانەوەیەو پەرۆشە لە سـەرتان، زۆر دڵسـۆزی ئیماندارانەو میهرەبانو دلۆڤانە بۆیان).. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأنبياء. واتە: (ئەی محمد ﷺ) تۆمان رەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە رەحمەتو بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزادو گیاندارو رووەكو پەریو..هتد)..

دەی بـا هەوڵ بدەین پێغەمبەرەکەمان ﷺ بە خەڵکانی جیهان بناسـێنین.. ئاکارو رەفتارو گوفتارەکانی بە خەڵکی ئاشـنا بکەین.. دەی با لە خۆمانەوە دەست پێبکەین.. فەرمانبـەرداری بینو بەخشـندە بینو ببەخشـین.. بە سـۆزو گوفتار شـیرین بین.. رەوێنەرەوەی تاریکی شەوە زەنگ بین.. بە راستی خۆشمان بووێت، چونکە پەروەردگار بە هۆی ئەو پەیامبەرە ئازیزەوە ﷺ لە تاریکیو گومراییو نەفامی رزگاری کردین..

پەروەردگار دەسـتی پارانەوەت لێ بەرز دەکەینەوەو داوات لێدەکەین کە بمانخەیتە بەر شـەفاعەتی ئەو پێغەمبەرە نازدارە ﷺ.. پەروەردگار داوات لێدەکەین، بە دەستی پێغەمبـەری ئازیز ﷺ لە ئاوی کەوسـەر تینوویەتیمان بشـکێنیو بـۆ هەتا هەتایە تینوویەتی روومان تێنەکاتەوە..

وصلى الله على رسولنا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين..



بەشێك لەنوسراوە زێڕینەكانی د. محەمەد عەریفی

# ئەوەیە شارژن



وەرگێڕانی

هێمن محەمەد عەلی



# ئەوەیە شاژن

★ لە بەریتانیا: خەریکی خوێندن بووم.. پیرێژنێک دراوسێمان بوو.. تەمەنی حەفتا ساڵێک دەبوو.. پشتی بە تەواوی چەما بۆوە، لە گەڵ ئەمانەشدا بە تەنها دەژیا.. ڕۆژێک هاوسەرەکەم بانگی کرد، بۆ ئەوەی میوانمان بێت...

★ لە ئەفەریقا: لە خێوەتگەی ئاوارەکان، بۆ بەیانیەکەی چووم بۆ لای بیرێک.. لە ناو لە ناویاندا، ئافرەتێکی سپی پێستی قژ زەرد گەنجم بینی...

★ خوشکی ئازیز: ئەو کەسانەی، کە باسی ماف و ئازادی ئافرەتان دەکەن، بۆ ڕۆژێک گوێمان لێ نەبوو، باسی ئافرەتە بێوەژنەکان بکەن؟! بۆ داوای مافی ئافرەتە نەخۆش و کەم ئەندامەکان ناکەن؟! بۆ داوا لە کورو کچە لاوەکان ناکەن، بۆ ئەوەی ڕێزی دایک و پورو نەنکەکانیان بگرن؟!

★ خوشکی ئازیز: مەڵێ زۆربەی ئافرەتان ئەو کارە قەدەغە کراوانە ئەنجام دەدەن!! دەی زۆرێک لە ئافرەتان بت دەپەرستن، تۆش ئامادەی بت بپەرستی؟! زۆرێکیان خاچ لە مل دەکەن، تۆ ڕازی دەبیت، وابکەیت؟!

★ خوشکی ئازیز: لە پێناوی تۆدا، کاسەی سەرمان داناو خوێنمان ڕشت، بۆ ئەوەی تۆی بەڕێز بە سەربەرزی بژیت..

★ ئەمانەو چەندان چیرۆک و ئامۆژگاری بەسوود، لە کتێبی (ئەوەیە شاژن) دا، بخوێنەرەوە..



د. محەمەد عەریفی
arefe@gawab.com

# پێشەكی

## بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

سوپاسو ستایش بۆ خودای پەروەردگار، درووودو ڕەحمەت بۆ سەر گیانی پاكی پێغەمبەری نازدار ﷺ.

نوسینو وەرگێڕانی پەرتووكی (ئەوەیە شاژن) لەو كاتو سەردەمەدا دێت، كە مافی ئافرەت بووەتە جێی قسەو باسی زۆرێك لە خەڵكیو ئاینی ئیسلام بەوە تۆمەتبار دەكرێت، كە پێشێلكاری مافەكانی ئافرەتەو هاندانو برەوی بیری باوك سالاری دەدات لە ناو كۆمەڵگادا.

لەو كاتەدا دێت كە جولەكەو دیانیو بیانییەكان، بە هاوكاری كۆمەڵێك بیر نەخۆشی بە ناو موسڵمان دەیانەوێت ڕووی زۆرێك لە ڕاستییەكان دابپۆشنو بشێوێننو بە ناوی ئازادیو مافی مرۆڤەوە هەموو شتە پیرۆزەكانو ڕەوشتە بەرزەكانو بەها باڵاكانو یاسا كۆمەڵایەتییەكانو سۆزو بەزەییو خۆشەویستی نێو تاكەكانو ڕەگەزەكان زیندە بە چاڵ بكەن.

لەو كاتەدا دێت كە خەڵكانێكی چەواشە كراوو دۆڕاو، دەیانەوێت كۆمەڵێك ئەزموونی شكستخواردووی كەسێتی خۆیان گشتگیر بكەن بەسەر كۆمەڵگاكەماندا،واقیعی تاڵو پڕ بەدبەختی خۆیان بكەنە تابلۆیەكی ترسناكو بە ناو هەموو ژوورێكی ماڵەكانماندا هەڵیبواسنو پاساوی شكستەكانیان بدەنە پاڵ ئاینی پیرۆزی ئیسلامو تۆمەتباری بكەن بەوەی كە مافی ئافرەت پێشێل دەكاتو بە چاوی كەم سەیری دەكاتو حیساب بۆویستو خواستەكانی ناكات.

گرنگیو بەنرخی ئەم پەرتووكەش خۆی لەوەدا دەبینێتەوە كە:

⋆ هەموو چیرۆكو ڕووداوەكانی ڕاستینو مێژووو ئەمرۆی ئافرەتانی باوەڕدار بەیەكەوە گرێ دەداتو دەیسەلمێنێت كە چیرۆكی ئاسیاو سومەییەو زەنیرە، بەسەرهاتێكی ئەفسانەییو مێژوویی نینو لە ڕۆژگاری ئەمرۆشدا هاوشێوەی باوەڕدارانی لەو جۆرە زۆرن.

⋆ ڕۆڵی ئافرەت لە تۆمار كردنو نوسینەوەی مێژووی پڕ سەروەری موسڵماناندا لە ڕۆڵی پیاو كەمتر نەبووەو یەكەم شەهیدی ڕێبازی خواناسی ئافرەت بووەو هەمیشە ئافرەتان لە هەموو بوارەكاندا شان بە شانی پیاو، ڕۆڵی خۆیان بینیوە.

★ هەریەك لە ڕووداوەكانی ئەم پەرتووكە، قوتابخانەیەكەو ماموٚستاكەی ئافرەتێكی باوەڕداره، تێیدا فێریوانەكانی دڵسوٚزیو باوەڕداریو ئارامگریو داوێنپاكیو گیانی بەرخودانو كوٚمەڵێك بەهای باڵای تر دەبین.

★ وەڵامێكی ڕاستەقینەیە بوٚ هەموو ئەو پڕوپاگەندانەی دژ بە ئاینی پیروٚزی ئیسلام دەكرێن، سەبارەت بە مافەكانی ئافرەتو چەوسانەوەیانو بەكەم سەیركردنیان، ئەگەر ئەمانە ڕاستن چوٚن قارەمانو پاڵەوانەكانی ئەم ڕووداوانە، كە هەموویان ئافرەتن تا دوا هەناسە بەرگرییان لە ئاینەكەیان كردووەو ئامادە بووون قوربانی بە خوٚیانو ماڵو منداڵو هەموو خوٚشییەكانی دونیا بدەن لە پێناو ئاینەكەیاندا، لە كاتێكدا ئەم ڕوووداوانە مشتێكن لە خەرمانی ڕووداوی لەم جوٚرە لە مێژووی ئیسلامدا.

★ بە بەراورد لە نێوان ڕووداوەكانی ئەم چیروٚكانەو ڕووداوی چیروٚكی ئافرەتانی بە ناو ئازادی شەوە سوورەكانو بە سەرهاتە پڕ نەهامەتیەكان، بوٚمان دەردەكەوێت كە مافی ئافرەت كێ دەیپارێزێو كێش بازرگانی پێوە دەكات.

★ لە كوٚتاییدا زوٚر دەست خوٚشی لە برای بەرێزم كاك (هێمن محمد شێخانی) دەكەم، كە ئەركیوەرگێڕانی ئەم پەرتووكەی گرتە ئەستوٚ، هیوای سەركەوتنو بەردەوامی بوٚ دەخوازمو خودا نموونەیان زوٚر بكات.

د. خالد محمد صالح
ماموٚستا لە كوٚلیجی یاسای زانكوٚی سلێمانی
٢٠٠٨/١١/٢٩



## سەرەتا

کچێکی ڕووسی بوو، لە خێزانێکی پارێزگار، بەڵام مەسیحی بوو، لایەنگریەکی توندو تیژی بۆ ئاینەکەی هەبوو، یەکێك لە بازرگانە ڕووسیەکان پێی ڕاگەیاند، کە هاوەڵییان بکات، لەگەڵ کۆمەڵە کچێکی تردا، بۆ ئەوەی بچن بۆ یەکێك لە لە دەوڵەتەکانی کەنداو، بۆ کرینی کەل‌و پەلی کارەبایی‌و فرۆشتنەوەی لە ڕووسیا، ئەمەش ئەو مەبەستە بوو، کە بازرگانەکەو ئەو کۆمەڵە ئافرەتە لە سەری ڕێك کەوتبوون..

کاتێك گەیشتنە ئەو وڵاتە، کابرای بازرگان ددانەکانی جیڕ کردەوەو کارێکی زۆر پیس‌و خراپی خستنە بەردەم..

سەرەتا بۆ ئەوەی لە خشتەیان بەرێت، ماڵ‌و سامان‌و پارەو پولێکی زۆری خستنە بەردەم، هەتا زۆربەیانی ڕازی کرد، تەنها ئەم ئافرەتە نەبێت.. ئەم ئافرەتە، لە ڕادەبەدەر پابەندی ئاینی مەسیحی بوو، بۆیە ڕێگری کردو بەم کارە قێزەونە ڕازی نەبوو.. بازرگانەکە پێی پێکەنی‌و وتی: تۆ لەم شارو وڵاتەدا بە تەنهای، جگە جل‌و بەرگەکانت هیچ شتێکت پێ نییەو منیش هیچ شتێکت نادەمێ..

بازرگانەکە هەموو ئافرەتەکانی لە شوقەیەکی نیشتەجێ کردندا داناو پاسپۆرتەکانیشی لە لای خۆی شاردەوە.. ئافرەتەکانی بۆ کاری بەدوخراپ ڕاپێچ کرد، بەڵام ئەم ئافرەتەیان سور بوو لە سەر پاك داوێنی‌و بەردەوام‌و جێگیر بوو.. ئافرەتەکە هەموو ڕۆژێك داوای لە بازرگانەکە دەکرد، کە پاسپۆرتەکەی بداتەوە، یان بیگێڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، بەڵام بازرگانەکە گوێی لە داواکارییەکانی نەدەگرت‌و بە گوێی نەدەکرد..

ڕۆژێك ئەم ئافرەتە لە شوقەکەدا گەڕا، هەتا پاسپۆرتەکەی دۆزیەوەو ڕای کرد، جل‌و بەرگەکانی نەبێت، خاوەن هیچ شتێکی تر نەبوو، بە نەشارەزایی ملی ڕێگەی گرت‌و نەیدەزانی بۆ کوێ بچێت..بێ کەس‌و کار.. کەس ناناسێت.. بێ پارە.. بە بێ خواردن.. بێ جێگەو ڕێگە.. بە سەر لێشێواوی‌و بە سەر سوڕمانەوە، ئاوڕی بە لای ڕاست‌و چەپیدا دەدایەوە..

لە پڕ گەنجێکی بینی لەگەڵ سێ ئافرەتدا، دەڕۆیشتن بە ڕێگەدا، بە بینینی دڵی ئارام بوو، چوو بۆ لای‌و بە زمانی ڕووسی دەستی کرد بە قسە کردن لەگەڵیدا.. گەنجەکە داوای لێبوردنی لێکرد، کە زمانی ڕووسی تێناگات.. ئافرەتەکە وتی: دەتوانن بە ئینگلیزی قسە بکەن؟ وتیان: بەڵێ، زۆر دڵخۆشبوو، دەستی کرد بە گریان‌و وتی: من

ئافرەتێکی رووسیم‌و چیرۆك‌و رووداوەکەم بەم شێوەیەیە.. هیچ پارەیەکم پێ نییە.. جێگەو شوێنم نییە.. ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم، تەنها ئەوەم لە ئێوە دەوێت، کە دوو یان سێ رۆژ پەنام بدەن، هەتا چارەسەرێك دەدۆزمەوەو کەس‌وکارم ئاگادار دەکەمەوە..

گەنجەکە ناوی خالید بوو، بیری کردەوەو لە دڵی خۆیداوتی: لەوانەیە فێڵ بێت!!
کچەکەش سەیری دەکردو هەر دەگریاو خالیدیش راوێژو گفتوگۆی لەگەڵ دایك‌و دوو خوشکەکەی دەکرد.. لە کۆتاییدا بردیانەوە بۆ ماڵەوەو پەیوەندیان کرد بە ژمارە تەلەفۆنی کەس‌و کاریەوە، بەڵام وەڵام نەبوو! هێڵەکانی تەلەفۆن لەو شارەدا لە کارکەوتبوون‌و هەموو کاتژمێرێکیش پەیوەندیەکەیان دووبارە دەکردەوە..

پاشان زانییان کە ئەم ئافرەتە مەسیحییە، زۆر نەرمونیان بوون لە گەڵیداو ئافرەتەکەش ئەمانی زۆر خۆش دەویست، ئیسلامیان خستە پێش چاوی، بەڵام رەتی کردەوەو وتی: بە هیچ شێوەیەك نامەوێت لە بارەی ئاینەوە گفتوگۆم لەگەڵدا بکەن، لەبەرئەوەی لە خێزانێکی مەسیحیدا ژیا بوو، رقی لە ئیسلام‌و موسڵمانانیش بوو..

خالید چوو بۆ (ناوەندی ئیسلامی بۆبانگەواز) و کتێبێکی بە زمانی رووسی دەربارەی ئیسلام بۆ هێنا، ئافرەتەکە کتێبەکەی خوێندەوەو کاریگەری لە سەر بەجێهێشت..

رۆژەکان تێدەپەڕین، هەوڵیاندا بۆ ئەوەی موسڵمان بێت‌و ئەویش رازی بوو.. هەر لە سەرەتاوە گرنگی بە فێربوونی ئاینە تازەکەی ئەدا، سور بوو لەسەر ئەوەی، کە لە کۆڕو کۆمەڵی ئافرەتانی چاکەکاردا دابنیشێت، لە گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی دەترسا، لەبەرئەوەی نەوەکو بگەڕێتەوە بۆ سەر ئاینی مەسیحی..

## هاوسەرگیری..

خالید لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا ژیانی هاوسەری پێك هێنا، ئەم ئافرەتە لە زۆربەی ئافرەتانی موسڵمان زیاتر پابەندبوو بە ئیسلامەوە، لە دوای موسڵمان بوونی.. رۆژێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا چوو بۆ بازار، ئافرەتێکی باڵاپۆشی بینی، بە بینینی ئەم شێوە جل‌وبەرگە توشی سەرسورمان هات!!

هەر بۆیە وتی: خالید ئەم ئافرەتە بۆچی بەم شێوەیەیە؟! لەوانەیە دەم‌وچاوی توشی نەخۆشییەك بوو بێت، بۆیە رووخساری داپۆشیوە!!

خالیدوتی: نەخێر، ئەم ئافرەتە بەو شێوەیە خۆی داپۆشیوە، کە خودای گەورە بۆ

ئافرەتانی موسڵمانی دیاری کردووەو پێی ڕازیەو پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمانی پێکردووە..

ئافرەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: بەڵێ، بەڕاستی ئەومیە باڵاپۆشی ڕاستەقینە، ئەو باڵاپۆشییەی خودای گەورە لە ئێمەی دەوێت..

خالید پێی وت: تۆ چۆن دەزانیت؟!

ئافرەتەکە وتی: کاتێك من دەچم بۆ هەر پێشانگاو بازارێك، خاوەن دوکانو پێشانگاکان چاویان لە سەر ڕووخسارم لانابەنو خەریکە ڕووخسارم پارچە پارچە دەبێت بەو تەماشاکردنانە! کەواتە بێگومان دەبێت ڕووخسارم داپۆشراو بێتو تەنها هاوسەرەکەم ڕووخسارم ببینێت، لەم بازاڕەش دەرناچم بەو شێوە باڵاپۆشیە نەبێت، لە کوێ بیکرین؟

خالید پێی وت: لە سەر ئەم باڵاپۆشییە بەردەوام بە، هەروەك دایكو خوشکەکانم..

ئافرەتەکە وتی: نەخێر، ئەو باڵاپۆشییەم دەوێت کە خودای گەورە داوامان لێدەکات..

ڕۆژەکان بە سەر ئەم ئافرەتەدا تێدەپەڕینو باوەڕی ئەم ئافرەتە زیادی دەکردو لە لای دەوروبەریشی خۆشەویست دەبوو، هەروەها دڵو دەروونو هەستی مێردەکەی داگیر کرد، لە یەکێك لە ڕۆژەکاندا سەیری پاسپۆرتەکەی کردو بۆی دەرکەوت کۆتایی هاتنی نزیك بوومتەوەو دەبێت تازەی بکاتەوە، لەوەش نارەحەت تر ئەومیە، کە ئەبێت ئەو تازەکردنەومیە لەو شارە بێت کە کەس‌وکاری ئافرەتەکەی لێیە، کەواتە بێگومان دەبێت سەفەر بکات بۆ ڕووسیا، ئەگەر نا ماوەی مانەوەی لەم وڵاتەدا بە نایاسایی دادەنرێت..

خالید بڕیاریدا لەگەڵیدا سەفەر بکات، لەبەرئەوەی ئافرەتەکە نەیدەویست بە بێ هاوسەرەکەی، یاخود بە بێ مەحرەم سەفەر بکات..

سواری فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی ڕووسی بوونو ئافرەتەکەش بە باڵاپۆشییەکی تەواوەوە، لە تەنیشت هاوسەرەکەیەوە بەوپەڕی شانازیو سەربەرزییەوە دانیشت. خالیدی هاوسەری پێی وت: دەترسم بە هۆی ئەم جلوبەرگەتەوە توشی کێشەو گرفت بین!! ئافرەتەکەش وتی: پاك‌وبێگەردی بۆ خودا!! دەتەوێت ملکەچی ئەو بێباوەڕانە بمو لە خودای گەورە یاخی بم؟! نا.. سوێند بە خودا.. چییان پێخۆشە با بیڵێن..

سەرەتای سەیرکردنو سەرنجدانی کەسانی ناو فڕۆکەکە، بۆ ئافرەتەکە دەستی

پێکرد.. خزمەتگوزارەکانی فڕۆکەکە دەستیان کرد بە دابەشکردنی خواردن، لەگەڵ خواردنەکەشدا عەرەق هەبوو، خواردنەوەی عەرەقیش کار دەکاتە سەر مێشك و عەقڵ، هەر بۆیە لێرەو لەوێ دەستیان کرد بە قسەی ناشیرین و توانج گرتن لە ئافرەتەکە.. یەکێك پێدەکەنی.. یەکێکی تر گاڵتەی پێدەکرد.. یەکێکی تر لە تەنیشتییەوە دەوەستا..

خالید سەیری دەکردن و لە هیچ تێ نەدەگەیشت، بەڵام ئافرەتەکە بە ڕوویەکی خۆشەوە پێدەکەنی و ئەو قسانەی بۆ هاوسەرەکەی وەردەگێڕا.. خالید تووڕە بوو، ئافرەتەکەش پێی وت: نا.. نا.. خەمبار مەبە.. ئەمە شتێکی زۆر ئاسان و ئاساییە لە بەرامبەر ئەو شتانەدا کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تووشیان هات، هەروەها لە چاو ئەو هەموو کارانەی کە بەرامبەر پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان دەکرا، لە نارەحەتی و سزاو ئازارو تاقیکردنەوە، بە هەرشێوەیەك بێت ئافرەتەکەو خالید ئارامیان گرت، هەتا فڕۆکەکە گەیشتە جێگەی خۆی..

## لە ڕووسیا..

خالیدوتی: کاتێك لە فڕۆکەخانە دابەزین، گومانم وابوو سەرەتا دەچین بۆ ماڵی کەس و کاری هاوسەرەکەم و لەلای ئەوان نیشتەجێ دەبین و پاشان کارەکانمان تەواو دەکەین و دەگەڕێینەوە، بەڵام تێڕوانینی هاوسەرەکەم لە بۆچوونی منەوە دوور بوو..

وتی: کەس وکارم زۆرباپەندن بە ئاینەکەیانەوە، ئێستا نامەوێت بڕۆین بۆ ئەوێ! ژوورێك بە کرێ دەگرین و تیایدا دەمێنینەوەو کارەکانمان تەواو دەکەین و لە پێش گەڕانەوەشماندا سەردانی کەس وکارم دەکەین.. بۆچوونەکەی زۆر چاك بوو، ژوورێکمان بە کرێ گرت و تیایدا ماینەوە..

بۆ بەیانی چووین بۆ فەرمانگەی پاسپۆرت و مانەوە، چووینە لای فەرمانبەرێك و داوای پاسپۆرتە کۆنەکەو وێنەی ئافرەتەکەی کرد، هاوسەرەکەم وێنەی ڕەش وسپی بۆ دەرهێنا، کە تەنها ڕووخساری دیار بوو.. فەرمانبەرەکە وتی: ئەم وێنانە نایاساین.. وێنەی ڕەنگاوڕەنگمان دەوێت و دەبێت بە تەواوی ڕووخسارو سەروقژو گەردنتی هەمووی تێدا دەرکەوێت!! ئافرەتەکە ڕێگری کرد، جگە لەو وێنانە هیچ وێنەیەکی تری بداتێ..

چووین بۆ لای فەرمانبەری دووەم و پاشان بۆ لای سێیەم و... هەموویان هەمان

داواکارییان هەبوو، کە دەبێت وێنەکان ئەو مەرجانەی تێدا بێت... هاوسەرەکەم وتی: هەرگیز وێنەی بەو شێوەیەیان نادەمێ، فەرمانبەرەکانیش داواکەیان لێوەرنەگرتین، ئێمەش داواکارییەکەمان ئاراستەی بەڕێوەبەراتییەکە کرد. هاوسەرەکەم زۆر هەوڵیدا ڕازیان بکات، بەڵام ڕازی نەبوون، هاوسەرەکەم زۆر پێداگری دەکردو دەیوت: ئایا ئێوە وێنەی ڕاستەقینەی من نابینن؟! بەراوردی بکەن لەگەڵ ئەو وێنانەدا کە لە لاتانە، گرنگ شێوەی رووخسارە، سەروقژ گۆڕانکارییان بە سەردا دێت، ئەم وێنانە بەسن بۆ ئەم کارە.. بەڕێوەبەر سور بوو لە سەر ئەوەی یاسا ڕێگە بەم شێوە وێنانە نادات... هاوسەرەکەم وتی: من لەم وێنانە زیاتر هیچ وێنەیەکی تر ئامادە ناکەم، چارەسەر چییە؟! بەڕێوەبەرەکە وتی: ئەم کێشەیە چارەسەر ناکرێت، تەنها لە لای بەڕێوەبەری گەورەی پاسپۆرت نەبێت لە (مۆسکۆ)..

لە فەرمانگەکە هاتینە دەرەوە، هاوسەرەکەم لای کردەوە بە لامداو وتی: خالید دەچین بۆ (مۆسکۆ).. پێم وت: ئەو وێنانەیان بۆ ئامادە بکە کە دەیانەوێت، خودای گەورە بە پێی توانا داوا لە بەندەکانی دەکات، هەروەك دەفەرموێت﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ البقرة/٢٨٦ واتە: (خودای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك مەگەر بە قەدەر توانای خۆی نەبێت...)..

هەروەها دەفەرموێت﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾التغابن/١٦ واتە: (خۆپارێزبن و بەندایەتیو تەقواو عیبادەت ئەنجام بدەن بۆ خودای پەروەردگار، بە پێی توانای خۆتان...).. ئەم کارەی تۆش لە بەر پێویستیو زەرورەتە، وێنەی پاسپۆرتیش تەنها چەند کەسێك دەیبینن و پاشان لە ماڵەوە دای دەنێین و دەیشارینەوە، هەتا کاتەکەی تەواو دەبێت،واز لەو کێشەو گرفتە بێنەو پێویست ناکات بچین بۆ (مۆسکۆ)...وتی: نا.. نابێت.. بە بێ باڵاپۆشی ببینرێم.. دوای ئەوەی کە ئاینی خودای پەروەردگارم ناسی..

## لە مۆسکۆ..

چووین بۆ (مۆسکۆ) ژوورێکمان گرتو تیایدا نیشتەجێ بووین، بۆ بەیانی چووین بۆ فەرمانگەی پاسپۆرت، پاشان چووین بۆ لای فەرمانبەری یەکەمو دووەمو سێ یەمو ... ناچار چووین بۆ لای بەڕێوەبەری سەرەکی، کەسێکی زۆر پیسو چەپەڵ بوو، کاتێك پاسپۆرتەکەی بینیو سەیری وێنەکەی کرد، سەری بەرزکردەوە بۆ لای هاوسەرەکەمو وتی: کێ بۆم ئەسەلمێنێ کە تۆ خاوەن ئەم وێنەیەی؟؟ دەیویست ڕوخساری بۆ دەربخاتو

بیبینیّ..

هاوسەرەکەم پێی‌وت: بە یەکێك لە فەرمانبەرە ئافرەتەکان، یان بە سکرتێرەکەت بڵێ با بێت‌و رووخسارو سەروقژمی بۆ دەردەخەم، با بەراوردی بکات لەگەڵ وێنەکەدا، بەڵام دەریناخەم بۆ تۆ... بەڕێوەبەرەکە توورە بوو، پاسپۆرتە کۆنەکەو وێنەو داواکارییەکانی بە سەر یەکدا داو فڕێیدایە سەر رەفە تایبەتەکەی خۆی‌و بە هاوسەرەکەمی وت: نە پاسپۆرتی کۆن، نە پاسپۆرتی تازەت نابێت، تەنها دوای ئەوە نەبێت، وێنەکان بێنیت‌و بە تەواوی هاوشێوەی وێنەی پاسپۆرتە کۆنەکەت بێت..

هاوسەرەکەم دەستی کرد بە قسەو زۆر هەوڵیدا رازی بکات، بە زمانی رووسی قسەیان دەکردو منیش تەنها سەیرم دەکردن‌و هیچ تێ نەدەگەیشتم، بەڵام توورە بووم‌و نەشم دەتوانی هیچ شتێك بکەم..

پیاوەکە هەر دووبارەی دەکردەوەو دەیوت: دەبێت بە پێی ئەو مەرجانەی کە هەیەوێنەکان ئامادە بکەیت... هاوسەرە هەژارەکەشم هەر هەوڵی دەدا رازی بکات، بەڵام سودی نەبوو، بە بێ دەنگی وەستا بوو، لام کردەوە بە لایداو دووبارە پێم وت: ئازیزەکەم، خودای گەورە بە پێی توانا داوا لە بەندەکانی خۆی دەکات، ئێمە ئێستا ناچارو زەرورین، هەتاکەی لێرە بمێنینەوە؟!

وتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ★ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ﴾ الطلاق/٢-٣ واتە: (ئەوەی لە خودا بترسێت‌و پارێزکار بێت ئەوە خودا دەروی لێدەکاتەوەوە★ لە شوێنێکەوە رزق‌و رۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکرد بێت‌و خۆی پێی نەزانێت...)..

گفتوگۆی نێوانمان زیادی کرد، بەڕێوەبەر توورە بوو، هەردوکمانی کردە دەرەوە، من لە نێوان دوو شتدا بووم، توورە بوونم لێی، هەروەها بەزەیی هاتنەوەم پیایدا.. رۆشتینەوە بۆ ژوورەکەمان، بۆ ئەوەی باسێکی ئەم کێشەیە بکەین، زۆر هەوڵمدا قەناعەتی پێ بهێنم، ئەویش هەوڵی دەدا قەناعەت بە من بکات، هەتا کاتێك کە شەو داهات‌و نوێژی عیشامان کرد، من هەر لە داڵغەو خەیاڵی ئەم کێشەیەدا بووم، پاشان شتێکمان خواردو ویستم بخەوم..



## چۆن دەخەویت..؟!

کاتێك بەم شێوەیە بینیمی، ڕەنگو ڕووخساری گۆڕاو لای کردەوە بە لامداو وتی: خالید.. دەخەویت؟!

وتم: بەڵێ.. ئایا هەست بە ماندوێتی ناکەی؟!

وتی: پاکیو بێگەردی بۆ خودا.. لەم کاتە نارەحەتەدا دەخەویت؟! ئێمە لە کاتو ساتێکی وادا دەژین، کە پێویستمان بەوەیە پەنا بۆ خودا بەرینو لێی بپارێینەوە، هەستە پەنا بۆ خودا بەرەو لێی بپارێرەوە، ئێستا کاتی ئەوەیە پەنا بۆ خودا بەرین..

هەستامو چەندێك خودای گەورەویستی لە سەر بوو نوێژم کردو پاشان خەوتم، بەڵام هاوسەرەکەم هەر نوێژی دەکرد.. هەر نوێژی دەکرد.. هەر کاتێك خەبەرم دەبۆوە، سەیرم دەکرد، یان لە کڕنووشدا بوو، یان دەپاڕایەوە، یان دەگریا، هەتا بەرەبەیان...

پاشان هەڵیساندمو وتی: کاتی بەیانەو هەستە زوو نوێژەکەت بکە، هەستام، دەست نوێژم گرتو نوێژم کرد، پاشان کەمێك خەوتمەوە..پاش ئەوەی خۆرهەڵهات، هەستاو وتی: بابڕۆین بۆ فەرمانگەی پاسپۆرت!!

وتم بچین بۆ فەرمانگەی پاسپۆرت؟! ئەی وێنەکان؟! خۆ وێنەمان پێ نییە!!

وتی: بابچینو هەوڵ دەدەین.. لە بەزەیی خودا بێ هیوا مەبە..

ڕۆیشتین بۆ فەرمانگەی پاسپۆرتو بەهۆی باڵاپۆشیەکەیەوە، هاوسەرەکەمیان ناسیەوەو یەکێك لە فەرمانبەرەکان بانگی کردو وتی: تۆ فلانە کەسی؟وتی: بەڵێ!

وتی: پاسپۆرتەکەت بگرەو تەواو بووەووێنەی باڵاپۆشیەکەشتی لەسەرە!! بە ڕووخۆشیەوە ئاوڕی بۆ لای من دایەوەو وتی: ئەی پێم نەوتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ الطلاق/٢ واتە: (ئەوەی لە خودای گەورە بترسێتو تەقوای هەبێت، خودا دەروی خێری لێدەکاتەوە)..

کاتێك ویستمان بڕۆین، فەرمانبەرەکە وتی: پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ئەو شارەی کە لێوەی هاتوون، بۆ ئەوەی پاسپۆرتەکەتان بۆ مۆر بکەن.. گەراینەوە بۆ شارەکەی یەکەمجار، لە دڵی خۆمدا دەموت: ئەمە هەلێکە بۆ ئەوەی پێش گەڕانەوەمان سەردانی کەسوکاری هاوسەرەکەم بکەم، گەیشتینەوە ئەو شارەو ژوورێکمان بە کرێ گرتو پاسپۆرتەکەشمان مۆر کرد..

## گەشتی پڕ ئێش و ئازار..

پاشان ڕۆیشتین بۆ سەردانی کەس‌وکاری هاوسەرەکەم‌و لە دەرگاماندا، خانووەکەیان کۆن‌و ئاسایی بوو.. هەژاری بە دانیشتووانەکەیەوە دەبینرا..

برا گەورەکەی دەرگاکەی کردەوەو گەنجێکی بەهێز دیار بوو.. هاوسەرەکەم بە بینینی برا گەورەکەی زۆر دڵخۆشبوو.. ڕووخساری بە دەرخست‌و زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی.. بەڵام براکەی لە یەکەم بینینیدا ڕەنگی گۆڕاو کەوتە نێوان دوو حاڵەتەوە، دڵخۆش بوون بەوەی کە خوشکەکەی بە سەلامەتی گەڕاوەتەوە، هەروەها سەرسوڕمانی بەو جل‌وبەرگە ڕەشانەی کە هەموو لاشەی خوشکەکەی داپۆشی بوو..

هاوسەرەکەم بە دڵخۆشییەوە چووە ژوورەوەو دەستی کردە ملی براکەی‌و منیش بە شوێنیدا چوومە ژوورەوەو لە هۆڵەکە دانیشتم، بەڵام هاوسەرەکەم چووە ژوورەوە، گوێم لێ بوو بە زمانی ڕووسی قسەیان لەگەڵ دەکرد، بەڵام هیچ تێ نەدەگەیشتم، تێبینی ئەوەم کرد بەرەبەرە دەنگی قسەکان بەرز دەبوونەوە!! هاوارو دەنگە دەنگ زیادیان دەکرد!! هەموویان هاواریان دەکرد بە سەریداو ئەویش هەر بەرگری دەکرد، هەستم کرد حاڵەتەکە بەرەو شەڕو ناخۆشی دەچێت، بەڵام بە تەواوی نەمدەتوانی بزانم چییە، چونکە من لە هیچ شتێك حاڵی نەدەبووم‌و بە تەنها دانیشتبووم..

لە پڕ گوێم لێبوو، دەنگەکان لێم نزیك دەبوونەوە، سێ گەنج هاتن‌و پیاوێکی بە تەمەنیش لە پێشیانەوە بوو، هاتنە ژوورەوە بۆ لام‌و سەرەتا وام زانی پێشوازیم لێدەکەن، پێشوازی لە هاوسەری کچەکەیان!! بەڵام هەروەکو ئاژەڵی کێوی هێرشیان بۆ هێنام‌و بە بۆکس‌و لێدان بەربوونە گیانم، دەستم کرد بە بەرگری کردن لە خۆم‌و هاوارم دەکردو داوای یارمەتیم دەکرد، هەتا هێزم لە بەربڕاو گومانم وابوو لەم ماڵەدا کۆتایی بە ژیانم دێت، لێدانەکانیان زیادی کرد، منیش سەیری ئەملاولای خۆم دەکرد، هەوڵمدا بیرم بکەوێتەوە ئەو دەرگایە لە کوێوەیە، کەلێی هاتمە ژوورەوە، بۆ ئەوەی ڕابکەم، کاتێك دەرگاکەم بینی، بە پەلە هەستام‌و دەرگاکەم کردەوەو ڕام کرد، ئەوانیش بەدوامەوە بوون، خۆم کرد بە نێوان خەڵکیدا، هەتا لە چاویان‌ون بووم، پاشان ڕۆیشتمەوە بۆ ژوورەکەم، کە زۆر دوور نەبوو، خوێنی دەم‌و چاوو ڕووخسارم شۆری، سەیری خۆمم کرد، شوێنەواری لێدان بە نێوچەوان‌و ڕوومەت‌و لوتمەوە دیاربوو..

خوێن لە دەمم‌و لوتم دەڕۆی.. جل‌وبەرگەکانم هەموو درابوون.. سوپاسی خودام دەکرد، کە ڕزگاری کردم لە دەستی ئەو دڕندانە، بەڵام لە دڵی خۆمدا وتم: من ڕزگارم

بوو، ئەی دەبێت حاڵی هاوسەرەکەم چۆن بێت؟! وێنەی ڕووخساری هەر لە بەر چاوم بوو، ئایا توشی هەمان لێدانو نارەحەتیو سزاو ئازاری من دەبێتەوە؟! من پیاویش بووم، توانای ئارام گرتنم نەبوو، خۆ ئەو ئافرەتە، ئایا دەتوانێت ئارام بگرێت؟! زۆر لە هەرەس هێنانو لە ناوچوونی دەترسام..

## ئایا کاتی جیابوونەوەیە..؟!

شەیتان دەستی بە کارەکانی کردو وەسوەسەی دەخستە دڵمەوەو پێی دەوتم: خێزانەکەت لە ئاینەکەی پاشگەز دەکەنەوەو دەبێتە وە بە مەسیحی، تۆش بە تەنها دەگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەت!! چی دەکەیت لەم وڵاتە؟! بۆ کوێ دەچیت؟! چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت؟! لێرە مرۆڤ زۆر بێ نرخە، دەتوانی کەسێك بە دە دۆلار بە کرێ بگریو کەسانی تری پێ بکوژی.. چۆنە ئەگەر زۆر ئازاری هاوسەرەکەتیانداو ئەویش شوێنەکەتیان پیشان بداتو لە تاریکی شەودا کەسێك بنێرن بۆ کوشتنت؟!

دەرگای ژوورەکەم لە سەر خۆم داخستو هەتا بەیانی بە ترسو لەرزەوە مامەوە، پاشان جلو بەرگەکانم گۆڕیو ڕۆیشتم بۆ ئەوەی هەواڵێك بزانم.. لە دوورەوە سەیریماڵەکەیانم کردو چاودێری دەرگاکەم دەکرد، سێ گەنجو پیاوێك هاتنە دەرەوە، ئەو گەنجانە بوون کە لێیاندام، وادەردەکەوت بەرەو لای ئیشو کارەکانیان بڕۆن، دەرگاکەیان داخست، منیش هەر چاودێریم دەکرد، ئاواتە خواز بووم ڕووخساری خێزانەکەم ببینم، بەڵام بێ سوود بوو..

چەندان کاتژمێر بەم شێوەیە مامەوە.. هەتا ئەو کاتەی پیاوەکان لە کارەکانیان گەڕانەوەو چوونە ژوورەوە، زۆر هیلاكو ماندوو بووم، ڕۆیشتمەوە بۆ ژوورەکەم..

بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆیشتمەوە بۆ چاودێری کردنی ماڵەکە، هاوسەرەکەم نەبینی، ڕۆژی سێیەمیش بە هەمان شێوە.. بێ هیوا بووم لە ژیانی هاوسەرەکەم، پێشبینی ئەوەم دەکرد لە ژێر سزاو ئازاردا گیانی سپارد بێت، یان کوشتبێتیان.. ئەگەروایە، خۆ دەبێت قەرەباڵغیو جوڵەیەك لەو ماڵەدا دروست بووایە!! یان کەسانێك بۆ سەردانو سەرەخۆشی بهاتنایە!! بەڵام هیچ شتێکی نامۆم نەبینی، قەناعەتم بە دەروونی خۆم کرد، کە خێزانەکەم لە ژیاندا ماوەو بەم زووانە بە یەکتر شاد دەبینەوە..

## بەیەکگەیشتنەوە..

لە ڕۆژی چوارەمدا، نەمدەتوانی لە ژوورەکەم ئارام بگرمو دانیشم، ڕۆیشتم بۆ ئەوەی لە دوورەوە چاودێری ماڵەکە بکەم، بە هەمان شێوە گەنجەکانو باوکیان ڕۆیشتن بۆ سەر کارەکانیان، من هەر سەیرم دەکردو خۆزگەم بە دیداری دەخواست..

کاتێك لە پڕ دەرگاکە کرایەوە، ڕوخساری خێزانەکەم لە پشت دەرگاکەوە دەرکەوت، بە لای ڕاستو چەپدا ئاوڕی دەدایەوە، سەیری ڕوخساریم کرد، بازنەی سورو جێگەی شین بوونەوەی پێوە دیار بوو، لە بەر زۆری لێدانو سزا جلوبەرگەکانی لە خوێن هەڵکێشرا بوون، بە بینینی ئەو شێوازە ترس دایگرتم!

بە خێرایی لێی نزیك بوومەوەو زۆر سەیریم کرد، برینەکانی دەموچاوی خوێنیان لێ دەڕۆی، دەستو قاچەکانیشی بە هەمان شێوە... جلو بەرگەکانی هەموو دڕابوون، هیچی لەبەردا نەمابوو، تەنها پارچەیەکی کەم نەبێت، کە خۆی پێ داپۆشی بوو، قاچەکانی بە زنجیر بەسترابوونەوە! دەستەکانیشی بە هەمان شێوە بە زنجیرو لە پشتیەوە بەسترابوونەوە! کاتێك بینیم دەستم کرد بە گریانو نەم توانی خۆم ڕابگرمو هەر لە دوورەوە بانگم کرد..

## خۆڕاگریو ڕاسپاردە..

بە دەم ئازارو نارەحەتییەوە پێی وتم: دڵگرانی من مەبە، چونکە من هەر لە سەر پەیمانەکەم جێگیرو بەردەوامم، سوێند بەو خودایەی کە جگە لەو خودایەکی ڕاستەقینەی تر نییە، ئەوەی ئێستا تووشی بووم، ناگاتە ئازارو نارەحەتی تاڵە موویەکی هاوەڵانو شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ، خالید تکات لێدەکەم مەیەرە نێوان منو کەسو کارمەوەو هەر ئێستا زۆر بە پەلە بڕۆو لە ژوورەکەتدا چاوەڕێم بکە، هەتا ئەو کاتەی بە ویستی خودا دێم بۆ لات، بەڵام تکایە زۆر لە خودا بپاڕێرەوە.. زۆر شەونوێژیش بکە..

منیش لە لای ڕۆیشتمو جێم هێشت، زۆر نارەحەت بووم بۆی، ڕۆژێکی تەواو لە ژوورەکەمدا مامەوەو هەر چاوەڕێی بووم، هیوا خوازبووم دەرکەوێت، بە هەمان شێوەی ڕۆژی یەکەم، ڕۆژی دووەمیش تێپەڕیو هەروەها ڕۆژی سێیەمیش هەتا ڕۆژئاوا بوو هەر چاوەڕوان بووم، کاتێك لە پڕ لە دەرگای ژوورەکەمیاندا! زۆر ترسام! کێیە؟! کێ لە دەرگا دەدات؟! بەم نیوە شەوە کێیە؟! لەوانەیە کەسو کارەکەی بە جێگەکەمیان

زانی بێت، لەوانەشە هاوسەرەکەم دانی نابێت بە هەموو شتێکداو بۆ کوشتنم هاتبێتن، ترسی مردن دایگرتم.. شتێکی زۆر کەم لە نێوان منو مەرگدا مابوو.. وتم: کێیە لە دەرگا دەدات؟!

گوێم لە دەنگی هاوسەرەکەم بوو بە ئارامییەوە وەڵامی دامەوەو وتی: دەرگاکە بکەرەوە، من فلانەکەسم، گلۆپی ژوورەکەم هەڵکردو دەرگاکەم کردەوە، هاتە ژوورەوە، بەڵام جلوبەرگەکانی هەموو لەبەردا درابوون.. جەستەی بریندارو شەکەت بوو..

زۆر بە خێرایی پێی وتم: هەر ئێستا با بڕۆین! وتم بەم حاڵەی تۆوە؟!وتی: بەڵێ.. بە خێرایی جلوبەرگەکانمی کۆکردەوەو خستیە ناو جانتاکەیەوە، جلوبەرگەکانی خۆشی گۆڕیو جلوبەرگی تری لەبەرکردو سواری سەیارەیەکی کرێ بووینو هاوسەرەکەم بە جەستەی پڕ ئازارو برینو بە برسێتی لە سەر کوشنی سەیارەکە دانیشت..

## بۆ فرۆکەخانە..

هەر کە سواربووین بە شۆفێری سەیارەکەم وت: بمان بە بۆ فرۆکەخانە.. من هەندێك وشەی ڕووسی فێر ببووم، خێزانەکەم وتی: نا.. ناچین بۆ فرۆکەخانە، بەڵکو ئەچین بۆ فلانە لادێ!وتم: بۆچی؟! ئێمە نامانەوێت ڕابکەین؟! وتی: ڕاستە، بەڵام کاتێك کەسوکارم بۆیان دەردەکەوێت، کە ڕامان کردووە دێن بۆ فرۆکەخانەو بە دواماندا دەگەڕێن، لەبەرئەوە دەچین بۆ ئەو لادێیە..

کاتێك گەیشتینە ئەو لادێیە، دابەزینو سواری سەیارەیەکی تر بووین بۆ لادێیەکی تر، پاشانیش چووین بۆ لادێی سێیەم، پاشان چووین بۆ شارێك لەو شارانەی کە فرۆکەخانەی نێودەوڵەتیان تێدا بوو، کاتێك گەیشتینە فرۆکەخانە، کاتی گەڕانەوەمان دیاری کرد، بەڵام بەهۆی ئەوەی گەشتەکە دوا دەکەوت، ژوورێکمان بەکرێ گرت، لە ژوورەکەدا جێگیر بووینو هەستمان بە ئارامی کرد، خێزانەکەم عاباکەی لابردو سەیریم کرد، ئەی خودایە!! تەنیا شوێنێکی نەبوو، کە خوێنی پێوە نەبێت!! پێستی جەستەی هەموو بریندارببوو.. خوێن!!! سەرو قژی بڕابوو... لێوەکانیشی شین هەڵگەڕابوون..

## چیرۆکی ترس..

پرسیارم لێی کرد، لە دوای من چی ڕوویدا؟

وتی: کاتێك بەیەکەوە چووینە ژوورەوەو لەگەڵ کەس‌وکارمدا دانیشتم، پێیان وتم: ئەم جل‌وبەرگانە چین لەبەرتدا؟ وتم: ئەوە جل‌و بەرگی ئیسلامە، وتیان ئەی ئەو پیاوە کێیە لەگەڵتدا؟! وتم: ئەوە هاوسەرمە، من موسڵمان بووم‌و شووم بەو پیاوە موسڵمانە کردووە.. وتیان: ئەمە ناگونجێت‌و نابێت!! وتم: گوێ بگرن، سەرەتا گوێ لە چیرۆکەکەم بگرن، چیرۆك‌و ڕووداوی خۆم بۆ گێڕانەوە، کە ئەو پیاوە ڕووسییە چۆن‌ویستویەتی کاری خراپیان پێ ئەنجام بدات‌و چۆن توانیوویەتی ڕابکات‌و پاشان ئەم پیاوەی بینیووە..

پاشان وتیان: ئەگەر ڕێگەی خراپەو لەش فرۆشیت بگرتایەتە بەر، زۆر لەوەمان پێخۆشتر بووکە ئاوا بە موسڵمانی بێیتەوەو بتبینین، پاشان وتیان: لەم ماڵە ناچیتە دەرەوە تەنها بە مەسیحیەتی نەبێت، یان بە لاشەیەکی بێ گیان!! لەو کاتەدا گرتمیان‌و بەستمیانەوە..پاشان هاتن بۆ لای تۆو دەستیان کرد بە لێدانت، کاتێك لێیان ئەدایت گوێم لێت بوو هاوارت دەکرد، بەڵام منیش بەسترابوومەوەو هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو.. کاتێکیش تۆ ڕات کرد، براکانم گەڕانەوە بۆ لام‌و دەستیان کرد بە جنێوو قسەی ناشیرین پێم..

پاشان ڕۆیشتن زنجیریان کرێ‌و منیان پێوە بەستەوەو دەستیان کرد بە لێدانم‌و بە قامچی زۆر بە هێزو ئازاردەر لێیان ئەدام.. هەموو ڕۆژێك لە دوای عەسرەوە لێدان‌و ئازارو سزا دەستی پێدەکرد، هەتا کاتی خەوتن، بەڵام لە بەیانیاندا باوکم‌و براکانم دەچوون بۆ سەر کارەکانیان‌و دایکیشم لە ماڵ دەمایەوە لەگەڵ خوشکێکی بچوکمدا، کە تەمەنی پانزە ساڵان بوو، خوشکە بچوکەکەم دەهات بۆ لام‌و پێم پێدەکەنی، ئەمە کاتی حەوانەوەو پشوودانم بوو، هەتا بە بێ هۆشی خەوم لێدەکەوت، تەنها داواکاریشیان ئەوە بوو، کەواز لە ئیسلام بهێنم، بەڵام من بەرپەرچم دەدانەوەو ئارامم دەگرت.. دوای ئەوە خوشکە بچوکەکەم پرسیاری لێدەکردم کە بۆچی وازت لە ئاینەکەی خۆت هێناوە؟! ئاینی دایکت! ئاینی باوکت! ئاینی باووباپیرانت..

## خودا دەرووی لێدەكاتەوە..

ویستم قەناعەتی پێ بكەم، ئاینی ئیسلامم بۆ ڕوون كردەوەو باسی یەكتاپەرستیم بۆ كرد، خوشكەكەم بەرەو ئەوە دەچوو كە قەناعەت بێنێتو كەوتە ژێر كاریگەریمەوە، بەرەبەرەوێنەی ئیسلامی بۆ ڕوون دەبۆوە، لە كتوپڕێكدا پیٖ‌ی‌وتم: تۆ لە سەر حەقو ڕاستیت.. ئیسلام ئاینی ڕاستو دروستە.. ئەمە ئەو ئاینەیە كە پێویستە من پابەندی بم..

پاشان پێی وتم: یارمەتیت دەدەم.. پێم‌وت: ئەگەر دەتەوێت یارمەتیم بدەیت، ئەوا دەمەوێت مێردەكەم ببینم.. خوشكەكەم لە سەر خانووەكەمانەوە سەیری دەكردو تۆی بینی كە هاتوچۆت دەكردو پێی وتم: من پیاوێك دەبینم بەو شێوەیە..وتم: ئەوە مێردەكەمە.. دەرگاكەم لێ بكەرەوە بۆ ئەوە قسەی لەگەڵ بكەم..

دەرگای لێكردمەوەو لە ماڵ دەرچووم‌و قسەم لەگەڵ كردیت.. بەڵام نەمتوانی لەگەڵت بێم، چونكە بە دوو زنجیر بەسترابوومەوەو كلیلی زنجیرەكانیش بە براكەم بوو، بە زنجیری سێیەمیش بە یەكێك لە كۆڵەكەكانی ماڵەوە بەسترابوومەوە، بۆ ئەوەی ڕانەكەم، كلیلەكەشی بە خوشكە بچوكەكەم بوو، بۆ ئەوەی لە كاتی پێویستیمدا بچم بۆ سەر ئاوو حەمام، كاتێك قسەم لەگەڵ كردی‌و داوام لێكردی كە بمێنیتەوە تا ئەو كاتەی كە دێم بۆ لات، لەبەرئەوەی من بە زنجیر بەسترابوومەوە، هەوڵمدا خوشكەكەم موسڵمان بێت، خوشكەكەم موسڵمان بوو،ویستی هەوڵو تێكۆشانێك بكات، گەورەتر بێت لە هەوڵو تێكۆشانی من،ویستی قوربانی بدات، قوربانیەك لە سەرووی قوربانیدانی من، ئەو بووای لێكردم كە ڕابكەم‌و خۆم ڕزگار بكەم، بەڵام كلیلی زنجیرەكان لە لای براكەم بوو..

ڕۆژێك خوشكەكەم عەرەقێكی زۆر قورسی بۆ براكەم ئامادە كردو دەرخواردیدا.. خواردیەوە.. هەتا بە تەواوی سەرخۆش بوو، ئاگای لە هیچ نەما، پاشان كلیلەكانی لە گیرفانی براكەم دەرهێناو زنجیرەكانی كردەوە، منیش لە تاریكی شەودا هاتم بۆ لات.. پێم‌وت: ئەی خوشكەكەت چی بە سەر هات؟؟!وتی: پێم‌وت: كە موسڵمان بوونی خۆی ئاشكرا نەكات..

ئەو شەوە خەوتین‌و بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆوڵاتو شارەكەی خۆمان.. هەر كە گەیشتینەوە، خێرا هاوسەرەكەم برد بۆ نەخۆشخانەو چەند ڕۆژێك لە نەخۆشخانە مایەوە، بۆ چارەسەری ئازارو برینەكانی.. ئێستا ئێمە داوا لە خودای پەروەردگار

دەکەین‌و لێی دەپاڕێینەوە ،کە خوشکەکەی لە سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام جێگیر بکات‌و دەروی خێری لێبکاتەوە..

★ ئەم چیرۆکە لە کاسێتی (قصص مؤثرة)ی د. إبراهيم الفارس وەرگیراوە .

## ئەی خوشکە بەنرخەکەمان..

★ خوشکی بەڕێزم، ئەم چیرۆکەم بۆ ئەوە بۆ باس نەکردی، کە هەست‌وسۆزت بجولێنم.. یان بۆ ئەوەی فرمێسك لە چاوەکانت برژێنم..

نەخێر.. بۆ ئەوە بۆم باس کردی، کە بزانی ئەم ئاینە کۆمەڵە پاڵەوانێك هەڵیان گرتووەو لە پێناویدا قوربانی دەدەن‌و کەللەی سەریان بۆ بەرزی ئەم ئاینە ئەپژێنن‌و خوێنیان لە پێناویدا دەرێژن‌و لاشەیان لە پێناویدا پارچە پارچە دەکەن...ئەگەر بێباوەڕەکانی دوێنێ،وەك ئەبوجەهل‌و ئومەییە، بیلال‌و سومەیەکانیان ئازار دابێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە بێباوەڕەکانی ئەمرۆ، بە بەردەوامی هەوڵ دەدەن‌و پیلان‌و نەخشە دادەرێژن‌و فێڵ‌و تەڵەکە ساز دەکەن، لە پێناو شەڕو ئاژاوەنانەوە لە دژی ئەم ئاینە پیرۆزە..

خوشکەکەم: ئاگاداربە، نەکەوێتە داویانەوە،وە بۆئەوەی لە بەڕێزی‌و بە نرخی خۆت ئاگاداری ئەوا بزانە کە:

## یەکەم کەس کە لە حەرەمی مەککەدا جێگیر بوو، ئافرەت بوو..

ئیبراهیم ﷺ لە شامەوە چوو بەرەو مەککە (البلد الحرام)، هاجەرەی هاوسەری‌و ئیسماعیلی کوڕیشی لەگەڵ بوو، کە منداڵێکی بچوکی ناو بێشکەی شیرەخۆرە بوو، هەتا لە شوێنی کەعبەی پیرۆزی ئێستا دایانا، شاری مەککە لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێکی لێنەبوو، هەروەها زۆر بێ ئاویش بوو، هەندێك خورماو هەندێك ئاوی بۆ دانان‌و پاشان کەوتە ڕێ بەرەو شام..

هاجەرە لەو بیابانە ترسناکەدا سەیری دەوروبەری خۆی کرد، جگەلە شاخی بەرزو بەردو تاوێری ڕەش نەبێ، هیچی تری نەبینی، هیچ دانیشتوان‌و ڕێبوارێکیشی بەدی نەکرد..لە کاتێکدا هاجەرە لە کۆشك‌و تەلارەکانی میسردا گەورە ببوو، پاشان لە سەوزایی‌و باخ‌و باخاتەکانی شامدا نیشتەجێ بوو..

زۆر لە دەوروبەرەکەی ترساو هەڵساو کەوتە شوێن ئیبراهیمی هاوسەری‌ووتی: ئەی

ئیبراهیم بۆ کوێ دەچیت؟! لەم شیوو دۆڵەدا بە بێ کەسی بەجێمان دەهێڵی؟!

ئیبراهیم وەڵامی نەدایەوە، جگەلەوەش ئاوڕیشی لێنەدانەوە..

هاجەرەوتی: ئەی ئیبراهیم خودای پەروەردگار فەرمانی بەم کارە پێکردوی؟!

ئیبراهیم ﷺ وتی: بەڵێ..

هاجەرەوتی: مادام باشەو خوداشمان بەسە، ڕازیم بە فەرمانەکانی خوداو دڵنیام کە فەرامۆشمان ناکات، پاشان گەڕایەوە..

ئیبراهیم ﷺ پیاوێکی بە تەمەنو بە ساڵاچوو بوو، ڕۆیشت.. لە کاتێکدا لە هاوسەرو تاقە کوڕو جگەرگۆشەکەی جیابۆوەو بە تەنیا جێی هێشتن.. ئای کە سەختو نارەحەتو تاڵە!!

بەڵێ ڕۆیشت، هەتا چووە ئەودیو شاخێکەوە، بۆ ئەوەی نەیبینن و سۆزیان نەجولێت، ڕووەو کەعبەی پیرۆز ڕاوەستاو هەردوو دەستی بەرز کردەوەو کەوتە پارانەوەو فەرمووی: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾ ابراهيم/٣٧ واتە: (پەروەردگار بە ڕاستی من هەندێك لەوەچەو خێزانم لە دۆڵێکیوشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە لە پاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، پەروەردگار بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن، تا بە چاکی نوێژو خوداپەرستی ئەنجام بدەن، جا داواکارم دڵی هەندێك لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایانو لە ڕزقو ڕۆزی جۆراوجۆر بەهرەمەندیان بکەیت، بۆئەوەی سوپاسگوزاربن)..

پاشان ئیبراهیم ﷺ ڕۆیشت بەرەو شام، هاجەرەش گەڕایەوە بۆ لای ئیسماعیلی جگەرگۆشەی، دەستی کرد بە شیر پێدانیو لە ئاوەکەی دەخوارد، هەتا ئاوەکە تەواو بوو.. تینوێتی دەستی پێکرد، منداڵەکەش تینوی بوو، تینوێتی تاوی بۆ منداڵەکە هێنا، هەتاوای لێهات بە لێوی خۆیدا دەنوساو دەستو قاچی ئەکێشا بە زەویدا..

هاجەرەش سەیری ئەملاولاو دەوروبەری کرد، ئایا ئەبێت کەسێك هەبێت بە هانایەوە بێت؟!

کەسی نەبینی.. لە لای منداڵەکەی هەڵساو ڕۆیشت.. حەزی نەدەکرد بە چاوی خۆی مەرگی منداڵەکەی ببینێت... نەیدەزانی چی بکات! بۆ کوێ بچێت؟!

شاخی (سەفا)ی بینی کە نزیکترین شاخ بوو لێوەی، سەرکەوتە سەر شاخەکە، سا بەڵکو کەسانێك ببینێت بۆ حەوانەوە لایان دابێت.. یان کاروانێك بەوێدا تێپەڕن..

کاتێك سەرکەوتە سەر لوتکەو بەرزایی شاخەکە.. کەسی نەبینی.. لە شاخی (سەفا) هاتە خوارەوە، هەتا گەیشتە ناو دۆڵەکە..پاشان بە هەوڵو کۆششێکی زۆرەوە لە دۆڵەکە دەرچوو بەرەو لای شاخی (مەروە)و سەرکەوتە سەر شاخەکەو سەیری کرد، ئایا کەسێك دیارە؟! کەسێکی نەبینی، گەڕایەوە بۆ لای شاخی (سەفا)، هەمدیسان کەسی نەبینی، حەوت جار بەم شێوەیە، لەم شاخ بۆ ئەو شاخو لەم دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ هاتوچۆی کرد، بەڵام کاتێك لە سەر شاخی (مەروە) بوو، لە جاری حەوتەمدا گوێی لە دەنگێك بوو،وتی: بێدەنگ.. پاشن گوێی گرتووتی: بە دڵنیاییەوە گوێم لە دەنگێك بوو، ئەگەر ئەتوانی بە هانامەوەوەرەو ڕزگارم بکە، بەڵام گوێی لەوەڵام نەبوو..

لای کردەوە بە لای منداڵەکەیدا، فریشتەیەکی بینی لە جێگەی ئاوی زەمزەمی ئێستادا، بە باڵەکانی ئەیکێشا بە زەویەکەدا هەتا ئاوەکە هەڵقوڵاو هاتەدەرەوە.. بە پەلە ڕای کرد بۆ لای ئاوەکەو بە دەستیوەکو حەوزێك لێوارو چواردەوری بۆ ئاوەکە کرد، بۆئەوەی ئاوەکە کۆبێتەوەو بە دەستەکانی قاپەکەی لێ پڕکرد.. کاتێکیش لە ئاوەکەی دەردەکرد، بە زوویی ئاوی تر دەهاتەوە شوێنی..

جوبرائیل بە هاجەرەی فەرموو: لە لەناوچوون مەترسن.. ئالێرەدا ماڵی خودای لێ یە.. ئەم منداڵەو باوکی ماڵی خودا دروست دەکەنەوە.. ئای چەند خۆشو جوانە!! ئای لەم ئارامگریە!! بە ڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە!! تاقیکردنەوەکە زۆر زۆر گەورە بوو!!

ئەمە هەواڵی هاجەرە خاتوون بوو.. بە ڕاستی ئارامگر بوو.. هەوڵو تێکۆشانێکی زۆریدا، هەتا خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ هەتاهەتایی ئەم باسەی هێشتەوەو منداڵەکەشی کرد بە یەکێك لە پێغەمبەران، خۆشی بوو بە دایکی پێغەمبەرانو پێشەوای چاکەکارانو خۆشەویستانی خودا..

ئەمە بوو هەواڵی هاجەرە خاتوون.. ئەمەش دوارۆژە پرشنگدارەکەی بوو.. بەڵێ.. توشی غەریبیو ئاوارەیی بوو.. هەروەها توشی ترسو تینوێتیو برسێتی بوو، بەڵام ڕازیو ڕەزامەند بوو.. مادام خودا بەو کارانە ڕازیە... بە ئاوارەییو غەریبی ژیا لە پێناوی خودای پەروەردگاردا، هەتا خودای پەروەردگار پاداشتی دایەوە بە خۆشیو بە موژدە بەخشی..بۆ هەتاهەتایە خەڵکی دەبێت شوێن هەنگاوەکانی دایکە هاجەرە بکەونو فرمێسك بڕێژنو لە خودا بپاڕێنەوە کە سەردانی ئەو شوێنە پیرۆزەیان پێ ببەخشێتو بە شوێن هەنگاوەکانی ئەو ئافرەتە پیرۆزەدا بڕۆنو ئەمانیش بە ژنو

پیاوەوە لە نێوان.. هەردوو شاخی (سەفا)و (مەروە)دا پەیمان لەگەڵ هاجەرە خاتوندا تازە بکەنەوەو بە هەمان شێوەی ئەو لەو نێوانەدا هاتوچۆ بکەن، خودای گەورەش ئەو هاتوچۆیەی کرد بە پایەیەك لە پایەکانی حەج، ئەو حەجەی کە یەکێکە لە پایەکانی ئەم ئیسلامە..

خۆزگەمان بەو غەریبو نامۆیانە.. کێن ئەوانە؟!

ئەوانە کەسانی چاکەخوازن لە نێوان کەسانی خراپەکاردا.. ئەوانە ئەو پیاوو ئافرەتە باوەڕدارانەن کە ڕاستگۆ بوون، بەو پەیمانەی کە لەگەڵ خودای گەورەدا بەستیان.. ئیمانی ئەو کەسانەوەکو ئەوەوایە کە لە سەر لەپی دەستیان پشکۆی ئاگریان هەڵگرتبێتو بە سەر شاخو بەردو دارو ڕێگەی ناخۆشیشدا بڕۆنو لە سەر لمی گەرمی بیابانیشدا بمێننەوە..

ئا ئەوانە لە خراپە ڕادەکەن..زمانیان پاکەو جگەلە ڕاستی هیچی تر نازاننو دوورن لە درۆو زمان خراپی.. پاك داوێننو داوێنیان لە خراپەو تاوان دەپارێزن، چاویان دادەخەن لە ئاستی خراپەو تاواندا.. قسەو گفتوگۆیان پاكو سوودبەخشە.. دانیشتنو کۆڕو کۆبوونەوەیان بەرزو پیرۆزە.. کاتێکیش لە بەر دەستی خودای خاوەن دەسەڵاتدا ڕادەوەستێنرێن.. ئەو کاتەی دەستو قاچەکان شایەدی لە سەر خاوەنەکانیان دەدەن.. ئەو کاتەی گوێچکەو چاوەکان دەکەونە گفتوگۆ.. ئا ئەم کەسانە دڵخۆشو ئاسودەن.. چاوەکانیان شایەدییان لە سەر نادەن.. چونکە سەیری کاری نارەواو حەرامیان پێ نەکردوون.. بە گوێچکەکانیان گوێیان لە گۆرانیو قسەی پڕوپوچ نەگرتووە.. بەڵکو شایەدییان بۆ دەدەن کە ئەم کەسانە لە کاتی سەحەرو بەرەبەیاندا، لە ترسی خودا گریاونو لە ڕۆژیشدا شایەدی پاك داوێنیان بۆ دەدەن.. هەتا ئەو کاتەی بە ڕۆحو گیانیان خۆیان بە قوربانی ئاینەکەیان دەکەنو دەگەنەوە بە خودای خۆشەویستیان...

## مەنجەڵەکەیان پێ گەرم دەکرا..!!

قژداهێنەرو ڕازێنەرەوەی کچی فیرعەون بوو، مێژوو ناوی تۆمار نەکردووەو پارێزگاری لە ناوەکەی نەکردووە، بەڵام پارێزگاری لە کردارەکانی کردووەو تۆماری کردووە... ئافرەتێکی چاکەکار بوو، خۆیو مێردەکەی لە ژێر سێبەری پادشایەتی فیرعەوندا ژیانیان بە سەر دەبرد، هاوسەرەکەی لە فیرعەونەوە نزیك بوو، ئەم ئافرەتەش پەروەردەکاری کچەکانی فیرعەون بوو، خودای گەورەش پلەو پایەی ئیمانی

پێ بەخشیبوونو موسڵمان بوون..

ئەوەندەی پێنەچوو فیرعەون هەستی کرد، کە ئەم پیاوە موسڵمان بووەو شەهیدی کرد.. ئەم ئافرەتەش بە بەردەوامی لە ماڵی فیرعەوندا کاری دەکردو سەرو قژی کچەکانی فیرعەونی شانە دەکردو پێنج منداڵەکەی پێ بەخێو دەکرد، هەروەك چۆن باڵندەو پاساری خواردن ئەدەن بە بەچکەکانیان، ئاوەها ئەم ئافرەتە منداڵەکانی بەخێو دەکردو خواردنی پێدەدانو گەورەی دەکردن..

ڕۆژێك قژی کچێك لە کچەکانی فیرعەونی شانە دەکرد، شانەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە ووتی: بە ناوی خودا.. کچەکەی فیرعەون وتی: مەبەستت لە خودا، باوکی منە؟ ئەم ئافرەتە بە سەر کچەکەی فیرعەوندا هاواری کردوتی: نەخێر مەبەستم لە (ألله)یە، خودای منو خودای تۆو خودای باوکیشت..

کچەکەی فیرعەون سەری سوڕما، کە غەیری باوکی دەپەرستێت!! پاشان ئەم هەواڵەی برد بۆ باوکی.. فیرعەون زۆری لە لا سەیر بوو کە لە کۆشکەکەی ئەودا کەسێکی تر دەپەرستێت!! بانگی ئافرەتەکەی کردو پێیوت: کێ خودای تۆیە؟!

ئافرەتەکەوتی: خودای منو خودای تۆش (ألله)یە..

فیرعەون فەرمانی پێکرد پاشگەز بێتەوە لە ئاینەکەیو دەستی کرد بە سزادانیو خستیە زیندانەوە.. بەڵام ئافرەتەکە لە ئاینەکەی خۆی پاشگەز نەبوەوە.. فیرعەون فەرمانیدا بە هێنانی مەنجەڵێکی مس کە پڕ کرا بێت لە زەیتو پاشان گەرم کرا، هەتا قرچایەوەو داغ بوو، پاشان ئافرەتەکەیان لە بەرامبەر مەنجەڵەکەوە ڕاگرت.. کاتێك ئەم سزاو نارەحەتیەی بینی، هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە گیان یەك گیانەو کاتێك لە لاشە دەردەچێت دەگات بە دیداری خودای پەروەردگار، ئیتر بۆ دوودڵ بێتو بترسێت؟!

فیرعەون دەیزانی کە خۆشەویسترین شت لە لای ئەم ئافرەتە، پێنج جگەرگۆشەکەیەتی.. ئەو منداڵانەی کە بە بێ باوك گەورەی کردوونو ڕەنجو ماندووبوونی لەگەڵ کێشاون.. ئەم ستەمکارەویستی زیاتر ئەم ئافرەتە ئیمانداره سزاو نارەحەتی توش بێت، بۆیە هەر پێنج منداڵەکەی ئامادە کرد.. منداڵەکان چاویان دەگێڕاو نەیاندەزانی بۆ کوێیان بە ڕێ دەکەن، کاتێك چاویان بە دایکیان کەوت، خۆیان پیادا هەڵواسیو دەستیان کرد بە گریان، دایکیشیان خۆی بە سەردا شۆڕ دەکردنەوەو ماچی دەکردنو بۆنی پێوە دەکردنو دەگریا.. گریانێکی بە کوڵ.. منداڵە بچوکەکەیانی لە باوەش گرتو نوساندی بە سنگیەوەو مەمکی خستە دەمیەوە، تاوەکو کەمێك شیری پێبدات..

کاتێك فیرعەون ئەم دیمەنەی بینی، فەرمانی بە سەربازەکانی کرد، کە منداڵە گەورەکەیان فڕێ بدەنە ناو زەیتە قرچاوەکەوە.. کوڕەکەش هاواری بۆ دایکی دەکردو داوای یارمەتی لێدەکرد، داوای سۆزو بەزەیی لە سەربازەکان دەکرد.. داوای لە فیرعەونی دڵ ڕەقی ستەمکار دەکرد.. دەیویست هەڵبێتو ڕابکات.. بانگی برا بچوکەکانی دەکردو بە دەستە بچوکەکانی لە سەربازەکانی دەدا.. دایکی بەستەزمانیش سەیری دەکردو لە دوورەوە ماڵئاوایی لێکرد..

ئای لەم کاتو ساتە!! کوڕەکەیان خستە ناو زەیتەکەوەو گۆشتی لاشەی توایەوەو ئێسقانە سپیەکانی کەوتنە سەرەوەی زەیتە قرچاوەکە.. فیرعەون سەیری ئافرەتەکەی کردو فەرمانی پێدا کە لە باوەڕەکەی پەشیمان بێتەوە.. بەڵام ئافرەتەکە ڕێگری لەو کارە کرد..

بەم هەڵوێستە خۆڕاگریەی ئافرەتەکە، فیرعەون تووڕە بوو.. فەرمانیدا کوڕی دووەم بێنن.. لە دایکی دووریان خستەوەو ڕایان کێشا.. کوڕەکەش هەر دەگریاو داوای یارمەتی دەکرد.. لە چەند ساتێکی کەمدا فڕێیاندایە ناو زەیتەکەوەو دایکیشی سەیری دەکرد، هەتا ئێسقانە سپیەکانی لەگەڵ ئێسقانی براکەیدا تێکەڵ بوو.. ئەم ئافرەتە جێگیرو خۆڕاگر بوو لە سەر باوەڕو ئاینەکەیو دڵنیا بوو کە زۆری نەماوە بە دیداری خودای پەروەردگاری شاد بێت..

پاشان فیرعەون فەرمانیدا کە کوڕی سێیەمی بێنن.. ڕایان کێشاو لە مەنجەڵە مسەکەیان نزیك خستەوە، پاشان ئەمیش لە زەیتە قرچاوەکەداوون بوو.. ئەوەی پێکرا، کە لەگەڵ هەردوو براکەیدا کرا.. دایکیان لە سەر ئەم حاڵەتە سەختو پڕ ئێشو ئازارە ئارام گربوو..

فیرعەون فەرمانیدا کە منداڵی چوارەمیش فڕێ بدرێتە زەیتەکەوە.. کاتێك سەربازەکان شاڵاویان بۆ برد.. منداڵەکە خۆی بە جلو بەرگەکانی دایکیەوە نوساند بوو.. سەربازەکان لە دایکیان کردەوەو ڕایان کێشا، منداڵەکە گریاو کەوت بە سەر قاچی دایکیداو فرمێسکەکانی قاچەکانی دایکی تەڕ کرد.. دایکی زۆر هەوڵیدا لەگەڵ منداڵە بچوکەکەیدا هەڵیان گرێت، دەیویست ماڵئاوایی لێبکاتو ماچی بکاتو بۆنی خۆشەویستی پێوە بکات، پێش ئەوەی لە یەکتر جیابکرێنەوە.. ئەو ستەمکارانە جگەرگۆشەو دایکەکەیان لە یەك جیاکردەوەو بە دەستە بچوکەکانی هەڵیان گرت.. منداڵەکەش هەردەگریاو هاواری دەکردو بە هەندێكوشە دەدوا، کە نەدەتوانرا لێی

تێبگەیتو هیچ بەزەییەکیان پێیدا نەهاتەوە.. لە چەند ساتێکی کەمدا، ئەمیش لە ناو زەیتە فرچاوەکەداوون بوو.. لاشەکەی دیار نەما.. دەنگی گریانو هاوارو ناڵەی کپ بۆوە..

دایکی بۆنی گۆشتی سوتاوی جگەرگۆشەکانی دەکرد.. بە ڕاستی زۆر سەختو نارەحەتە!! ئێسقانی ئەم منداڵە بچوکەش کەوتە سەرووی زەیتەکە.. دایکی سەیری دەکرد.. منداڵەکە کەوتەڕێ بەرەو ماڵو دنیایەکی تر.. دایکیان هەر دەگریاو بە جیابوونەوەی لە منداڵەکانی دڵی پارچە پارچە دەبوو.. منداڵی پێنجەمی بە سنگیەوە نوساند بوو.. بە مەمکەکانی شیری پێ ئەداو لە پێناویدا شەونخونی کرد بوو.. بە گریانی منداڵەکەی گریا بوو.. چەندین شەو لە باوەشیدا شەوی دەکردەوەو یاری بە پرچی دایکی دەکرد.. چەندان جار دایکی یاریەکانی بۆ نزیك دەکردەوەو چەندان جار جلو بەرگی جوانی بۆ لەبەرکردبوو..

## منداڵە شیرەخۆرەکە..

منداڵە شیرەخۆرەکەشیان لە باوەشی کردەوە.. ئەمە منداڵی پێنجەمی بوو.. هێشتا مەمکەکانی لە دەمی جگەرگۆشەکەیدا بوو.. کاتێك مەمکی دایکیان لە دەم دەرهێناو لە باوەشی گەرمی دایکی دووریان خستەوە.. منداڵەکە دەستی کرد بە گریانو هاوار هاوار.. دایکیشی فرمێسك بە چاوەکانیدا جۆگەلەیان بەست..

کاتێك خودای پەروەردگار لە سەرووی ئاسمانەکانەوە ئەم دیمەنەی بینی.. کاتێك لاوازیو بێ دەسەڵاتی ئەم ئافرەتە ئیماندارەی بینی.. کاتێك بینی ئەم دایکە چەندێك بۆ جگەرگۆشەکانی بە پەرۆشە.. منداڵە بچوکەکەی هێنایە زمانو بە دایکیوت: ئەی دایە گیان.. ئارام بگرە.. بە دڵنیاییەوە تۆ لە سەر ڕێبازێکی ڕاستو دروستیت.. پاشان دەنگی نەماو لەگەڵ چوار براکەی تریدا لە زەیتەکەدا نقوم بوو..

بەڵێ فرێدرایە ناو زەیتەکەوە.. هێشتا پاشماوەی شیری دایکی لە دەمیدا مابوو!! هێشتا تاڵە قژەکانی دایکی لە دەستە بچوکەکانیدا بوو.. فرمێسکەکانی دایکی هێشتا بە سەر جلو بەرگەکانیەوە بوو.. هەر پێنج منداڵەکەی بەم شێوەیە ماڵئاواییان لەم جیهانە کرد.. ئا ئەوە ئێسقانی منداڵەکانیەتیو لەگەڵ گۆشتی لاشەیان لێك جیابوونەتەوەو لە زەیتەکەدا قوڵپ دەدەن!! ئەم ئافرەتە هەژارە سەیری دەکرد.. سەیری ئەو ئێسقانە بچوکانەی دەکرد!!

ئێسقانی کێ؟! هی منداڵەکانی!! ئەو منداڵانەی کە ماڵەکەیان پڕ کرد بوو لە پێکەنینو قاقای خۆشی... ئەم منداڵانە پارچەیەك لە جگەرو تەرایی دڵی بوون.. کاتێك لە منداڵەکانی جیاکرایەوە..وەك ئەوەوابوو، کە دڵی لە سنگی دەربهێنن.. بیری ئەو کاتەی دەکردەوە کە رایان دەکرد بۆ لایو لە بەردەستیدا خۆیان دەدا بە زەویداو ئەمیش دەیگوشین بە سنگیەوە.. بە دەستی خۆی جلو بەرگی جوانی لەبەردەکردن.. بە پەنجەکانی فرمێسکەکانی دەسڕین.. کەچی یەك یەك لە باوەشیدا دەریان هێنانو بە بەرچاویەوە کوژرانو سوتێنران، ئەمیش تەنها ماوەتەوە.. زۆر نزیکە بگات بەوان.. زۆر بە ئاسانیش دەیتوانی بە تەنهاوشەیەك منداڵەکانی لەو سزاو ئازارو نارەحەتیە ڕزگار بکات.. بەڵام دەیزانی ئەوەی لە لای خودایە باشترو بەردەوامترەو لەناویش ناچێ..

بەڵێ تەنها خۆی ماوەتەوە.. ئەو ستەمکارانە بەوێنەی سەگی هار بەرەو رووی چوون بۆئەوەی بیخەنە ناو مەنجەڵەکەوە.. کاتێك هەڵیان گرت بۆئەوەی فڕێیدەنە ناو زەیتەکەوە، سەیری ئێسقانی جگەرگۆشەکانی دەکردو بیری لەوە دەکردەوە کە چەند ساتێك لەمەوپێش هەموویان دەست لە ملی یەکتربوون.. بە هەمان شێوە ئێستاش ئێسقانەکانیان لە دەوری یەك کۆبوونەتەوە.. لەم کاتەدا لای کردەوە بە لای فیرعەونداو وتی: داوا و پێویستیەکم لێت هەیە..

فیرعەون هاواری کردووتی: پێویستیەکەت چیە؟!

ئافرەتەکە وتی: داوات لێدەکەم ئێسقانی منو منداڵەکانم کۆبکەنەوەو هەموومان لە یەك گۆڕدا بنێژن..

پاشان چاوی داخستو فڕێیاندایە مەنجەڵەکەوەو لاشەکەی سوتاو بۆنی گۆشتو ئێسقانەکانی بەرزبۆوە...

# چەندە ئافرەتێکی هەڵوێست بەرز بوو..!!

چ گەورەییەك لەو ئارامیە گەورەترە؟! چ پاداشتێك لەو پاداشتە گەورەترە؟! پێغەمبەری خودا ﷺ لە شەوی ئیسراو میعراجدا بەشێك لەو نازو نیعمەتەی بینی کە خودای پەروەردگار بەو ئافرەتەو منداڵەکانی بەخشی بوو، هەروەك بۆ هاوەڵانی باس دەکاتو دەفەرموێت: (لما أسري بي، مرت بي رائحة طيبة، فقلت: ما هذه الرائحة؟ فقيل لي: هذه ماشطة بنت فرعون وأولادها). رواه البيهقي. واتە: (کاتێك شەورەویم پێکرا، بۆنێکی زۆر خۆش بە سەرمدا هاتو وتم: ئەم بۆنە چیە؟ پێیانوتم: ئەوە بۆنی قژداهێنەرەکەی کچی فیرعەونو منداڵەکانیەتی)..

بەرزیو گەورەیی بۆ خودا.. کەمێك ماندوو بوو.. چەند ساتێکی کەم سزاو ئازاری چەشت.. زۆر زۆر حەوایەوەو بۆ هەتا هەتایی ئیسراحەتی کرد.. ئەم ئافرەتە چاکەکارە بەرەو لای پەروەردگاری رۆیشتو لە خودا نزیك بۆوە.. داواکارین ئێستا لە بەهەشتەکانی پەروەردگاردا بیت، لە لای پادشای بە تواناو دەسەڵاتدار، رۆژێك ژیانی ئەو ئافرەتە لە بەهەشتدا، باشترە لە هەموو ژیانی دونیا، ئێستا لەوپەری جوانیو خۆشیدایە..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (لَو أَنَّ إِمرَأَةٍ مِن أَهلِ الجنَّة إطلعت إلى أهل الأرض، لأضاءت ما بينهما ولملأته ريحاً، ولنصيفها على رأسها خير من الدنيا ومافيها). رواه البخاري. واتە: (ئەگەر ئافرەتێك لە ئەهلی بەهەشت، بڕوانێ بۆ خەڵکی زەویو خۆی پیشانیان بدات، ئەوا نێوانی زەویو ئاسمان ڕووناك دەکاتەوەو بۆن خۆشی دەکات، وە سەرپۆشەکەی سەری باشترە لە هەموو دونیاو لەوەش کە تیایەتی)..

هەروەها دەفەرموێت: (من دخل الجنة ينعم لايبؤس، لاتبلى ثيابَهُ، ولايفنى شبابَهُ، وله الجنة، ما لاعين رأت، ولاأذن سمعت، ولاخطر على قلب بشر، ومن دخل إلى الجنة نسي عذاب الدنيا). رواه مسلم. واتە: (هەر کەسێك بچێتە بەهەشتەوە، لە نازو نیعمەتو خۆشگوزەرانیدا دەبێتو پێویستی بە هیچ شتێك نابێت، جلو بەرگەکانی کۆن نابن، گەنجێتیەکەشی کۆتایی نایەت، وە خودای گەورە بەهەشتی پێدەبەخشێت، کە نە چاو بینیویەتی، وە نە گوێچکەش بیستویەتی، وە بە دڵو خەیاڵی هیچ کەسێکیشدا نەهاتووە، وە هەر کەسێك بچێتە بەهەشتەوە، هەموو ئازارو نارەحەتیەکانی دونیای بیردەچێتەوە)..

بەڵام هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشتەوە، تەنها بە ڕێگری کردنی نەبێت لە ئارەزووەکانی، بە دڵنیایشەوە بەهەشت چواردەورەو گەمارۆدراوە بە نارەحەتیو

ناخۆشی، وه‌ ئاگری دۆزه‌خیش چوارده‌وره‌ دراوه‌ به‌ حه‌زو ئاره‌زووه‌كان.. شوێن كه‌وتنی حه‌زو ئاره‌زوو له‌ جل‌و به‌رگ‌و خواردن‌و خواردنه‌وه‌و بازارو .. ڕێگه‌و ڕێچكه‌ن به‌ره‌و ئاگری دۆزه‌خ، هه‌روه‌ك پێغه‌مبه‌ری نازدار ﷺ ده‌فه‌رموێت: (حفت الجنة بالمكاره، وحفت النار بالشهوات). متفق عليه.

ده‌ی ئه‌مڕۆ كه‌مێك هیلاكی‌و ماندوێتی بكێشه‌و ئارام بگره‌، بۆئه‌وه‌ی سبه‌ینێ بحه‌سێیته‌وه‌و له‌ ڕۆژی دواییدا له‌ لایه‌ن فریشته‌كانه‌وه‌ پێت بوترێت: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾ الرعد/٢٤ واته‌: (سلاوتان لێبێت به‌هۆی خۆگرتنتانه‌وه‌ (له‌ به‌رامبه‌ر كێشه‌كانی ژیان‌و له‌ به‌رامبه‌ر گاڵته‌جاری خوانه‌ناسان‌و ...)، كه‌وابوو ئای چه‌نده‌ جێگه‌و ڕێگه‌یه‌كی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگه‌ر كرد)..

به‌ڵام به‌ دۆزه‌خیه‌كان ده‌وترێت: ﴿وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ﴾ الأحقاف/٢٠ واته‌: (ڕۆژێك دێت ئه‌وانه‌ی كه‌ بێ بڕوان، به‌ره‌و دۆزه‌خ ده‌برێن‌و نیشانیان ده‌درێت‌و پێیان ده‌وترێت: هه‌رچی خۆشی‌و شادیه‌كتان هه‌بوو له‌ ژیانی دونیاتاندا ئه‌نجام تانداو به‌ ئاره‌زووی خۆتان ڕاتانبوارد، كه‌وابوو ئه‌مڕۆ ئیتر نۆره‌ی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ سزای خه‌جاڵه‌تی‌و ڕیسوایی بدرێنه‌وه‌، به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ زه‌ویدا لوت به‌رزیتان ده‌نواند،وه‌ به‌هۆی ده‌رچوونتان له‌ سنورو فه‌رمانی خودا)..

## پاره‌و سامانێک له‌ گۆڕدا..!!

فڕداهێنه‌ری كچه‌كه‌ی فیرعه‌ون، له‌گه‌ڵ ئه‌و تاقیكردنه‌وه‌ گه‌وره‌یه‌شدا ئارامگربوو.. به‌ڵام جێگه‌ی سه‌رسوڕمانه‌ بۆ كچان‌و ئافره‌تان، كه‌ ناتوانن به‌رده‌وام‌و خۆڕاگربن، ته‌نانه‌ت له‌ سه‌ر ئه‌نجادامدانی نوێژه‌كانیشیان، هه‌میشه‌ ساردو سڕی‌و كه‌م‌و كوڕی ده‌كه‌ن له‌ ئه‌نجامدانی نوێژه‌كانیان، هه‌تا جاری‌واهه‌یه‌وازیشی لێدێنن‌و خۆیان بێباوه‌ڕ ده‌كه‌ن، په‌نا به‌ خودا!! هه‌روه‌ك پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ ده‌فه‌رموێت: (العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة، فمن تركها فقد كفر). رواه الترمذي.واته‌: (ئه‌و په‌یمانه‌ی كه‌ له‌ نێوان ئێمه‌و ئه‌واندایه‌ بریتیه‌ له‌ نوێژ، ئه‌وه‌ی‌وازی لێبێنێت، ئه‌وا به‌ دڵنیاییه‌وه‌ بێباوه‌ڕ بووه‌)..

هه‌ر كه‌سێك واز له‌ نوێژ كردن بێنێت، خودای گه‌وره‌ به‌ نه‌مری‌و بۆ هه‌تاهه‌تایی له‌ ئاگردا ده‌یهێڵێته‌وه‌و له‌گه‌ڵ شه‌یتاندا سزای ده‌دات‌و له‌ نازو نیعمه‌تی به‌هه‌شت دووری

دەخاتەوەو کێمو زوخاوی دەرخوارد دەدات..

★ ئیمامی زەهەبی لە کتێبی (الکبائر)دا، ئەم بە سەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ئافرەتێك دەمرێتو براکەی دەینێژێت.. ئەم پیاوە لە کاتی ناشتنی خوشکەکەیدا جزدانی پارەکەی دەکەوێتە گۆڕەکەوە، بەڵام هەستی پێناکات، هەتا گۆڕەکەی بەجێ دەهێڵێت.. پاشان بیری دەکەوێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ لای گۆڕی خوشکەکەیو دەست دەکات بە هەڵدانەوەی خۆڵی سەر گۆڕەکە.. کاتێك دەگات بە لاشەی خوشکەکەی، دەبینێت گۆڕەکە دەسوتێتو ئاگری لێبەرز دەبێتەوە.. هاوار دەکاتو بە زوویی خۆڵەکە دەداتەوە بە سەر لاشەکەداو بە گریانەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای دایکیو دەڵێت: دایکە هەواڵم بدەرێ دەربارەی خوشکەکەم، ئەم خوشکەی من چ کارو کردەوەیەکی خراپی ئەنجام دەدا؟!

دایکی وتی: بۆچی پرسیار دەکەیت؟!

وتی: دایە گیان، گۆڕی خوشکەکەمم بینی دەسوتاو گڕی سەندبوو !! دایکی دەستی کرد بە گریانووتی: تەنها تاوانی خوشکەکەت ئەوە بو، لە نوێژەکانیدا ساردو سڕ بوو، هەروەها لە کاتی خۆیدا ئەنجامی نەئەدان..

ئەمە حاڵی ئەو کەسانەیە کە نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا ئەنجام نادەن، نوێژی بەیانی ئەنجام نادەن، کاتێك نەبێت کە ڕۆژ هەڵدێتو نوێژەکانی تریش بەهەمان شێوە.. ئەی ئەبێت حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت، کە هەر نوێژ ناکەن؟!!

پێغەمبەری خودا ﷺ لە خەوێکدا باسی بینینی سزای ئەو کەسانە دەکات کە لە کاتی خۆیدا نوێژەکانیان ئەنجام نادەن، هەروەك دەفەرموێت: (آتاني الليلة أتيان، وإنهما ابتعثاني، وإنهما قالا له: إنطلق، وإني إنطلقت معهما، وإنا أتينا على رجل مضطجع، وإذا أخر قائم عليه بصخرة، وإذا هو يهوي بالصخرة على رأسِهِ، فيثلغ رأسَهُ، فيتدهده الحجر هاهنا، فيتبع الحجر فيأخذه، فلايرجع إليه حتى يصح رأسَهُ كما كان، ثم يعود عليه، فيفعل بِهِ مثل ما فعل بِهِ المرة الأولى، فقلت: سبحان الله، ماهذان؟ فقال الملكان: هذا الرجل يأخذ القرآن، فيرفضه (يعني: لايعمل بما فيه)، وينام عن الصلاة المكتوبة).

واتە: (شەوێك دوو فریشتە هاتنە لامو پێیان وتم: لەگەڵماندا بکەوە ڕێ ، منیش لەگەڵیاندا دەرچووموو کەوتمە ڕێ، تاگەیشتینە لای پیاوێك کە ڕاکشا بوو، کەسێکی تر بەردێکی گەورەی بە دەستەوە بوو، بەدیاریەوەوەستا بوو، دەیکێشا بە سەر سەری کابرای ڕاکشاوداو سەری پان دەکردەوەو بەردەکەوردوخاش دەبوو، پاشان سەری پیاوە ڕاکشاوەکە چاك دەبۆوەو پیاوەکەی تر هەمدیسانو بەشێوەی یەکەم جاری لێ

دەكردەوە،وتم: پاكو بێگەردی بۆ خودا ئەمانە چین ؟! دوو فریشتەكەش ووتیان: ئەو پیاوەی ڕاكشاوە قورئانی وەردەگرتو لێی تێدەگەیشت، بەڵام كاری پێنەدەكردو پشت گوێی دەخست،وە لە كاتی نوێژە فەرزەكاندا ئەخەوتو لە كاتی خۆیاندا ئەنجامی نەئەدان )..

## شاژن..

ئایا دەیناسیت؟!

شاژنێك لە سەر عەرشی پادشایەتی.. لە خێزانێكی خۆشگوزەراندا ژیا بوو.. هەروەها لە سەر جێگەو فەرشی ڕازاوە.. لە نێوان كۆمەڵێك خزمەتگوزاردا خزمەت دەكراو كەس و كارو خەڵكی ڕێزیان لێدەگرت..

ئەم شاژنە ئیمانی هێنابوو، بەڵام ئیمانەكەی ئاشكرا نەكردبوو.. ئەو ئافرەتە ئاسیە خاتوون بوو.. خێزانی فیرعەون.. لە ناو نازو نیعمەتێكی بەردەوامدا بوو.. كاتێك كاروانی شەهیدانی دەبینی، كە پێشبڕكێیان دەكرد بۆ چوونەژوورەوە لە دەرگاكانی بەهەشتەوە، ئەمیش ئارەزووی دەكرد بگات بە خودای پەروەردگاریو نارەحەتو دڵتەنگ بوو بە ژیان لەگەڵ فیرعەوندا..

كاتێك فیرعەون قڕداهێنەری كچەكانی شەهید كرد، چوو بۆ لای ئاسیەی خێزانیو لە بەرامبەریدا دەسەڵاتو هێزو توانای خۆی بۆ دەرخست..

ئاسیە خاتوون هاواری كردووتی: ئەی فیرعەون هاوارووواوەیلا بۆ تۆ، چۆن لە بەرامبەر خوداوە وێرات ئەو كارە بكەیت؟! پاشان ئیمانو باوەڕەكەی ئاشكرا كرد.. فیرعەون زۆر تووڕە بوو، سوێندی خوارد ئەبێت تامی مردن بچێژێتو بیكوژێت.. یاخود بێباوەڕ بێتەوە بەرامبەر خوداكەییو پەشیمان بێتەوە..

پاشان فیرعەون فەرمانیدا لە سەر تەختەیەك درێژكراو دەستو قاچەكانیان چوار مێخە كردو بە سنگی ئاسنینەوە بەستیانەوە..

پاشان فەرمانیدا كەلێی بدەن.. دەستیان كرد بە لێدانی هەتا خوێن بە سەر لاشەیدا جۆگەلەی بەست، گۆشتی لاشەی لە ئێسقانەكانی جیادەبۆوە.. كاتێكیش ئازارو سزاو نارەحەتیەكانی زیادی كردو مردن لێی نزیك بۆوە، چاوەكانی بەرەو ئاسمان بەرز كردەوەووتی: ﴿ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ التحريم/١١ واتە: (پەروەردگارم بۆم دروست بكە لە لای خۆت

ماڵێك لە بەهەشتدا،وە ڕزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەکانی،وە ڕزگارم بکە لە گەلی ستەمکاران)..

بەڵێ.. نزاو پاڕانەوەکەی بەرزبووەوە بەرەو ئاسمان و خودای گەورە ماڵ و خانووەکەی لە بەهەشتدا هێنایە پێش چاوی و پیشانیدا.. ئاسیە خاتونیش زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی و پاشان گیانی سپارد..

بەڵێ..وازی لە هەموو خۆشیەکانی دونیا هێناو مردنی هەڵبژارد.. بەڵام ئەمڕۆ بە ئارەزووی خۆی لە نێوان نازو نیعمەتەکانی بەهەشتدا دێت و دەچێت.. بە ڕاستی ئارامگری و ملکەچیەکەی بۆ خودای پەروەردگارو بەرەنگاربوونەوەی ئارەزووەکانی سودیان پێگەیاند..

## یەکەم کەس کە موسڵمان بوو، ئافرەت بوو..

ئاسیە خاتونی شاژن بەرەو لای پەروەردگاری ڕۆیشت.. بەڵام لە دوای ئەویش و تا ئێستاش خێرو چاکە هەرماوە لە ناو ئافرەتاندا.

بوخاری لە پێغەمبەرەوە ﷺگێڕاویەتیەوە، کە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نیگاو سروشی بۆ بێت و ببێت بە پێغەمبەر، دەچوو بۆ ئەشکەوتی (حراء)و خواپەرستی تێدا ئەنجام دەدا، ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ بە ئارامی لە ئەشکەوتەکەدا دانیشتبوو، لە پڕ جوبرائیل هات بۆ لای و پێی فەرموو: بخوێنە.. پێغەمبەر ﷺ ترساو فەرمووی.. هەرگیز هیچ پەڕاوێکم نەخوێندۆتەوە..وە ناشزانم بنوسم.. جوبرائیل توند نوساندی بە خۆیەوەو پاشان وازی لێهێناو وتی بخوێنە.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من خوێندەوار نیم.. جوبرائیل جارێکی تریش گوشی بە خۆیەوەو پاشان وازی لێهێنایەوەو فەرمووی: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ★ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ★ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ★ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ★ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ العلق/١-٥

واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە★ مرۆڤی دروست کردووە لە خوێنێکی بەستوو★ بخوێنە پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەس بەخشندەترە★ ئەو پەروەردگارەی کە مرۆڤی فێری نوسین کردووە بەهۆی قەڵەمەوە★ مرۆڤی شارەزا کردووە لەو شتانەی کە نەیدەزانی)..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ گوێی لەم ئایەتە پیرۆزانە بوو.. هەروەها ئەم دیمەنەی بە چاوی خۆی بینی.. ترس دایگرت و دڵی کەوتە لەرزین.. پاشان گەڕایەوە بۆ شاری مەککەو چوو بۆ لای خەدیجەی هاوسەری و فەرمووی: دامپۆشن.. دامپۆشن..

پاشان ڕاکشاو دایان پۆشی..

دایکی ئیمانداران سەیری دەکردو نەیدەزانی چی بەسەرهاتووەو چی ئاوا ترساندوویەتی!! پێغەمبەری خودا ﷺ بەم شێوەیە مایەوە، هەتا ترسەکەی ڕەویەوە، پاشان لای کردەوە بە لای خەدیجەی هاوسەریداو ڕووداوو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: ئەی خەدیجە بە دڵنیاییەوە لە خۆم دەترسم!!

خەدیجەش فەرمووی: نەخێر سوێند بە خودا هەرگیز خودای گەورە دڵشکاوو تێکشکاوت ناکات، چونکە تۆ سەردانو هاموشۆی خزمو کەس دەکەیتو ڕێز لە میوان دەگریتو هاوکاریو یارمەتی لێقەوماوو داماوان دەکەیتو پشتگیری لە حەقو ڕاستی دەکەیت..

پاشان دەستی پێغەمبەری ﷺ گرتو بردی بۆ لای (وەرەقەی کوری نەوفەل)ی ئامۆزای، کە پیاوێکی پیری نابینا بوو، ئەم ئامۆزایەی لە سەر دینی مەسیحی بوو، دەیزانی ئینجیل بخوێنێتەوەو دەشیزانی بنوسێت، هەروەها هەواڵی پێغەمبەرانیشی دەزانی..

خەدیجە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ چووە ژوورەوەو دانیشتنو تی: ئەی ئامۆزا، گوێ لەم برازایەت بگرە..

وەرەقە وتی: ئەی برازام چی دەبینیت؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی پێدا بەوەی کە بینیویەتی، هەروەها لەو ئایاتانەش ئاگاداری کرد کە جوبرائیل پێی فەرموو بوو..

وەرەقە وتی: پاكو بێگەردی.. پاكو بێگەردی.. مژدە بێت.. مژدە بێت.. ئەمە هەر ئەوەیە کە دابەزیە سەر موسا،واتە نیگای خودای پەروەردگارە.. پاشانوەرەقەوتی: خۆزگە کاتێك گەلو هۆزەکەت کە دەرت دەکەن، گەنجو بەتوانا بوومایە، بۆ ئەوەی یارمەتیم بدایتایەو پشتگیریم لێبکردیتایە!!

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوانە دەرم دەکەن؟!

وەرەقە وتی: بەڵێ، هەموو پێغەمبەرانی هاوشێوەی تۆ دەرکراون، پاشانوتی: ئەگەر بکەومە ئەو ڕۆژە، ئەوا یارمەتیت دەدەمو بەرگریت لێدەکەم..

پاشان پێغەمبەر ﷺ و خەدیجە (خودای لێ ڕازی بێت) هاتنە دەرەوە، خەدیجە (خودای لێ ڕازی بێت) باوەریوابوو ئیتر کاتی خەوو پشوو کۆتایی هاتو بە دڵنیاییەوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا توشی تاقیکردنەوەو نارەحەتی دەبێتو لەوانەشە لە ماڵەکەی

خۆشی دەربکرێت. خەدیجە لە ناو نازو نیعمەتدا گەورە بوو بوو، زۆریش ڕێز لێگیراو بوو، بەڵام ئایا دوو دڵ بوو؟! نەخێر، بەڵکو باوەڕی هێنا بە پەروەردگاری و پشتگیری لە پێغەمبەرەکەی کرد، بە ماڵ و سامانەکەی.. هەروەها بە بۆچوونە جوانەکانی.. بە هەوڵ و تێکۆشانەکانی.. کۆڵی نەدا، هەتا گەیشت بە پەروەردگاری..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (آتاه جبريل فقال: يارسول الله، هذه خديجة، قد أتتك ومعها إناء فيه إدام أو طعام أو شراب، فإذا هي أتتك، فاقرأ عليها السلام من ربها ومني، وبشّرها ببيت في الجنة من قصب، لاصخب فيه ولانصب).رواه مسلم. واتە: (جوبرائیل هات بۆ لام و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە خەدیجەیە دێت بۆ لات و قاپێك خواردن یان خواردنەوەی پێیە، کاتێك هات بۆ لات، سڵاوی پەروەردگارو سڵاوی منی پێبگەیەنە،وە مژدەشی پێ بدە بە ماڵێك لە بەهەشتدا کە دروست کراوە لە گەوهەرو مرواری، هیچ دەنگە دەنگ و ماندویەتیەکیشی تێدا نیە)..

ئەمە هەواڵی خەدیجە بوو.. یەکەم کەسە کە باوەڕی هێناو هاتە ناو ئیسلامەوە.. خودای پەروەردگار لێی ڕازی بوو..

⋆ دەی خوشکی بەڕێز تۆش شوێنی ئەو دایکە بەڕێزەت بکەوە، شوێنی کچەکانی بکەوە، بۆئەوەی لە بەهەشتدا بەهەمان شێوە خودای گەورە لە خانووەکەی خەدیجەت پێبەخشێت کە ناماندوێتی و نە ژاوەژاوەی تێدا نیە..

## لێدانی کۆتایی..!!

دایکی عەمماری کوڕی یاسر، سومەیەی کچی بەرگدروو.. ئەم ئافرەتە بەندەی ئەبوجەهل بوو.. کاتێك خودای گەورە ئیسلامی بۆ مرۆڤایەتی نارد، خۆی و هاوسەرەکەیی و کوڕەکەی موسڵمان بوون.. ئەبوجەهلیش زۆر بە خراپی ئازارو سزای دەدان و لەبەر گەرمی تیشکی خۆر دەیبەستنەوە، بە شێوەیەك خەریك بوو لە تینویەتیدا دەخنکان..

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ بەلایاندا تێپەڕی، کە ئەمان سزا دەدران و خوێن لە لاشەیان دەڕۆی و لێویان لە تینویەتیدا قڵیشا بوو.. هەروەها پێستی جەستەیان بەهۆی قامچی بێباوەڕانەوە شەقار شەقار بوو بوو.. لەم کاتەدا پێغەمبەری نازدار ﷺ کە بەم شێوەیە بینیانی زۆر بێتاقەت بوو.. ئازارو نارەحەتی پێگەیشت و فەرمووی: (ئەی خانەوادەی یاسر.. ئارام بگرن.. ئێوە لە بەهەشتدا بەیەك دەگەن و شوێنی

ئێوە بەهەشتەکانی پەروەردگارە..).. بەهۆی ئەم هەواڵە خۆشەوە دڵیان کەوتە جۆش‌و خرۆش.. لە پڕ فیرعەونی ئەو سەردەمە هات..

بەڵێ ئەبوجەهل هات.. زۆر تووڕە بوو.. ڕقی خۆی هەڵڕشت بە سەریاندا..وتی: دەی جنێو بە موحەممەدو خوداکەی بدەن.. بەڵام ئەمان زۆر ئارامگر بوون.. ئەم ستەمکارە خەنجەرێکی گەورەی کرد بە داوێنی سومەییەداو خوێن فیچقەی کرد.. سومەییە هاواری لێبەرزبۆوەو داوای یارمەتی دەکردو هاوسەرو کوڕەکەشی لە تەنیشتیەوە بەسترابوونەوە، لایان کردەوە بە لایدا.. ئەبوجەهلیش جنێوی ئەداو کوفری دەکرد، سومەییە لە حاڵەتی مردندا بوو.. لەو کاتەدا یادی خودای دەکردو هەردەیووت: الله أكبر، بەردەوام ئەبوجەهل بە خەنجەرەکەی دەستی لاشەی سومەییەی پارچە پارچە دەکرد..

سومەییە گیانی سپارد.. بەڵێ.. گیانی سپارد.. چەند بە جوانی گیانی خۆی کرد بە قوربان ئاینەکەی!! بە دڵنیاییەوە سومەییە لە خودای پەروەردگاری ڕازی بوو.. ئارامگر بوو.. زۆر بە چاکی باوەشی کرد بوو بە ئاینەکەیدا.. چونکە دەیزانی تەنها ئیسلامە بەندەکان، لە بەندەی بەندەوە، ئازاد دەکات بۆ بەندەی خودای پەروەردگار.. ئەیزانی تەنها ئیسلامە دەتوانێت لە جەورو ستەم‌و چەوسانەوەی ئەبوجەهل ڕزگاری بکات..

بەڵێ گیانی سپارد.. بەڵام قامچی‌و خەنجەری ستەمکارو خوێن ڕێژەکان نەیان توانی چۆکی پێدا بدەن..

## لە ئاوی ئاسمان ئاوی خواردەوەو تێر ئاو بوو..!!

بەڵێ.. ئافرەتانی پێشوو لە سەر بەڵاو نار

بوون کاتێك بە ئاسنی گەرم داخ دەکران.. ئارامگر بوون کاتێك لە هاوسەرو منداڵەکانیان جیادەکرانەوە.. هەموو ئەمانەشی لە پێناو خۆشەویستییان بۆ خوداو ئاینەکەیان بوو.. لە پێناوی بە گەورە زانینی خودای پەروەردگار.. بە هیچ شێوەیەك سازش کارییان نەدەکرد لە ئاینەکەیاندا..

جل‌و بەرگی باڵاپۆشییان‌واز لێنەدەهێناو بە سوکی سەیریان نەدەکرد.. شەرەف‌و ئابڕوویان دەپاراست‌و لە خراپەو بەدڕەوشتی بە دوور بوون.. ئەگەر لەم پێناوەشدا گیانی خۆیان بەخت بکردایەو نرخی ئەم قوربانیدانەیان گیان‌و ڕۆحی خۆشیان بووایە..

★ (ئوم شورەیکی ئەنصاری) هەر زوو موسڵمان بوو.. لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە لە شاری مەککەی پیرۆز موسڵمان بوون.. کاتێك هێزو توانای بێباوەڕانو لاوازی ئیماندارانی بینی، دەستی کرد بە بانگەوازو خەمی بڵاوبوونەوەی ئاینەکەی خستە سەر شانی خۆی.. ئەم ئافرەتە زۆر ئیمانی بەهێز بوو.. پەروەردگاری زۆر لەلا گەورەو بەرزو پیرۆز بوو..

ئەم ئافرەتە بە شێوەی نهێنی دەچووە لای ئافرەتە قورەیشیەکانو بانگی دەکردن بۆ ئیسلامو ئاگاداری دەکردنەوە لە بت پەرستی.. هەتا بێباوەڕەکانی مەککە پێیان زانیو زۆر بە توندی لێی تووڕە بوون.. لەبەرئەوەی ئەم ئافرەتە قورەیشی نەبوو، هەتا کەسو کاری پارێزگاری لێبکەن، لەبەرئەوە بێباوەڕەکان گرتیانو پێیانوت: ئەگەر لەگەڵ هۆزەکەتدا هاوپەیمان نەبوینایە، ئاواو ئاوامان لێدەکردی.. بەڵام لە مەککە دەرت دەکەین بەرەو لای هۆزەکەی خۆت..

ئەم ئافرەتەیان بەستەوەو پاشان خستیانە سەروشترێكو هیچیشیان لە ژێریدا بۆ ڕانەخست، بۆ ئەوەی ئازارو نارەحەتی زیاتری پێبگات.. پاشان سێ ڕۆژ بە ڕێگەدا ڕۆیشتنو نەخواردنو نەخوارنەوەیان پێنەدا، هەتاوەکو لە تینویەتیو برسێتیدا خەریك بوو گیانی لە دەست بدات، تەنانەت کە لە شوێنێك لایان دەدا بۆ حەوانەوە، خۆیان دەچونە ژێر سێبەرو ئەویان دەخستە بەر تیشکی گەرمی خۆر.

کاتێك لە ڕێگەدا بوون، لە شوێنێك لایانداو ئەم ئافرەتەیان لە سەروشترەکە دابەزاندو خستیانە بەر گەرماکەو خۆیان ئاویان خواردو بەشی ئەمیان نەدا..

تینویەتی زۆری بۆ ئەم ئافرەتە هێنا، شتێکی ساردی هەست پێکرد لە سەر سنگی.. کاتێك بە دەستی گرتی بینی کە دۆلکەیەك ئاوە، کەمێکی لێخواردەوەو پاشان بەرزبووەوە.. پاشان دۆلکەکە گەڕایەوەو لێی خواردەوەو بەرزبووەوە.. چەند جارێك ئاوی لە دۆلکەکە خواردەوەو دۆلکەکە بەرز دەبۆوە.. ئەوەندەی ئاو خواردەوە هەتا تێر ئاو بوو..

پاشان ئاوەکەی بە سەر جلو بەرگەکانیدا پرژاند..

کاتێك بێباوەڕەکان بە ئاگا هاتنەوەوویستیان بڕۆن، چوون بۆ لایو سەیریان کرد، شوێنەوارو تەڕایی ئاو بە لاشەو جلو بەرگەکانیەوە دیارەو لە دیمەنو شێوەیەکی زۆر جواندا بینیان.. سەریان سوڕما! چۆن چۆنی دەستی گەیشتووە بە ئاو، لە کاتێکدا بەستراوەتەوە!!



پێیانوت: کۆتو زنجیری دەستو قاچت کردەوە؟! ئەی لە ئاوەکەی ئێمەت خوارد؟!

وتی: نەخێر.. سوێند بە خودا!! بەڵکو لە ئاسمانەوە دۆلکەیەك ئاوم بۆ دابەزیو لێم خواردەوە هەتا تێر ئاو بووم..

هەندێکیان سەیری هەندێکیان کردووتیان: ئەگەر ڕاست بکات ئاینەکەی ئەو لە ئاینەکەی ئێمە باشترە!! لە ئاوو کەلو پەلەکانی خۆیان نزیك بوونەوە، بینیان ڕاست دەکات لە ئاوەکەی ئەمانی نەخواردۆتەوە.. هەموویان موسڵمان بوونو دەستو قاچیان کردەوەو ئازادیان کردو زۆر بە باشی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کرد..

بەڵێ.. هەموویان بەهۆی ئارامگری ئەم ئافرەتەوە موسڵمان بوون.. لە ڕۆژی دواییدا کاتێك (ئوم شورەیك) دێت، لە دەفتەری کردارەکانیدا ناوی چەندان پیاوو ئافرەتی تێدایە کە لە سەر دەستی ئەم موسڵمان بوون..

## ئافرەتێکی بەهەشتی..!!

بەڵێ.. مێژوو ناوی (ئوم شورەیك)ی لە یاد نەکردو تۆماری کرد.. مێژوو ناوی ئافرەتێکی تریشی بەهەمان شێوە تۆمار کرد بە ناوی (غمیصاء) کە دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە. ئەو ئافرەتەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە بارەیەوە دەفەرموێت: (چوومە بەهەشتەوەو گوێم لە خشپەیەك بوو لە بەردەممدا، کاتێك بینیم (غمیصاء)ی کچی ملحان بوو)..

ئافرەتێك لە سەرسوڕهێنەرترینی ئافرەتان.. سەرەتا وەکو هەر ئافرەتێکی تر لە سەردەمی نەفامیدا ژیاوەو شووی کردووە بە (مالیکی کوڕی نضر).. کاتێکیش ئاینی ئیسلام دەرکەوت، بەدەم بانگەوازی کۆمەڵێك لە ئەنصارەکانەوە چوو، هەر بە زوویی موسڵمان بوو لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە بەخێرایی باوەشیان بۆ ئیسلام کردەوە.. ئەم ئافرەتە بەڕێزە ئیسلامی خستە پێش چاوی هاوسەرەکەی بۆئەوەی موسڵمان بێت، بەڵام هاوسەرەکەی موسڵمان نەبوو، بەڵکو زۆریشی لێ تووڕە بوو..ئەم پیاوەویستی لە شاری مەدینە کۆچ بکات بەرەو شامو خێزانەکەشی بەرێت.. بەڵام خێزانەکەی ڕازی نەبوو.. بۆیە هاوسەرەکەی ڕۆیشتو لەوێ لەناوچوو.. ئەم ئافرەتەش چونکە ئافرەتێکی زۆر ژیرو جوان بوو، پیاوان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ ئەوەی بێنە خوازبێنی..

(ئەبو طلحە) پێش ئەوەی موسڵمان بێت هاتە داوایی‌و خوازبێنی لێکرد..

ئەمیش پێی‌وت: حەزەکەم شووت پێبکەم‌و نموونەی‌وەك تۆ ڕەت ناکرێتەوە، بەڵام تۆ پیاوێکی بێباوەڕیت‌و منیش ئافرەتێکی موسڵمان،.. ئەگەر موسڵمان بیت، ئەوا موسڵمان بوونەکەت مارەیی ئەبێت بۆ من‌و هیچی ترم لێت ناوێت..

(ئەبو طلحە) وتی: من ئاینی خۆم هەیە!!

ئافرەتەکەش وتی: ئەی (ئەبو طلحە) ئایا نازانی ئەو خودایەی کە تۆ دەیپەرستیت، بریتیە لەو دارەی کە لە زەویەوە دەڕوێت‌و فلانەکەسی حەبەشیش دایدەتاشێ‌و دروستی دەکات‌و دەیکات بە بت؟!

(ئەبو طلحە)وتی: بەڵێ، دەزانم..

ئافرەتەکەوتی: ئایا شەرم ناکەیت شتێکی ئاوا دەپەرستیت؟! ئەی (ئەبو طلحە) ئەگەر موسڵمان بیت، ئەوا من هیچ مارەییەکی ترم لە تۆ ناوێت..

ئەویش‌وتی: با بیرێکی لێبکەمەوە.. ڕۆیشت‌و پاشان هاتەوەووتی: (أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)، بۆیە ئەم ئافرەتە دڵی خۆش بوو، پاشان شووی پێکرد. هەرگیز هیچ مارەییەك‌وەك ئەم مارەییە بە نرخ‌و پیرۆز نەبووە.. مارەییەکەی بریتی بوو لە موسڵمان بوونی هاوسەرەکەی..

★ خوشکی ئیماندار.. سەیرکە چۆن خۆی لەلا کەم‌و بچوك بوو لە پێناوی ئاینەکەیدا.. لە پێناوی ئیسلامەکەیداوازی لە مافی خۆشی هێنا..

بەڵێ.. ئافرەتێك لە پێناوی بەرنامەیەکدا دەژی، ئەویش ئیسلامە.. چۆن پلەو پایەی بەرزو پیرۆز نابێت؟! چۆن نابێتە نموونەی ڕێنمایی بۆ خەڵکی؟! کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لە ماڵی (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری) لایداو مایەوە.. پۆل پۆل خەڵکی دەهاتنە خزمەتی. ئوم سولەیمیش لەو نێوانەدا بوو..ویستی شتێکی پێشکەش بکات.. هیچ شتێکی نەبوو، خۆشەویست تر لە بەرهەمی جگەری.. ئەنەسی کوڕی هێناو هاتە بەردەم پێغەمبەری خودا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە ئەنەسی کوڕمەو بەردەوام لە خزمەتدا دەبێت‌و خزمەتت دەکات.. پاشان ڕۆیشت.. ئەنەسیش لە خزمەتیدا مایەوەو شەوو ڕۆژ خزمەتی دەکرد.

## شەوێک لەگەڵ ئوم سولەیمدا..!!

ئەم ئافرەتە هەوڵو کۆششەکانی تەنها بۆ بەرچاوی خەڵکی نەبوو.. ئامۆژگاری خەڵکی نەدەکردو خۆی لە بیر بچێت.. لەماڵیشەوە ژیانی جێگەی سەرسورمان بوو.. گرنگیەکی زۆری دەدا بە هاوسەرەکەی.. ئوم سولەیم شوی بە (ئەبو طلحە) کردو خودای گەورە کوڕێکی پێبەخشین بە ناوی (ئەبو عومەیر)..

(ئەبو طلحە) ئەم منداڵەی زۆر زۆر خۆش دەویست، بەڵکو پێغەمبەری خوداش ﷺ خۆشی دەویست..

ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ بە لای منداڵەکەدا ڕۆیشتو بینی باڵندەیەکی پێیەو یاری لەگەڵ دەکات.. باڵندەکەش ناوی (نوغەیر) بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ یاریو قسەی خۆشی لەگەڵ منداڵەکەدا دەکردو پێی فەرموو: (یا أبا عُمَیر.. ما فَعَلَ النُغَیر).. پاشماوەیەك ئەم منداڵە نەخۆش دەکەوێتو باوکی زۆر بۆی بێتاقەت دەبێت، هەتا ڕۆژێك منداڵەکە بەردەوام نەخۆشیەکەی بەرەو زیادبوون دەچێتو باوکیشی بەهۆی کارێکەوە دەچێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺو زۆر دەمێنێتەوەو دوادەکەوێتو درەنگ دەگەڕێتەوە.. منداڵەکەش نەخۆشیەکەی زۆر زیاد دەکاتو گیانی دەسپێرێتو دەمرێت..

کاتێك چەند کەسێك دەست دەکەن بە گریان، دایکی ئەم منداڵە هێوریان دەکاتەوەو دەڵێت: تکایە مردنی ئەم منداڵە لە لای باوکی باس مەکەن، هەتا خۆم بۆی باس دەکەم..

دایکی منداڵەکە، لاشەی بێ گیانی جگەرگۆشەکەی بردە لایەکی ماڵەکەوەو دایپۆشیو خواردنو خواردنەوەی بۆ هاوسەرەکەی ئامادە کرد، کاتێك (ئەبو طلحە) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لێی پرسی: منداڵەکەمان چۆنە؟ ئافرەتەکەوتی: ئارامو لەسەرخۆیە.. هیواموایە کە حەسابێتەوە.. باوکی چوو بۆ لای منداڵەکە تا بیبینێ، بەڵام دایکی نەیهێشتو وتی: ئارامی گرتووە.. مەیجوڵێنەووازی لێبێنە با هەڵنەستێ..

پاشان خواردنو خواردنەوەی بۆ هاوسەرەکەی هێناو پاشان ئەوەی لە نێوان ژنو مێرددا ئەنجام دەدرێت، ئەنجامیاندا..

کاتێك هاوسەرەکەی بینی کە ئارامو لەسەرخۆیەو پشووی داوە، پێی وت: ئەی (ئەبو طلحە) ئەگەر کەسانێك شتێك لە ماڵێك بە ئەمانەت بخوازنو پاشان خاوەنی ئەو ئەمانەتە داوای بکاتەوە، ئایا ئەبێت نەیاندەنەوە؟!

(ئەبو طلحە) وتی: نەخێر!

ئوم سولەیم: وتی: ئایا سەیرە بەلاتەوە ئەگەر دراوسێکەمان کارێکیوا بکات!!

(ئەبو طلحە) وتی: چۆن؟!

خێزانەکەی وتی: شتێکیان بە ئەمانەت خواستو ماوەیەکی زۆریش لایان مایەوە، بەڵام کاتێك داوای ئەمانەتەکەیان لێکرایەوە، نەیاندایەوەو ڕێگرییان کرد!!

(ئەبو طلحە) وتی: بە ڕاستی کارێکی خراپیان ئەنجامداوە!!

ئوم سولەیم وتی: دەی ئەوە منداڵەکەتە، سپاردەو ئەمانەتی خودا بوو لە لای ئێمە، خودای پەروەردگار بۆ لای خۆی..واش دابنێ کە ئێستا منداڵەکەت لە لای خودای میهرەبانە..

(ئەبو طلحە) هاواری کردووتی: ئەمشەو چۆن توانیت بە سەرمدا زاڵ بیتو بە ئارامگرتنەکەت سەرکەویت بە سەرمدا؟!

پاشان منداڵەکەی کفنو دفن کرد.. بۆ سبەینێ بەیانی بۆ پێغەمبەری خودای ﷺ باس کردو پێغەمبەریش ﷺ داوای خێرو بەرەکەتی بۆ کردن..

ئەو کەسەی ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: لە دوای ئەم ڕووداوە ڕۆژێك لە مزگەوتدا حەوت منداڵم بینی قورئانیان دەخوێند.. هەر حەوتیان منداڵی (ئەبو طلحە)و ئوم سولەیم بوون..

⋆ خوشکی ئازیز: سەیرکە چۆن ئاینەکەی بە بەرزی ڕادەگرێو ڕێزی دەگرێت.. خۆی بە دوور گرت لە یەخەو جلو بەرگ دادڕین..هەروەها لە ڕنینەوەی سەرو قژو دەمو چاوی.. لە هاوارو ناڵەو نا سوپاسگوزاری..ئایا ئێوە ئافرەتێکتان بینیوە، جگەرگۆشەکەی لەبەر دەستیدا بمرێت، بەڵام ئەم هەستێت بە خزمەتکردنی هاوسەرەکەیو خۆی بۆ ئامادەو ڕازاوە بکات؟! ئایا هیچ نەرمو نیانیەکتان زیاتر لەم نەرمو نیانیە بینیوە؟!

## ئافرەتێک هاوسەرەکەی پەروەردە دەکات..!!

ئافرەتێك خاوەنی ئەم باوەڕە پتەوە بێت.. خاوەنی ڕاستگۆیی.. بۆئەوەی خێرو چاکەکانی بڵاو بێتەوە بە سەر کەسو کاریدا.. بە دڵنیاییەوە منداڵەکانی چاك پەروەردە دەبن.. کچەکانی نموونەی کچانی ڕەوشت بەرز دەردەچن.. هەروەها کاریگەری چاکی لە سەر هاوسەرەکەی دەبێت.. جێگەی سەرسوڕمان نیە، کە (ئەبو طلحە) لە دوای ئەوەی ئەم ئافرەتە بوو بە هاوسەری، پلەو پایەی بەرز ببێتەوە..



ئوم سولەیم هانی هاوسەرەکەی دەدا بۆ بانگەوازو تێکۆشان.. هەروەها بۆ ملکەچ بوون لە ئاست فەرمانەکانی پەروەردگار.. کاتێك جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە.. (ئەبو طلحە) لەگەڵ تێکۆشەرە موسڵمانەکاندا، دەرچوو بۆ بەشداری کردن لەو جەنگەدا.. موسڵمانەکان تووشی تاقیکردنەوەو بەڵاو نارەحەتیەکی گەورە هاتنو شڵەژان رووی تێکردنو ژمارەیەکی زۆریشیان لێ شەهید کرا.. بێباوەڕەکان بەرەو رووی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتنو دەیانویست شەهیدی بکەن.. کۆمەڵێك لە باوەڕداران لە دەوری پێغەمبەری خودا ﷺ کۆبوونەوە، کە زۆربەیان بریندارو برسیو تینوو بوون.. خوێنیان لەبەر دەڕۆییو پارچە پارچە گۆشت لە جەستەیان هەڵدەوەری.. ئەم باوەڕدارانە، جەستەی خۆیان دەخستە بەر ڕمو تیری بێباوەڕەکان لە پێناو پارێزگاری کردن لە پێغەمبەری نازدار ﷺ..

(ئەبو طلحە) سنگی بەرزکردەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا نابێت تیرێکت بەرکەوێ.. لە پێناوتا گیانو جەستەم دەکەمە قوربانی.. بەردەوامیش پارێزگاری لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکردو لە کوشتاری بێباوەڕەکاندا دەورێکی گەورەی بینی.. بێباوەڕەکان لە هەموو لایەکەوە پەلاماری (ئەبو طلحە)یان دا، یەکێ بە شمشێر.. یەکێ بە تیر.. سێیەمیان بە خەنجەر.. لە چەندین لاوە برینداریان کردو لەبەر زۆری برینەکانی کەوتە زەوی..(ئەبو عوبەیدە) بە خێرایی هات بۆ لای.. کاتێك (ئەبو طلحە) بورابۆوە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: براکەتان هەڵگرنو دەستتان پێوەی بێتو ئاگاتان لێی بێت. (ئەبو طلحە)یان هەڵگرت.. یازدە تا نۆزدە برینی پێوە بوو..

بەڵێ.. (ئەبو طلحە) ئاڵای ئیسلامی بەرز ڕاگرت..

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: (لصوت أبي طلحة في الجيش، خيرٌ من فئة). واتە: (دەنگو هاوارو سەدای (ئەبو طلحە) لە سوپایەکدا، باشترە لە کۆمەڵە کەسێك). ئەوە دەنگی بێت لە سوپاو جەنگدا..

ئەی ئەبێت هێزو تێکۆشانی چۆن بێت..؟!

## لە ئەرویجەوە بۆ ئەفەریقا..!!

★ خوشکی بەڕێز.. سەیرکە چۆن ئافرەتانی ئەمڕۆ لە سەرکەوتنو خەم خواردن لە ئاینەکەیان دوورکەوتوونەتەوە! بەڵکو بە ئاشکرا سەرپێچیو تاوانیان تێدا دەبینی! چەندان وێنەی خراپ.. پەیوەندی نادروست.. سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن لە جلو بەرگیاندا.. لە چوونەدەرەوەو بازاڕدا.. لە تێکەڵی لەگەڵ پیاواندا.. ئەمانەش هەموویان

نیشانەن بۆ نزیك بوونەوەو دابەزینی سزای پەروەردگار.. ئەم هەموو بێ فەرمانیانەی خودای پەروەردگار دەبینێت، لە ناو خوشکانو هاوەڵانیدا.. کە چی نکوڵی لێناکاتو بەرەنگاریان نابێتەوەو هەوڵ نادات بیان گۆڕێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (هەر کەسێك خراپەو نا شەرعیەکی بینی با هەوڵ بدات بیگۆڕێت...)..

* خوشکی بەڕێز: ئایا بەپێی توانای خۆت، هەڵساویت بە گۆڕینی ئەو بێفەرمانیانەی کە دەیان بینی؟! خۆزگە دەتزانیو هەستت دەکرد کە حاڵت چۆن دەبێت لە ڕۆژی دواییدا.. کاتێك لە دونیادا هۆگری خۆشەویستو هاوڕێکانت بوویت.. ئەو کاتەی ئەوانت دەبینی لە بێفەرمانی خوادا بوون.. ئەو کاتەی دەتبینین کە خەریکی ئەنجامدانی تاوانن.. تۆش پێت نەدەوتنوازبهێنن.. ئامۆژگاریت نەدەکردن.. سزای خوداو ڕۆژی دواییت بیر نەدەخستنەوە..

* خوشکی ئازیز: سەیری هەوڵو خۆماندوو کردنی ئافرەتانی بێباوەڕ بکە، چۆن هەوڵ بۆ بڵاوبوونەوەی ئاینەکەی خۆیان دەدەن.

* یەکێك لە بانگخوازان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بۆ گەشتێکی بانگخوازی چووین بۆ لای ئاوارەکانی ئەفەریقا.. ڕێگەکە زۆر نارەحەتو ترسناك بوو.. تووشی ماندووبوونێکی زۆر هاتین.. لەبەردەمو پێشمانەوە، هیچ شتێکمان نەدەبینی، تەنها لمی بیابان نەبێت.. تووشی هەر ئاوەدانیو لادێ یەکیش دەبووین، لە بوونی جەردەو ڕێگر ئاگاداریان دەکردین، پاشان خودای گەورە بۆی ئاسان کردینو لە شەودا گەیشتینە لای ئاوارەکان..

ئەو ئاوارانە زۆر خۆشحاڵ بوون بەوەی کە چووم بۆ لایانو خێمەیەکیان بۆ ئامادە کردم، کە ڕاخەرێکی کۆنو ڕزیوی تێدا بوو..لەبەر هیلاکیو ماندوویێتی، لە سەر جێگەکە پاڵ کەوتمو کەوتمەووردبوونەوەو لێکدانەوەی ئەم گەشتە..

ئەزانی خەیاڵی چیم دەکردو بیرم لە چی دەکردەوە؟! هەستم بە شانازی دەکرد.. بەڵکو هەستم بە سەرسورمان دەکردو خۆم زۆر لەلا بەرزو گەورە بوو!! کێ لە پێش مندا هاتووە بۆ ئەم شوێنە؟! ئەوەی من ئەنجامم داوە، کێ تا ئێستا ئەنجامیداوە؟! کێ دەتوانێت لە بەرامبەر ئەم هەموو نارەحەتیەدا ئارام بگرێت؟! بەردەوام شەیتان هەوڵی ئەوەی دەدا کە لە خۆم بایی بمو خۆم بە گەورە بزانم..

بۆ ڕۆژی دواییو لە بەیانیدا، بە ناوچەکەدا دەگەڕام.. هەستا گەیشتم بە بیرێکی ئاو، کە لە شوێنی ئاوارەکانەوە دوور بوو، کۆمەڵێك ئافرەتم بینی مەنجەڵو سەتڵی ئاویان

له سه‌ر سه‌ریان هه‌ڵگرتبوو.. له نێوان ئافره‌ته‌کاندا تێبینیم کرد که ئافره‌تێکی سپی پێستیان تێدایه‌!! گومانم وابوو، یه‌کێك له ئافره‌ته ئاواره‌کان تووشی نه‌خۆشی به‌ڵه‌کی هاتووه‌..

پرسیارم له هاورێکه‌م کردو ئه‌ویش وه‌ڵامی دامه‌وه که ئه‌وه ئافره‌تێکی مه‌سیحی نه‌رویجیه‌و ته‌مه‌نی هه‌ر سی ساڵێك ده‌بێت.. نزیکه‌ی شه‌ش مانگه لێره‌دا نیشته‌جێیه‌.. هه‌مان جل و به‌رگی ئێمه له‌به‌رده‌کات.. له هه‌مان خواردنی ئێمه‌ش ده‌خوات.. هاوده‌م و هاوکارمانه له‌ئیش و کاره‌کانماندا.. هه‌موو شه‌وێك ئافره‌ته‌کان کۆ ده‌کاته‌وه‌و له‌گه‌ڵیاندا ده‌دوێت و فێری نوسین و خوێندنه‌وه‌یان ده‌کات.. جارجاره‌ش فێری سه‌مایان ده‌کات.. ده‌ست به سه‌ر سه‌ری چه‌ندان هه‌تیودا ده‌هێنێت و ئازاری نه‌خۆشه‌کان که‌م ده‌کاته‌وه‌!!

بیرم له حاڵی ئه‌م ئافره‌ته ده‌کرده‌وه، کێ بانگی کردووه‌، که بێت بۆ ئه‌م ناوچه دووره ده‌سته‌، له کاتێکدا گومڕاو سه‌رلێشێواوه‌.. چی‌وای لێکردووه‌و پاڵی پێوه‌ناوه ئه‌و شارستانیه سه‌وزو خۆشه‌ی ئه‌وروپاواز لێبێنێت؟! چی ئه‌و هێزو ئارامگریه‌ی داوه‌تێ، که له‌گه‌ڵ ئه‌م هه‌موو پیرو په‌ککه‌وتانه‌دا بمێنێته‌وه‌، له کاتێکدا ئه‌م ئافره‌ته له ترۆپکی لاوێتیدایه‌؟!

خوشکی ئازیز.. ئایا له‌م کاته‌دا خۆت له لا بچوك نیه‌؟! ئه‌مه ئافره‌تێکی سه‌رلێشێواوه‌.. که چی هه‌وڵده‌دات و ئارام ده‌گرێت له‌سه‌ر ئه‌و هه‌موو ناره‌حه‌تیه‌.. له کاتێکدا له سه‌ر گومڕایی و شتێکی پووچ و بێ بنه‌مایه‌!! به‌ڵکو چه‌ندان ئافره‌تی مه‌سیحی گه‌نج له ئه‌مه‌ریکاو به‌ریتانیاو فه‌ره‌نساوه دێن بۆئه‌وه‌ی له ئه‌فه‌ریقادا له ژێر که‌پرێکی داردا یان له خانوویه‌کی قوڕدا ژیان به‌رنه‌سه‌ر.. له خواردنی ئه‌وان ده‌خۆن و خۆیان جیاناکه‌نه‌وه‌..وه‌کو ئه‌وان له ئاوی ڕووباره‌کان ده‌خۆنه‌وه‌.. چاودێری منداڵه‌کانیان ده‌که‌ن.. چاره‌سه‌ری نه‌خۆشی ئافره‌ته‌کانیان ده‌که‌ن.. ئه‌گه‌ر ده‌یانبینیت کاتێك ده‌گه‌ڕێنه‌وه بۆوڵاته‌که‌ی خۆیان.. شێوه‌یان گۆڕاوه‌.. پێستیان زبرو دڕ بووه‌.. لاشه‌یان لاواز بووه‌.. به‌ڵام هه‌موو ئه‌م شتانه‌یان له‌بیر ده‌چێت، له پێناو خزمه‌ت کردن به ئاینه‌که‌یان.. به ڕاستی سه‌یره‌!!

ئه‌و هه‌موو ماندوو بوون و هه‌وڵ و کۆششه‌ش له پێناوی ئه‌وه‌دایه که غه‌یری خودای په‌روه‌ردگار بپه‌رسترێت.. ﴿ وَلَا تَهِنُوا فِي ابْتِغَاءِ الْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ اللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ النساء/١٠٤ واته‌: (ئه‌گه‌ر ئێوه ئێش و ئازارو ماندوێتی و بریندارێتان بۆ پێش بێت، بۆ ئه‌وانیش هه‌ر پێش دێت، به‌ڵام

ئەوەی ئێوە بە ئومێدو بەتەمان لە لای خودا دەســـتتان بکەوێت (لە بەهەشتدا) ئەوان بەتەمای نین، خودای گەورەش هەمیشەو بەردەوام زاناو دانایە)..

## کەسێکی تر دەڵێت..

لە ئەڵمانیا بووم‌و ڕۆژێك لە دەرگاکەمیاندا.. ئافرەتێکی گەنج لەو دیو دەرگاکەوە بانگی دەکرد..

پێم‌وت: چیت دەوێت؟

وتی: دەرگاکە بکەرەوە..

وتم: من پیاوێکی موسڵمانم‌و کەسیشم لەلا نیە، دروست نیە بێیتە ژوورەوە بۆ لام..

ئافرەتەکەوتی: من لە کۆمەڵەیەکی ئاینیم.. دەرگاکەم لێبکەرەوە، ئەم نوسراوو بڵاوکراوانەم لێ‌وەرگرە..

وتم: هیچم ناوێت.. پشتم کردە دەرگاکەو چووم بەرەو ژوورەکەم..

ئافرەتەکە کە زانی دەرگای لێناکەمەوە دەمی هێنایە لای کونی دەرگاکەو پاشان دەربارەی ئاینەکەی کەوتە قسەو بۆ ماوەی دە خولەك بنەماکانی ئاینەکەی بۆ باس کردم‌و بۆی شی کردمەوە.. کاتێك لێ بوومەوە، بەرەو دەرگاکە چووم‌و پرسیارم لێکردووتم: بۆچی ئاوا خۆت هیلاك‌و ماندوو دەکەیت؟!وتی: من ئێستا زۆر هەست بە حەوانەوەو ئارامی دەکەم، لەبەرئەوەی هەرچی لە توانامدا بوو بۆ ئاینەکەم، ئەنجامم دا.. ﴿إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمونَ﴾ النساء/١٠٤

## ئەی تۆ، ئایا ڕۆژێک پرسیارت لە خۆت کردووە..؟!

چیت پێشکەش کردووە بەم ئیسلامە؟ چەند ئافرەت لە سەر دەستی تۆدا گەڕاونەتەوەو تەوبەیان کردووە؟ چەندێك ماڵ‌و سامانت لە پێناوی خوادا بەخشیوە بۆ ڕێنمایی کردنی ئافرەتان؟

هەندێ لە ئافرەتانی چاکەکار دەڵێن: لە خۆم ڕانابینم‌و ناتوانم هەنگاو بنێم بۆئەوەی بانگەوازی خەڵکی بکەم بۆ لای ئاینی خودا.. هەروەها بۆ ڕێگری لە تاوان‌و سەرپێچی..

سەیرە!! ئەی بۆ ئافرەتێکی گۆرانی بێژ لە خۆی ڕادەبینێ‌و دەتوانێت لە بەرامبەر

چاوی دەیان هەزار کەسەوە گۆرانی بڵێت‌و ناشڵێت: من دەترسم‌و شەرم دەکەم؟!
ئەی بۆ ئافرەتێکی سەماکەری بێ ڕەوشت شەرم ناکات؟! جەستەی خۆی دەردەخات بۆ هەزاران کەس!! هیچ دوو دڵ‌و شەرمەزاریش نیە؟! بەڵام تۆی بەڕێز کاتێك ئەتەوێت ئامۆژگاری کەسێك بکەیت یاخود بانگەوازی کەسانێك بکەیت بۆ لای ئاینی پەروەردگار، ئەوا شەیتان تەفرەت دەدات‌ووات لێدەکات ئەو کارە ئەنجام نەدەیت..
هەندێك لە ئافرەتان نەك ئامۆژگاری خەڵکی ناکەن، بەڵکو سەرپێچی‌و تاوان بۆ کەسانی تر دەرازێنێتەوەو جوانی دەکەن! گۆڤاری خراپ‌و ئابرووبەر لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕ دەکەن.. کاسێتی گۆرانی.. بانگ کردنی کەسانی تر بۆ شوێنی سەرپێچی‌و تاوان.. ئەمانەش هەمووی هاوکاری‌و یارمەتیدانی خراپەو تاوانە،وەڵامدانەوەی بانگەوازی شەیتان‌و دارو دەستەکەیەتی.. بە دڵنیایشەوە ئەم خۆشەویستیەیان دەگۆڕێت بۆ دوژمنایەتی‌و ڕق لێبوونەوە.. هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ الزخرف/٦٧ واتە: (هەموو دۆست‌و برادەرێك لە ڕۆژی دواییدا دەبن بە دوژمنی یەکتر و هەموو ڕقیان لە یەك دەبێتەوە، جگەلەو کەسانە نەبێت کە لە سەر بنچینەی تەقواو خواناسین کۆبوونەتەوەو برایەتیان پێك هێناوە)..

ئا ئەمەیە حاڵی ئەو کەسانە لە ڕۆژی دواییدا.. جل‌و بەرگی شەرمەزاری‌و پەشیمانی لەبەردەکەن..

لە کوێ.. لە ئاگردا.. هەروەك خودای پەروەردگار لە بارەی کۆمەڵێك لە یاخی بووانەوە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾العنكبوت/٢٥ واتە: (پاشان لە ڕۆژی دواییدا یەکتر کافر دەکەن‌و یەخەی یەکتر دەگرن، هەندێکشتان نەفرین لە یەکتر دەکەن، سەرەنجامیش شوێن‌و جێگەی دیاریکراوتان ناو ئاگرە، هیچ ڕزگارکەرێکشتان نیە)..

بەڵێ.. هەندێکیان، هەندێکیان بە نەفرین دەکەن.. ئەو هاوەڵ‌و هاوڕێیانەی کە لە ژیانی دونیادا پێکەوە دادەنیشتن‌و قاقا پێدەکەنین، لە ڕۆژی دواییدا بە یەکتر دەڵێن: نەفرینی خودات لێبێت، تۆ منت پەلکێش کرد بۆ دڵداری‌و خراپەکاری..

ئەوەی تر هاوار دەکات‌و دەڵێت: نەفرینی خودا لە تۆ بێت.. تۆ کاسێتی گۆرانیت بۆ من دەهێنا..

ئافرەتی یەکەم وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: بەر نەفرینی خودا بکەویت.. تۆ جل‌و

بەرگی ڕووتو ناشەرعیت لە لای من جوانو ڕازاوە دەکرد..

ئافرەتی دووەم وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: دەك بە نەفرەت بیت.. تۆ چاوساغی من بوویتو هەر تۆش منت بەرەو ڕێگەی خراپ برد..

سەیرە!! چۆن پێکەنینەکانیان ماڵئاواییان لێکردن!! چۆن بەریەك کەوتنو چرپەو قسە خۆشەکانیان گۆڕان بە نەفرینو جنێوو قسەی ناشیرین!!

بەڵێ.. ئەمڕۆ یەکتر بە نەفرین دەکەن.. لەبەرئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆ ئامۆژگاریو کاری خێر لە دەوری یەکتر کۆنەبوونەوە.. بەڵام لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ یەکتر کۆدەبنەوە.. بۆ کوێو لە کوێ کۆدەبنەوە؟! لە ئاگردا.. ئەو ئاگرەی هاوارو ناڵەو نرکەی کپ نابێتەوە.. گڕو بڵێسەو گەرمیەکەشی سارد نابێتەوە، تەنها بەویستی خودا نەبێت..

## ئافرەتەکانمان ئەمڕۆ لە کوێن..؟!

ئەمڕۆ ئافرەتەکانمان لە کوێن؟! بۆ ڕێگەو ڕێبازی ئافرەتانی چاکەکار ناگرنەبەر؟! زۆرێك لە ئافرەتان ئەمڕۆ دەکەونە ناو سەرپێچیو بێ فەرمانی خوداوە.. لە جلو بەرگیاندا.. لە گفتوگۆو قسەکانیاندا.. خۆ ئەگەر ئامۆژگاری یەکێکیان بکەیت، ئەوا دەڵێت: هەموو ئافرەتێك بەو شێوەیە دەکات.. ناتوانێت سەرپێچی ئەو کەسانە بکات.. بەڵام لای ئاساییە، ئەگەر بێ فەرمانی خودای پەروەردگاری بکات..

پاكو بێگەردی بۆ خودا!! کوا هێزو توانات؟! کوا ئارامگریت لە سەر بنەماکانی ئاینەکەت؟! خۆ ئەگەر ئافرەتێك توشی کەمترین تاقیکردنەوەو نارەحەتی ببێت، ئەواواز لە ملکەچیو پەرستنی خودای پەروەردگار دێنێتو ملکەچی شەیتان دەبێت!! ئەی کوا ملکەچیت بۆ فەرمانەکانی خودا؟!

خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾ الأحزاب/٣٦ واتە: (بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێکی ئیماندار دروست نیە، کاتێك خوداو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی، ئەوە بە ڕاستی بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە)..

کوان ئەو ئافرەتە گەنجە گاڵتەچیانە؟! ئەوانەی خۆیان دەخەنە بەر نەفرینی خودای گەورە.. ئەوانەی جلو بەرگو عاباکانیان دەدەن بە سەر شانیانداو خەڵکیووردو درشتی شانو جەستەیان دەبینن.. سەرەڕای ئەوەی خۆیان بە پیاوان دەچوێنن!! زۆرێك جلو بەرگ

لەبەردەکەن لە هەمان جل‌و بەرگی پیاوان.. زۆرێك هەڵسوکەوت دەکەن‌وەکو پیاوان!!

★ خوشکی ئازیز: بزانە هەر ئافرەتێك خۆی بە پیاوان بچوێنێت، ئەوا بەر نەفرەتی خودای پەروەردگار دەکەوێت.. ئەمرۆ ئافرەتان چەندان جل‌و بەرگ لەبەردەکەن کە جل‌و بەرگی پیاوانن..وەك پانتۆڵ‌و تیشێرتی قۆڵ کورت‌و کراسی کورتی پیاوان‌و ... هتد..

کەسانێکی تریش بەر نەفرەتی خودای پەروەردگاردەکەون، لەوانەش: ئەو کەسانەی کە خاڵ لە سەر جەستەیان دەکوتن.. لە سەر ڕوخساریان بە شێوەی خاڵی جیاواز جیاواز .. یاخود لە شێوەی‌وێنەدا خاڵ لە سەر لاشەیان دەکێشن (وەکو ئێستا لە ناو گەنج‌و لاوەکاندا هەیە بە ناوی تاتۆ)، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (لعن الله الواشمة والمستوشمة). واتە: (نەفرەتی خودا لەو ئافرەتەی کە خاڵ دەکوتێت‌و لەو ئافرەتەش کە بۆی دەکوتێت)..

هەروەها نەفرەتی خودا کراوە لە سەر ئەو کەسانەش کە قژی دەست کرد لە سەر دەنێن.. هەروەها ئەو کەسانەش کە دروستی دەکەن.. ئەو ئافرەتانەی کە باسمان کردن، بە نەفرین کراون لە لایەن پەروەردگاری بە سۆزو میهرەبانەوە..

ئایا دەزانیت بە نەفرەت کراو مانای چیە؟!

واتە: دوورخراوەو دەرکراو لە سۆزو بەزەیی خودا!! دەرکراو لە ڕێگەی بەهەشت!! ئایا ڕازی دەبیت لە بەهەشت دەربکرێیت؟! بەهۆی ئەو مووانەی کە لە برۆتی دەکەیتەوە.. یان بە هۆی جل‌و بەرگێك کە لە جل‌و بەرگی پیاوان دەچێت.. یان بەهۆی کێشانی چەند خاڵێك لە سەر لاشەو ڕوخسارت..

## بێبەشکراوەکان..!!

شوێن کەوتووانی ئارەزووو شەیتان،وا لە ئافرەتان دەکەن، کە خۆیان بڕازێننەوە، ئەگەر بێت‌و ئەو خۆڕازاندنەوەیەش ببێتە هۆی بەرکەوتنی نەفرینی خودای پەروەردگار..

یەکێکی تر لەو کارانەی کە ئەنجامدانی دەبێتە هۆی بەرکەوتنی نەفرینی خودا، بریتیەلە لێکردنەوەی مووی برۆ، یاخود باریك کردنەوەی.. جا بە لێکردنەوەو هەڵکەندن بێت، یان بە تاشینی.. ئەمەش هێنانەدی پەیمانەکەی شەیتانە کەبە خودای گەورەی وت: ﴿ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ

اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴾ النساء/١١٩ واته: (سوێند بێت بە تۆ گومڕایان دەکەم‌و بە ئاوات‌و خەیاڵی پووچەوە سەرگەرمیان دەکەم‌و خۆم فەرمانیان پێدەدەم‌و هانیان دەدەم‌و ئەوجا ئەوانیش گوێی ئاژەڵەکانیان دەبڕن، هەروەها فەرمانیان پێدەدەم کە دەستکاری دروست کراوەکانی خودا بکەن‌و بیگۆڕن، جا ئەوەی لە جیاتی خودا شەیتان بکاتە پشتیوانی خۆی، ئەوە بە ڕاستی دووچاری زیان‌و خەسارەتمەندییەکی ئاشکرا بووە)..

عبداللەی کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو ئافرەتانەی بە نەفرەت کردووە کە خاڵ لە سەر لاشەیان دەکوتن،وە ئەوانەش کە بۆیان دەکوتن، هەروەها ئەو ئافرەتانەش کە برۆیان هەڵدەگرن‌و ئەوانەش کە بۆیان هەڵدەگرن‌و بۆیان لێدەکەنەوە، ئەوانەی کە دەستکاری دروست کراوەکانی خودا دەکەن‌و دەیان گۆڕن)..

زۆر بە داخەوە ئێستا دیاردەی لێکردنەوەو باریك کردنەوەی موی برۆ (برۆ هەڵگرتن) لە ناو ئافرەتاندا زۆر زۆر بووە.. تەنانەت زۆرێك لە ئافرەتە بالاپۆشەکانیش ئەم کارە ئەنجام دەدەن!! زۆرێك لە ئافرەتانی بە ناو بالاپۆش دەبینی کە سەرپۆشیان داوە بە سەریاندا، بەلام پانتۆڵ‌و جل‌و بەرگی کورت‌و تەسك لەبەردەکەن!! یان سەرپۆشیان داوە بە سەریاندا، بەلام گەردن‌و سنگ‌و ملیان بە دەردەخەن!! ئایا ئەم ئافرەتانە خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، یان پەروەردگاریان؟! پەنا بە خودا!! با دڵنیا بن خودای پەروەردگار هەڵناخەڵەتێنرێت..

★ خوشکی بەڕێز: چۆن کارێك ئەنجام دەدەیت کە ببێتە هۆی ئەوەی بەر نەفرەتی خودا بکەویت؟! ئەی خۆ تۆ لە نوێژەکانتدا.. لە دۆعاو پارانەوەکانتدا.. داوای لێخۆشبوون‌و لێبوردن لە خودای پەروەردگارت دەکەیت؟! ئایا ئەمە پێچەوانەی‌وتەکانت نیە لەگەڵ کردەوەکانت؟! داوای سۆزو بەزەیی لە خودا دەکەیت‌و کۆمەڵێك کردارو ڕەفتاریش ئەنجام دەدەیت کە خودا ئەنجامدەرانی ئەو کارانەی بە نەفرەت کرددوە؟!

بە ڕاستی سەیرە!! زانایان‌و شارەزایانی ئەم ئاینە پیرۆزە ئەم کارانەیان قەدەغە کردووە، زیاتر لە بیست فتوام لە بەردەستدایە دەربارەی قەدەغە کردن‌و حەرام کردنی ئەم کارانە..

کاتێك دەڵێیت باوەڕم بە خوداو بە بەرنامەکەی هەیە، دەی دەبێت ملکەچی فەرمانی پەروەردگار بیت‌و دووركەویتەوە لەو کارانەی کە داوات لێدەکات لێیان دووركەویتەوە.. ئەو کارانەی کە باسمان کردن‌وەك: خاڵ کوتان.. برۆ هەڵگرتن.. جل‌و بەرگی تەسك‌و تەنك‌و لەبەرکردنی جل‌وبەرگی پیاوان‌و.....هتد... کاری بێباوەڕانە، هەر کەسیش خۆی بچوێنێت بە کۆمەڵە کەسانێك یان بە هۆزو نەتەوەو گەلانێك و کارو ڕەفتاری ئەوان

ئەنجام بداتوەك ئەو كەسانەی لێدێتو لەوانە. خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ﴾ الصافات/٢٢واتە: (خودای گەورە فەرمان بە فریشتەكان دەكات كە هەموو ئەوانەی ستەمیان كردووە كۆبكەنەوە، خۆیانو هاوسەرانیان، خۆیانو هاوشێوەكانیانو ئەو شتانەش كە دەیانپەرستن)..

هەر كەسێك چ كۆمەڵو نەتەوەیەكی خۆش بوویێت، یان كێی خۆش بوویێت، لەگەڵ ئەواندا حەشر دەكرێت..

★ خوشكی ئازیز: مەڵێ زۆرێك لە ئافرەتان ئەو كردارە نەشیاوو قەدەغە كراوانە ئەنجام دەدەن.. دەی زۆرێك لە ئافرەتان بت دەپەرستن!! ئایا تۆش ئامادەیوەك ئەوان بت بپەرستیت؟! زۆرێك لە ئافرەتان خاچ لە مل دەكەن!! ئایا تۆشوا دەكەی؟! زۆری ئەو كەسانەی كە لە خودا یاخی دەبنو سەرپێچی خودا دەكەن، نابێتە پاساوو بیانوو بۆ تۆ لە لای خودای پەروەردگار. تۆ لێپرسراویت لە كارو كردەوەكانی خۆت بە تەنها.. هەروەك لە پشتی باوكتدا بە تەنها بوویت.. پاشان لە سكی دایكیشدا هەر بە تەنها بوویت.. بە تەنهاش لە دایك بوویت.. بە دڵنیایشەوە بە تەنها دەمریت.. لەرۆژی دواییشدا بە تەنها تۆماری كردارەكانتوەردەگریت.. بە تەنهاش لە بەردەم خودای باڵا دەستدا رادەوەستێنرێیتو پرسیارو لێپرسینەوەت لێدەكرێت.. خودای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ★ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ★ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا﴾ مریم/٩٣-٩٥ واتە: (هیچ كەسێك نیە لە ئاسمانەكانو زەویدا، كە بەندەی ملكەچی خودای میهرەبانی نەبێت★ سوێند بە خودا بە بێگومان هەر هەموویانی سەرژمێر كردووەو یەك یەكی ژماردوون (كەسی لێوون نابێت) هەر هەموویان لە رۆژی دواییدا دێنە پێشەوە بۆ لای پەروەردگاریان بە تاكو تەنها★ یەكەیەكەی ئەو خەڵكە بە تاكو تەنهایی دێنو ئامادە دەكرێن لە بەردەم دادگای پڕ لە دادوەری خوادا)..

## لە سەر شەپۆلی دەریا..

زۆرێك لە ئافرەتانی ئیماندار لەگەڵ ئەو شەپۆلانەدا دەڕۆنو وون دەبن.. سەرەتا لە باڵاپۆشیەكەیانەوە دەست پێدەكەنو لە جلو بەرگەكانیاندا كەم كەم ساردبوونەوەو كاڵبوونەوە دەردەكەوێت.. پاشان رازی دەبن شوێن ئەو شتانە بكەون كە خراپەكاران دروستی دەكەنو بەكاری دەهێنن.. بەڵكو ئەو شتانەی كە بێباوەران وێنەو شێوازی بۆ دادەڕێژن، وەك ئەو جلو بەرگانەی كە بۆ جوانكاریو دەرخستنی جوانیەكانە، نەك

بۆ خۆداپۆشین..

سەیرە!! چۆن رازی دەبیت کە تۆی بەڕێزوئازیز وەکو بووکە شووشەوابیتو چۆنو چیان بوویێت ئەوەت لەبەربکەن!! ئەم جلو بەرگە فلان نەخشو نیگاری لە سەر کێشراوە.. ئەمیان ئەدرێت بە سەرشاندا.. ئەمەیان کەمەرەکەی بەو شێوەیەیە.. ئەمەیان فلان مۆدێلە... هتد..

* خوشکی بەڕێز: بزانە کە بالاپۆشی بۆ ئەوەیە جوانی ئافرەتان لە پیاوان بشارێتەوە.. خۆ ئەگەر جلو بەرگەکە خۆی لە خۆیدا جوانو رازاوەو سەرنج راکێش بێت، ئیتر بالاپۆشی کامەیە؟! زۆرێك لە بالاپۆشەکان گوێمان لێیان دەبێت کە دەڵێن: فلانە جلو بەرگم جوان نیە!! فلانە سەرپۆشم لەگەڵ ئەم جلو بەرگەدا ناگونجێت!! ئەوەیان مۆدێلی نەماوە!! پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (صنفان من أهل النار لم أرهما، رجال معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات، مائلات مميلات، رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة، لايدخلن الجنة، ولايجدون ريحها، وإن ريحها لَيُوجد من مسيرة كذا وكذا). رواه مسلم. واتە: (دوو کۆمەڵو تاقم هەن کە من نەمبینیونو هەردووکیان دۆزەخین، پیاوانێك قامچییان پێیە لە شێوەی کلکی مانگاداو لە خەڵکی پێدەدەن،وە ئافرەتانێك کە جلو بەرگی زۆر تەنکیان لەبەردایە، پیلاوی پاژنە بەرز لە پێ دەکەنو بە پێشدا کەوتوونو بە لارو لەنجەوە دەڕۆن، سەریان وەکو کۆپانیوشتر لێدەکەن، ئەوانە ناچنە بەهەشتەوە، بەڵکو هەر بۆنی بەهەشتیش ناکەن، هەرچەندە بۆنی بەهەشت بە ئەندازەی ئەوندەو ئەوندە دەڕوات)..

ئایا ئەو ئافرەتانە کێن کە نایانەوێت بچنە بەهەشت؟! کە نایانەوێت بۆنی بەهەشت بکەن؟! ئایا نازانن بەهۆی سفوریو رووتو قوتیانەوە دەبنە هۆکارێك بە دەست شەیتانەوە، لەو هۆکارانەی بەهۆیەوە شەیتان خەڵکیان پێگومڕاو سەرلێشێواو دەکات؟! ئایا رازی دەبن ئێوە ببنە هۆکار بۆئەوەی گەنجو لاوی موسڵمان بکەوێتە داوی حەرامو داوێن پیسیەوە؟! ئایا دەزانیت کاتێك جلو بەرگێکی ناشەرعیو حەرام لەبەردەکەیتو کچانو ئافرەتان کە دەتبینن‌و چاوت لێدەکەنو لە هەمان شێوە جلوبەرگی تۆ دەکڕنو لەبەری دەکەن، ئەوا هەتا ڕۆژی دوایی گوناهی ئەو ئافرەتەو گوناهی هەموو ئەوانەی کە چاوت لێدەکەن، چەندێك بۆ ئەوانە، ئەوەندەش بۆ تۆیەو بەشدارو هاوبەشی لەگەڵیان؟! ئایا ئەوەندە ئاسانە؟ تۆ ببی بە پێشەوای بلاوکردنەوەی خراپەو ناشەرعیو بێفەرمانی خودا!!!



# بۆ کێ خۆت دەرازێنیتەوە..؟!

کاتێك ئافرەتێك جلو بەرگێکی ڕازاوەو سەرنج ڕاکێش لەبەردەکات، ئەگەر لێی بپرسینو پێی بڵێین: بۆچی ئەو جلو بەرگە لەبەردەکەیت؟ ئەوا دەڵێت: زۆر جوانە.. ئەگەر پرسیاری لێبکەیتو بڵێیت: بۆ کێ خۆت دەرازێنیتەوە؟!

بەڵێ.. بۆ کی خۆت جوان دەکەیت؟! بۆ داخوازیکارێکی ڕەوشت بەرز!! یان بۆ هاوسەرێکی پاك داوێن!!

بە دڵنیاییەوە نەخێر.. بەڵکو بۆئەوەی کەسانی دەروون نزمو بێ ڕەوشت سەرنجی بدەن!! بۆئەوەی ئەو کەسانە بیانبینن، کە هەرگیز لایەك بە لای چاودێری پەروەردگاردا ناکەنەوە! بۆ ئەو کەسانەی گرنگی بە ئابڕوو نادەن! بۆ ئەوانەی گرنگی بە بەرێزیو پاك داوێنی نادەن! بۆ ئەو کەسانەی تەنها بە شوێن تێرکردنی ئارەزووی داوێنیانەوەن! بۆ ئەوانەی کە ئەیانەوێت بە داوێنو چاوە خیانەتکارەکانیان چێژو خۆشییەکی کاتیو براوە ببینن، پاشانیش کە تاسەیان شکاو تێربوون، بە قاچەکانیان شەقێکیان تێ هەڵدەدەنو دەگەڕێن بە دوای نێچیرێکی تردا..

★ خوشکی بەرێز: ڕۆژێك بیرت کردۆتەوەو لە خۆت پرسیوە، ئایا بۆچی خودای پەروەردگار باڵا پۆشی لە سەر ئافرەتانی ئیماندارفەرز کردووە؟!

خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ النور/٣١ واتە: (با سەرپۆشەکانیان بدەن بە سەر سینەو ملیانداو جوانیو زینەتی خۆیان دەرنەخەن....)..

بۆچی خودای پەروەردگار داوات لێدەکات کە جوانیەکەت بشاریتەوە؟! ئەی بۆچی ڕوخسارو قژو جەستەت بشاریتەوەو دایانپۆشیت؟! ئایا لە نێوان تۆو خودای پەروەردگاردا هیچ ناخۆشیو دوژمنایەتیەك هەیە؟! ئایا هیچ تووڕەییو تۆڵەسەندنەوەیەك هەیە لە نێوانتاندا؟!

نەخێر.. خودای پەروەردگار هیچ پێویستی بە بەندەکانی نیە.. هەروەها خودای گەورە بە هیچ شێوەیەك ستەمیش لە کەس ناکات.. بەڵام ئەم یاساو بنەمایانەی بۆ ئێمە داناوە.. کۆمەڵێك فەرمانیداوە بە سەر پیاواندا و کۆمەڵێکیش بە سەر ئافرەتاندا.. ژیانی ئەم دونیایەش ڕێكو پێكو ڕاستو دروست نابێت، تەنها بە ملکەچکردنی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی نەبێت..

★ خوشکی ئازیز: بزانە کە باڵا پۆشی، قەڵغانو قەڵایەکە، پەروەردگارت پێی

بەخشیویت، بۆ ئەوەی لە بەرامبەر دەروون نزمو خراپە کاراندا خۆتی پێبپارێزیت، ئافرەتانی چاکەکارو لە خواترسیش ئەو ئافرەتانەن کە ملکەچن بۆ فەرمانەکانی خودای پەروەردگار.. ئا ئەم ئافرەتانە سەرکەوتووو سەرفرازو براوەن..

دڵنییاشبە ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت جل‌وبەرگی حەیاو شەرمفت لەبەردا داماڵن، بۆئەوەیانە ئابڕووت بەرن‌و بەهۆی تۆوە دەیانەوێت ئامانج‌و مەبەستەکانیان بێننەدی، لەم پێناوەشدا ماڵ‌و سامانیان دەخەنە کار.. لە هەموو کات‌و ساتێکدا بیر لە هێنانەدی ئامانجە گڵاوەکانیان دەکەنەوە.. بە گۆڤارو ڕۆژنامەو وێنەی ئابڕووبەر.. بە نوسینی خراپ‌و وروژێنەر.. بەو بەرنامانەی کە گومانت بۆ دروست دەکەن بەرامبەر باڵاپۆشی.. خراپەکاری‌و تاوان‌و گوناه لە ناو ئیمانداراندا بڵاودەکەنەوە.. دەیانەوێت لە بازارو شوێنە گشتیەکاندا بە سەیرکردنی جەستەو لاشەت چێژو خۆشی‌وەرگرن.. ئەیانەوێت بەوێنەی تۆ برەو بە کاڵاکانیان بدەن.. دەیانەوێت لە سەر شانۆ سەمایان بۆ بکەی.. بۆیان هەڵپەڕی.. گۆرانیان بۆ بڵێیت.. تەنانەت دەیانەوێت لە سەر جێگەی خەوتنیش بۆ مەبەستە گڵاوەکانیان جەستەی پاکی تۆ بەکاربێنن.. دەیانەوێت لە ناو فڕۆکەشدا بتکەن بە کارگوزارو خزمەتکاریت پێبکەن..

ئا ئەوانە لە ڕاستیدا داوای بەدی هێنانی ئارەزووە بۆگەن‌و ڕزیوەکانی خۆیان دەکەن، نەك ماڤی تۆی بەستەزمان!! ئەو کەسانە داوای هیچ پێویستی‌و ماڤێکی ئافرەتان ناکەن، تەنها ڕووت‌و قوتی‌و دوورکەوتنەوە نەبێت لە باڵاپۆشی! ئەوانە داوای ئەوە دەکەن، کە ئافرەتان بە تەنهاو بە بێ کەس‌و کار گەشت‌و گەڕان ئەنجام بدەن! داوای تێکەڵ کردنی ئافرەتان‌و کچان دەکەن لە خوێندنگەو فەرمانگەکاندا.. داوا دەکەن کە ئافرەتان‌وەکو کاڵایەك بەشداری لە بانگەشەکانی ڕاگەیاندن‌و تەلەفزیۆنەکاندا بکەن.. ئەم کەسانەو چەندان گێل‌و نەفام‌و سوك‌و ڕیسوای تر بەم بێ ئابڕووییانە دەڵێن: ماڤی ئافرەت.. ئازادی ئافرەتان.. یەکسانی بۆ ئافرەتان..

لەناوچوون‌و زەلیلی بۆ ئەو جۆرە کەسانە.. ئەگەر ئەوانە ڕاست دەکەن، کە داوای ماڤی ئافرەت دەکەن، بۆ ڕۆژێك گوێمان لێنەبوو داوای ماڤی ئافرەتە بیوەژنەکان بکەن؟! بۆ داوای ماڤی ئافرەتە نەخۆش‌و کەم ئەندامەکان ناکەن؟! بۆ داوا لە کوڕان‌و منداڵان ناکەن کە ڕێزی دایك‌و نەنکیان بگرن‌و خزمەتیان بکەن؟!

نەخێر.. بەڵکو داوای بڵاوبوونەوەی بێ ئابڕوویی دەکەن.. بۆئەوەی لە ئاوی لێڵدا ڕاوی خۆیان بکەن‌و ئارەزووەکانیان تێر بکەن.. ئەو کەسانە دووڕوون.. نەوەی عبدالله

ی کوڕی ئوبەی سەلول.. ئا ئەم دووڕووە سەرۆکی دووڕووەکانی شاری مەدینە بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ..

ئایا نازانیت ئا ئەو کەسانە تۆمەتی زینایان خستە پاڵ دایکی بەڕێزمان خاتوو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت)و پاشانیش لە ناو خەڵکیدا دووبارەو بڵاویان کردەوە؟! ئەم دووڕووەوای دەردەخست کە قسەو باسێکی باشی بڵاوکردۆتەوە.. بە ڕاستی سەردەستەی سوکیو ڕیسواییو زەلیلی بوو..

ئایا نازانیت ئەم دووڕووە هەڵدەستا بە کڕینی کەنیزەکی جوانو پاشان فەرمانی پێدەدان کە هەستن بە داوێن پیسیو لەش فرۆشی پێئەنجام دەدان، بۆئەوەی لەو ڕێگە نادروستەوە سەروەتو سامانی دەست بکەوێت، هەتا خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ریسواو شەرمەزاری کرد، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ النور/٣٣ واتە: (بەزۆر کەنیزەکەکانتان هان مەدەن بۆ داوێن پیسی، ئەگەر ئەوان پاك داوێنیان دەویست، بۆئەوەی لەو ڕێگە چەوتەوە ماڵو سامانو ژیانی دونیا بە دەست بهێنن...)..

ئەو کەسانە زۆر ئەموشانەدا دووبارە دەکەنەوەو پێت دەڵێن: ئەو سەرپۆشەی بەسەرتەوەیە نارەحەتت دەکات.. ئەو جلو بەرگە درێژانەت قورسو گرانت دەکەنو ناتوانیت بە ئاسانی بڕۆیت بە ڕێگەداو پانتۆڵ بۆ هاتوچۆ ئاسانترو خۆشترە..

ئەو کەسانەی کە بە شارستانی ڕۆژئاوا سەرسامن،وا دەزانن گەیشتن بەو شارستانیە، بە دوورکەوتنەوەو دانانی باڵاپۆشیی دەبێت!!

ئەو کەسانە ئەگەر چوبێتن بۆ یەکێك لە شارە گەورەکانی ڕۆژئاوا یان ڕۆژهەڵات، بەسە بۆئەوەی ئەو ڕاستیەیان بۆ دەرکەوێت کە لەو شارانە ئافرەتان کاریان گواستنەوەو هەڵگرتنی جانتاو کەلو پەلە لە فرۆکەخانەکاندا.. هەروەها پاککردنەوەی شەقامەکان.. خۆ ئەگەر جوانو لاویش بن ئەوا لە سەماخانەو مەیخانەکاندا کاریان پێدەکەن..

ئا ئەو کەسە چەپەڵانە، گاڵتەو گەپ بە جەستەی ئافرەتان دەکەن.. هەیانەوەکو کەلو پەل پارەیان پێپەیدا دەکەن.. کاتێکیش پێویستیان بە ئافرەتێك نامێنێتو حەزو ئارەزووەکانیان بۆ ساتێك خامۆش دەبێتەوە، ئەوا دەکێشن بە دەمو چاوو روخساریاندا، کاتێکیش پیربوونو جوانیەکانیان نەما، ئەوا فڕێیان دەدەنە لانەی پیرانەوە.. لانەی پیرانێك هاوشێوەی زیندانەکان.. بەڵکو هاوشێوەی گۆڕستانەکان.. ئەمە ئەو ئازادیەیە کە ئەوان مەبەستیانەو باسی دەکەن؟!

★ خوشکی ئازیز: سوێند بە خودا ئەگەر ئێمە خەمو خەفەتو ئازار بچێژین بۆ خوشکە موسڵمانەکانمان لە فلیپین، یان لە کشمیر.. ئەوا ئەو ئافرەتانە لەوڵاتانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات کەسێك نیە خەمیان لێبخواتو کەمێك لە ئازارو ناسۆریەکانیان برەوێنێتەوە..

## تۆ شاژنیت.. شاژن..

★ پزیشکێك دەڵێت: لە بەریتانیا خەریکی خوێندن بووم، پیرێژنێك دراوسێمان بوو کە تەمەنی لە حەفتا ساڵ زیاتر دەبوو.. هەرکەس بیبینیایە سۆزی بۆ لای دەجولا..پشتی بە تەواوی چەمی بووەوە.. ئێسقانەکانی لاوازو نەرم بووبوونەوە.. پێستی جەستەیوشك هەڵگەرابوو.. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لە چوار دیواری ماڵەکەیدا بە تەنها دەژیا.. دەچووە دەرەوەو دەهاتەوە ژوورەوە.. کەسێك نەبوو یارمەتیەکی بدات..کەسێك نەبوو نازی پیریەتی بکێشێو خزمەتێکی بکات.. نە منداڵ.. نە هاوسەر.. خۆی خواردنی ئامادە دەکرد.. هەر خۆشی جلو بەرگەکانی دەشۆرد.. شوێنو جێگەکەیوەکو گۆڕوابوو.. جگەلە خۆی کەسێکی تری لەگەڵ نەبوو.. کەسێکیش نەبوو لە دەرگاکەی بداتو سەردانێکی بکات..

ڕۆژێکیان خێزانەکەم داوای لێکرد کە بێت سەردانمان بکاتو میوانمان بێت.. خێزانەکەم پێی وتبوو: لە ئیسلامدا پیاو، بەرپرسیارە لە خێزانەکەیو لە پێناوی هاوسەرەکەیدا دەبێت کار بکاتو جلو بەرگو خواردنو هەموو پێداویستسەکانی بۆ دابین بکاتو لە کاتی نەخۆشیو ناساغیدا ئەبێت چارەسەری بکاتو سەردانی پزیشکی پێ بکاتو یارمەتی بدات، ئافرەتیش لە ماڵەوە دادەنیشێتو پێویستە بژێویو پێویستیەکانی بۆ دابین بکرێتو چاودێریو پارێزگاری لێ بکرێت.. دەبێت پارێزگاری لە گیانو ئابرووشی بکرێت..

ئەگەر خودا منداڵی بە ئافرەت بەخشی، ئەوا پێویستە لە سەر منداڵەکان کە بە چاکی هەڵسو کەوت لەگەڵ دایکیاندا بکەنو ملکەچ بن بۆی، هەر کەسێکیش دڵی دایکی ئازار بدات، ئەوا لە لای خەڵکی بێزراوو بێ ڕێز سەیر دەکرێت.. لە ئیسلامدا ئەگەر ئافرەت شووی نەکردبوو، ئەوا پێویستە لە سەر باوكو براکانی بژێویو پێویستیەکانی ژیانی بۆ دابین بکەن..

ئەم پیرێژنە زۆر لەم قسانە سەری سوڕما بوو!! بیری لە منداڵەکانی خۆی دەکردەوە کە چەندان ساڵە چاوی پێیان نەکەوتووە.. کەسیان سەردانی ناکەن.. بەڵکو هەر ناشزانێ لە کوێن.. لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بمرێتو کفنو دفن بکرێت، یان بسوتێنرێتو هەر

پێشی نەزانن.. لەبەرئەوەی نرخو بایەخێکی ئەوتۆی نیە لە لایان..

کاتێك خێزانەکەم لە قسەکانی بۆوە، ئەم پیرەژنە بە سەرسورماویو کەمێك بە بێدەنگی مایەوە.. پاشان‌وتی: بە ڕاستی ئافرەت لە ئاینەکەی ئێوەداو لە لای ئێوە شاژنە.. شاژن..

بەڵێ.. سوێند بە خودا، خوشکی بەڕێز تۆ لە لای ئێمە شاژنیت.. ڕوحو گیانمان لە پێناوی تۆدا لە لا بێنرخو هەرزانە.. تۆ شاژنیت.. بۆیە فەرمان بە پیاو کراوە لە دەوروبەرت بێتو پارێزگاریت لێ بکات..

## چیرۆکێکی سەیر..!!

★ بانگخوازێك دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بۆ گەشتێکی بانگخوازی لەگەڵ تیمێکی پزیشکیدا چووین بۆ یەکێك لەوڵاتە ئاسیاییەکانو خێمەیەکمان هەڵدا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەسانەی چاویان نەخۆشە.. پیاوێکی بە تەمەن کە ئافرەتێکیشی لەگەڵدا بوو لە پزیشکەکە هاتنە پێشەوە.. ئافرەتەکە زۆر دوودڵو شێواو دیار بوو، کاتێك کە پزیشکی چارەسەرکەرویستی لە ئافرەتەکە نزیك بێتەوە، ئافرەتەکە دەستی کرد بە گریان.. پزیشکەکە واگومانی برد، لە ترسی ئازاری نەخۆشیەکەی دەگریو پرسیاری لە هاوسەرەکەی کرد، دەربارەی ئەم گریانە... پیاوەکەوتی: لەبەر ئازار ناگری..بەڵکو لەبەرئەوە دەگری کە ئەبێت ڕوخساری بۆ پیاوێکی نامەحرەم دەربخات!! لەبەر دوودڵیو خەمو خەفەت خەوی لێنەکەوتووەو زۆر هیلاكو ماندووەو زۆریش لۆمەو سەرزەنشتی کردمو پێ‌ی‌وتم: لەبەر زەرورەت نەبووایە، هەرگیز ڕوخسارم دەرنەدەخست..

پاشان نەشتەرگەری بۆ ئەنجامدراو ئاوە سپیەکەی چاوی بە سەرکەوتووی لابراو بیناییو ڕووناکی بۆ چاوەکانی گەڕایەوە..

هاوسەرەکەی دەڵێت: لە دوای نەشتەرگەریەکە خێزانەکەم پێ‌ی وتم: من دەمتوانی ئارام بگرمو بە نابینایی بمێنمەوەو خۆم چارەسەر نەکەم، بەڵام لەبەر دوو هۆکار ڕازی بووم کە ئەم نەشتەرگەریە ئەنجام بدەم:

یەکەم: بۆئەوەی لە تامو چێژی قورئان خوێندن بێ بەش نەبم..

دووەم: بۆئەوەی خزمەتی تۆو منداڵەکان بکەم..

★ خوشکی بەڕێزم ئەو ئافرەتە نەیووت: نەشتەرگەری چاوم دەکەم، بۆ ئەوەی سەیری ئەو شتانەی پێ بکەم، کە خودا توورە دەکەن...

★ ئەم ڕووداوە لە کتێبی (حجابي جنتي)/(أبو عبدالرحمن) ـەوەوەرگیراوە..

## ئاوازو گۆرانی، هەناسەی پڕ خەمو ئازار..!!

هەندێك لە ئافرەتان شەیتان بەرەو ڕێگەو ڕێچکەی پووچو بێنرخیان دەباتو ڕایان دەکێشێ بەرەو تاوانو گوناه.. بە گوێگرتن لە گۆرانی.. بە پاپەندبوونیان بە خراپەکاری..

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ .... ﴾ لقمان/٦واتە: (قسەی بێ خێرو بی مانا دەکڕن (وەك گۆرانیو کتێبو کاسێتی پڕوپووچو....) تا خۆیو کەسانی تریش لە ڕێبازی خوداوێڵ بکاتو دووریان بخاتەوە....)..

عبدالله ی کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: سوێند بە خودا ئەم ئایەتە مەبەستی لە گۆرانیە..

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: (ليكونن من أمتي أقوام يستحلون الحر والحرير والخمر والمعازف).متفق عليه. واتە: (هەندێك لە ئوممەتەکەم داوێن پیسیو زیناو ئاوریشمو مەیو مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن)..

هەروەها دەفەرموێت: (ليكونن في هذه الأمة خسف وقذف ومسخ، وذلك إذا شربوا الخمور واتخذوا القينات وضربوا بالمعازف).رواه الترمذي. واتە: (لەم ئوممەتەدا بەهۆی ئەنجامدانی هەندێك کارەوە زەوی ڕۆدەچێت، خەڵکی شێوەو ڕەوشتیان دەگۆڕێت، ئەمانەش بەهۆی بوختان کردنو زۆر خواردنەوەی مەیو گۆرانی وتنی ئافرەتانو لێدانی مۆسیقا بۆیان لە لایەن پیاوانەوە)..

زاناکان زۆربەیان لایانوایە کە ئامێرەکانی مۆسیقاو گۆرانی حەرامن، بە حەرامێکی توندو بە گوناهێکی گەورەشی دادەنێن ئەگەر هاتوو گۆرانیەکە بە تەنها نەبوو، بەڵکو مۆسیقای لەگەڵ بوو.. گوناهو تاوانەکەش گەورەتر دەبێت، کاتێكوشەو دێڕەکانی ناو گۆرانیەکە باس لە دڵداریو خۆشەویستیو جوانی جەستەو لەشو لاری ئافرەت بکەن..

گۆرانی مۆسیقای شەیتانەو بەو هۆیەوە شوێنکەوتووانو خۆشەویستانی شوێنی دەکەون.. خودای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴾الإسراء/٦٤ واتە: (خودای پەروەردگار بە شەیتانی فەرمووو: بڕۆ چیت لە دەست دێت درێغی مەکە، هەرکەس کە توانیت (لەو بەدبەختانە) بە بانگ کردنو هاندانیان بۆ تاوانکاری دایان بڕە، بەهۆی لەشکری سوارەو پیادەی خۆتەوە هێرشیان بۆ بەرەو هاوبەشیان بکە لە ماڵو

سامان و منداڵیاندا، ئەوەندەش بەڵێن و ئومێدیان پێبدە، سەریان لێ بشێوێنە، هەرچەندە بەڵێن و هاندانی شەیتان جگەلە فریودان و فێڵ کردن و ساختە شتێکی تر نیە)..

عبداللەی کوری مەسعود ﷺ دەفەرمویت: گۆرانی رێگەو هۆکاری زیناو داوێن پیسیە، سەیرە!! ئەمەوتەی ئەم هاوەڵە بەرێزەیە، کە لە کاتی ئەودا گۆرانی لە لایەن بەندەو کەنیزەکەکانەوە دەوترا.. ئەو کاتە گۆرانی تەنها دەف ئەگەر لەگەڵدا بوو بێت.. هۆنراوەکانیشی پاک و پوخت و باش بوون.. لەو کاتەدا بە گۆرانی بڵێت هۆکارو رێگەیە بۆ زیناو داوێن پیسی!! ئەی ئەگەر ئەم هاوەڵە بەرێزە ئێستای ئێمە ببینێت، کە ئێستا ئاوازو گۆرانیەکان جۆراوجۆرن.. یارمەتیدەرو دۆستەکانی شەیتان زۆر بوون.. ئێستا گۆرانییانوا لێکردووە لە سەیارەو فرۆکەدا گوێی لێدەگیرێت.. لە دەریاو زەریاو لەوشکانیدا.. تەنانەت کاتژمێرو جەرەس و یاری منداڵان و کۆمپیوتەرو ئامێری تەلەفۆن و مۆبایل هەموویان گۆرانییان تێدایە..!!

## هۆکارو رێگەی داوێن پیسی..!!

گۆرانی رێگەو هۆکارە بۆ بلاوبوونەوەی خراپەو داوێن پیسی.. هەروەها بۆوروژاندنی ئارەزووی ئەنجامدانی خراپەو بەدرەوشتی.. گۆرانیەک نابینی باسی خۆشەویستی نێوان کچ و کورو دلداری و سەرپێچی لە فەرمانەکانی خودای تێدا نەبێت..

ئایا رۆژێک لە رۆژان گوێت لە گۆرانی بێژێک بووە لە گۆرانیەکانیدا هانی خەڵکی بدات و بڵێت: ئاگاداری خۆت بەووریابە نەکەویتە داوی زیناو داوێن پیسیەوە؟! یان پێت بڵێت چاوت لە بێ شەرعی و حەرام بپارێزە؟! یان بڵێت ئابروو حەیای موسڵمان بە ئابروو حەیای خۆت بزانە؟! یان هانت بدات بۆ ئەوەی بە رۆژ بەرۆژوو بیت و بە شەو شەونوێژ بکەیت و لە بەرەبەیاندا خەریکی پارانەوەو گریان و لالانەوە بیت؟!

نەخێر.. هەرگیز گوێمان لەم ئامۆژگاریانە نەبووە.. بەڵکو زۆربەی زۆریان بانگەشە بۆ بە ناو خۆشەویستی حەرام دەکەن.. بۆ پەیوەست بوون و پابەندبوونی دڵ بە غەیری خوداوە.. هەندێک جاریش ئافرەتان بەرەو کارێکی زۆر خراپ هەنگاو دەنێن و پێوەی ئالودە دەبن، ئەویش خۆشەویستی نێوان ئافرەتێک و ئافرەتێکی هاوشێوەی خۆیەتی.. هاورێیەتی دەکات و شەیدای دەبێت و پێی سەرسام دەبێت..

بەڵێ.. خۆشی دەوێت.. لەبەرئەوە نا کە ئەو ئافرەتە بە شەو شەونوێژ دەکات و بە درێژای رۆژگار بەرۆژوو دەبێت..

نەخێر.. لەبەر جوانی ڕوخساری.. سەرسامە بە هەڵس و کەوت و جوڵەی.. بە زەردەخەنەو پێکەنینەکانی.. بە شێوەیەك ئالودە دەبێت و خو بە دانیشتن و مانەوە لەگەڵیدا دەگرێت.. بە هەموو شتێکی سەرسام دەبێت، ئەگەر ئەو شتانە ناشیرینیش بێت.. زۆرێك لە ئافرەتان ئەم کارە زۆر بە ئاسایی وەردەگرن و بەڵکو هەندێك جار بانگەشەشی بۆ دەکەن و بە ئاشکرا دەریدەبڕن..

بەڵێ.. زۆرێك لە ئافرەتان لە زانکۆو خوێندگەکاندا بە یەکتر سەرسامن.. بە جل و بەرگ لەبەرکردنی یەکتر.. لە شێوازی ڕۆیشتن بە ڕێگەدا.. لە ماچ کردنی یەکتر و ئاڵوگۆڕ کردنی نامەی سۆزداری و گۆڕینەوەی دیاری شەیتانیانە..

ئایا ئافرەتان بۆچی وا دەکەن؟!! ئەمە دەرچوونە لە سروشتی پاکی مرۆڤ.. هەر ئەم هەڵس و کەوتانە بوون بەهۆی دابەزینی سزای خودایی بۆ سەر گەلی (لوط).. ئەمانە چیان کردبوو؟! پیاوانوازیان لە ئافرەتان هێنابوو!! ئافرەتانیشوازیان لە پیاوان هێنابوو!!

ئافرەت لەگەڵ ئافرەتداو پیاو لەگەڵ پیاودا دەبوو!! کاتێك ئەم تاوانە چەپەڵە بڵاودەبێتەوەو پەرەدەسێنێت، زەوی لە تاوا خەریکە لە هەر چوار لاوە فراوان بێت.. شاخەکان لە ترسا خەریکە لە جێگەی خۆیان بجوڵێن.. خودای گەورە ئەوەی بە سەر گەلی (لوط) دا هێنای بە سەر کەسدا نەیهێناوە.. چاویان بەقوڵا چوو.. ڕوخساریان ناشیرین و ڕەش بوو.. فریشتەکان شارۆچکەکەیانیان لە ناخەوە هەڵکێشاو پاشان ژێرەو ژووریان کرد.. بە ناخی زەویدا بردیاننە خوارەوە.. پاشان خودای گەورە بەردی بە سەردا باراندن..

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ﴾ هود/٨٢ واتە: (جا کاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرەوژێر کردو بە قوری سورەوە کراویوەك بەرد، چین لە سەر چین بەرد بارانمان کردن). پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت:(إن أخوف ما أخاف على أمتي عمل قوم لوط). رواه الترمذي. واتە: (ئەوەی زۆر لێی دەترسم کە لە ئوممەتەکەمدا دەربکەوێت و ڕوو بدات کردەوە ناشیرینەکەی قەومی (لوط)ـە)..

هەروەها سێ جار دەفەرموێت: (لعن الله من عمل عمل قوم لوط).رواه إبن حبان. واتە: (نەفرەتی خودا لەو کەسە بێت کە کردارە ناشیرینەکەی قەومی (لوط) ئەنجام دەدات). هەروەها دەفەرموێت: (من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط، فاقتلوا الفاعل والمفعول به).

رواه احمد. واتە: (ئەو کەسەی کە کردەوە ناشیرینەکەی قەومی (لوط) ئەنجام دەدات‌و ئەو کەسەی لەگەڵی ئەنجام دەدرێت، بکوژن).

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەو کەسانەیان بە ئاگر سوتاندووە..

عبداللەی کوری عەباس ﷺ دەفەرموێت: ئەو کەسانەی کە ئەو کردارە ناشیرینە ئەنجام دەدەن (نێر لەگەڵ نێر یان مێ لەگەڵ مێ)، ئەگەر تەوبە نەکەن‌و واز لەو کارە چەپەڵە نەیەنن ئەوا لە گۆڕەکەیاندا دەبن بە بەرازو شێومیان دەگۆڕێت..

دەی ئەو کەسانەی ئەم کارەیان ئەنجامداوەو تووشی ئەم تاوانە گەورەیە بوون، با زوو بگەڕێنەوە بۆ لای خودای پەروەردگارو پەشیمان ببنەوەو داوای لێخۆشبوون بکەن..

بەڵێ.. خوشکی ئازیز، بگەڕێرەوە بۆ لای خودای پەروەردگار.. ئەو ژمارە تەلەفۆن‌و مۆبایلانەی لاتن بیان سڕەوە.. نامەکانت بدڕێنە.. ئەو کاسێت‌و فیلم‌و وێنانەی کە هەڵتگرتوون بیان فەوتێنە..

★ خوشکی ئازیز: بزانە کە خۆشەویستی خودای بەخشندە لە هەموو خۆشەویستیەکان گەورەترو بە نرخترە.. ملکەچی خودای پەروەردگار بە نەك ملکەچی شەیتان‌و ئارەزووەکانت..

## بکوژو کوژراو..!!

★ خوشکی ئازیز: دەمەوێت کە بانگەوازی کەسانی تر بکەیت بۆ لای ئاینی پەروەردگار.. فەرمان بکەی بە چاکە.. ڕێگری بکەی لە خراپە.. دەی ئازاو چالاك بە.. ڕێگە مەدە شەیتان بە ئارەزووی خۆی یاریت پێبکات..

صەفیەی کچی عبدالمطلب، پووری پێغەمبەری خودا ﷺ ئافرەتێکی بە تەمەن بوو.. تەمەنی لە شەست ساڵ بەرەو سەر بوو.. بەڵام ئازاو پاڵەوان بوو.. ئافرەتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو!! کاتێك بێباوەڕانی قورەیش‌و هاوپەیمان‌و دۆستەکانیان، کۆبوونەوە بۆئەوەی هێرش بکەنە سەر شاری مەدینەی پایتەختی ئیمانداران، موسڵمانەکان خەندەقێکیان بە دەوری لایەك لە لایەکانی شارەکەدا هەڵکەندو لایەکانی تریش بە شاخەکان دەورە درابوون.. موسڵمانەکان ژمارەیان زۆر کەم بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ موسڵمانانی لەگەڵ خۆی برد بۆئەوەی لە بەرامبەر خەندەقەکەدا پاسەوان بن‌و نەیەڵن بێباوەڕان دزە بکەن‌و بپەڕنەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ ژن‌و منداڵی موسڵمانانی لە یەکێك لە قەڵاکاندا کۆکردەوە، بەڵام کەسی لەلا بەجێ نەهێشتن کە پاسەوانییان بکات، ئەمەش لەبەر کەمی موسڵمانان‌و زۆری

بێباوەڕان‌و هەروەها لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵان بە بێباوەڕەکانەوە خەریك بوون، هەندێك لە جولەکەکان دزەیان کردو فرسەتیان هێنا، هەتا گەیشتنە قەڵاکە، بەڵام نەیانوێرا بچنە قەڵاکەوە، لە ترسی ئەوەی نەك سەربازێکی موسڵمانی تێدا بێت..

جولەکەکان لە دەوری قەڵاکە ڕیزیان بەست‌و یەکێکیان نارد بۆئەوەی بزانن دەنگوباس چیە.. ئەو جولەکەیە بە دەوری قەڵاکەدا دەسوڕایەوە بۆئەوەی کەلێنێك بدۆزێتەوەو لێوەی بچێتە ژوورەوە.. لەم کاتەدا صەفیە بینی کە جولەکەیەك بە دەوری قەڵاکەدا دەگەڕێت‌و سەیری ئەملاو ئەولای قەڵاکە دەکات..ئەم ئافرەتە لە دڵی خۆیداوتی: من لێی دڵنیانیم کە چاوساغی بۆ جولەکەکان ناکات‌و خەڵکمان ناهێنێتە سەر، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی سەرقاڵن بە جەنگی بێباوەڕانەوە.. ئەگەر بێتو هاواریش بکەم، ئەوا ژن‌و منداڵەکان دەترسن‌و جولەکەکەش بۆی دەردەکەوێت کە قەڵاکە هیچ پیاوێکی تێدانیە.. چەقۆیەکی هێناو کردی بە لاقەدیاو دارێکی ئەستوریشی هەڵگرت‌و لە قەڵاکە دابەزی.. سوودی لە لاکردنەوەو ئاوردانەوەی جولەکەکە بینی‌و بە دارە ئەستورەکەی دەستی دای بە ناوەڕاستی سەریدا، هەتا کوشتی‌و جوڵەی لێبڕی..

ئای بۆ خاتوو صەفیە!! ئای بۆ ئازایەتی خاتوو صەفیە.. ئەو ئافرەتە خوداپەرست‌و خۆپارێزە.. خوشکم لەورەو چاونەترسیەکەی‌وردبەرەوە.. لە فیداکاری بۆ ئاینەکەی.. ئەی تۆ چەندێك هەوڵتداوە بۆئەوەی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکەی؟! چەندین جار لە کۆڕو دانیشتنەکانتدا ئافرەتی دوور لە خودات بینیوە.. لە بازاڕدا ئافرەتانی سفورت بەرچاوکەوتووە.. لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەدا ئافرەت‌و بووکت بینیوە کە جل‌و بەرگی ڕووت‌و قووتیان لەبەردابووە.. ئەی تۆ چیت بەرامبەر کردن؟! ئامۆژگاریت کردن؟! پێت‌وتن ئەو کارانە بێ فەرمانی خودایە؟!

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾ التوبە/٧١ واتە: (ئیمانداران لە پیاوان‌و ئافرەتانیش هەندێکیان خۆشەویست‌و پشتگیرو هاوکاری یەکترن، فەرمان بە چاکە دەکەن‌و قەدەغە لە خراپە دەکەن‌و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن‌و زەکاتی ماڵیشیان دەبەخشن‌و گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە خودا لە ئایندەدا ڕەحمیان پێدەکات‌و سۆزی دەبێت بۆیان، بە ڕاستی خودا باڵا دەست‌و زانایە)..

هەرکەسیش‌واز لە فەرمان بە چاکەو ڕێگری کردن بێنێت لە خراپە، ئەوا دەبێتە



شایه‌نی نه‌فرینی خودای په‌روه‌ردگار، هه‌روه‌ك خودای گه‌وره ده‌فه‌رمویت: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ ★ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴾ المائده/٧٨-٧٩ واته: (نه‌فرین كراوه له‌وانه‌ی بێباوه‌ڕبوون له نه‌وه‌ی ئیسرائیل له سه‌ر زاری داودو عیسای كوڕی مه‌ریه‌م، ئه‌میش له‌به‌رئه‌وه‌ی كه ئه‌وان یاخی‌و سه‌ركه‌ش بوون‌و ده‌ست درێژیان ده‌كرد★ ئا ئه‌وانه قه‌ده‌غه‌ی یه‌كتریان نه‌ده‌كرد له خراپه‌و تاوانێك كه ده‌یانكرد، سوێند بێت به خودا ئه‌وه‌ی كه ده‌یكه‌ن زۆر خراپ‌و ناپه‌سه‌نده)..

شه‌رم مه‌كه.. بانگه‌واز كردن بۆ ئاینی خودا سه‌ره‌تا پێویستی به بوێری‌و ئازایه‌تی هه‌یه.. پاشانیش له كۆتاییدا دڵخۆش‌و شادومان ده‌بیت..

## بووك..!!

ئافره‌تانی چاكه‌كار، وه‌ك ئه‌وه‌وایه پشكۆیان به له‌پی ده‌ستیان گرت بێت.. ئه‌گه‌ر كه‌سێك فه‌رمانێكی خودا، یان پێغه‌مبه‌رﷺ یان به گوێدا بدات، ئه‌وا ملكه‌چ ده‌بن بۆی‌و ره‌زامه‌ندی ده‌رده‌بڕن .. به‌ره‌نگاری نابنه‌وه‌و ناڕه‌زایی ده‌رنابڕن‌و به پێچه‌وانه‌ی ئه‌و فه‌رمانه‌وه هه‌ڵسوكه‌وت ناكه‌ن.. هه‌وڵ ناده‌ن خۆیان له‌و فه‌رمانه ڕزگار بكه‌ن.. له هه‌واڵ‌و ڕووداوی ئه‌م ئافره‌ته پاك‌و به‌ڕێزه‌وردبه‌ره‌وه..

یه‌كێك له هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ كه پێیان ده‌وت: جلیبیب.. ده‌م‌و چاوێكی ناشیرینی هه‌بوو.. پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ ژن هێنانی خسته به‌رچاوی‌و داوای لێكرد ژن بهێنێت.. ئه‌م هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌ش‌وتی: منی لێقه‌وماوو ڕووت‌و ڕه‌جاڵ كێ ژنم ئه‌داتێ؟! پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ پێی فه‌رموو: له‌لای خودا ڕووت‌و ڕه‌جاڵ‌و لێقه‌وماو نیت.. پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ له هه‌لێك ده‌گه‌ڕا بۆئه‌وه‌ی ژنی بۆ بهێنێت.. هه‌تا ڕۆژێك پیاوێكی ئه‌نصاری كچه‌كه‌ی خسته‌ڕوو بۆ پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ، بۆئه‌وه‌ی ماره‌ی بكات بۆ خۆی.. پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ فه‌رمووی: ئه‌ی فلانه كه‌س كچه‌كه‌تم ئه‌ده‌یتێ..

پیاوه‌كه‌وتی: به‌ڵێ به سه‌ر چاو..

پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ فه‌رمووی: بۆ جلیبیب..

پیاوه‌كه وتی: بۆ جلیبیب!! ده‌ی با پرسیارێك به دایكی بكه‌م‌و ڕایه‌كی ئه‌ویش‌وه‌رگرم..

پیاوه‌كه چوو بۆ لای خێزانه‌كه‌ی وتی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ داوای كچه‌كه‌ی كردووین..

خێزانەکەی وتی: بەڵێ بە سەر چاو..

پیاوەکە وتی: ئاخر بۆ خۆی نیە..

خێزانەکەی وتی: ئەی بۆ کێ؟!

بۆ جلیبیب..

خێزانەکەی وتی: نا.. سوێند بە خودا نایدەم بە جلیبیب.. ئێمە بە فلان‌و فلانمان نەدا، چۆن بیدەین بە جلیبیب!!

پیاوەکە هەستا بچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ..

لەم کاتەدا کچەکەیان هاواری کردو وتی: کێ داخوازی منی لێکردوون؟!

وتیان: پێغەمبەری خودا ﷺ..

کچەکە وتی: ئایا داواکاری‌و فەرمانی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕەد دەکەنەوە؟! بمدەنە دەست پێغەمبەری خودا ﷺ.. بە دڵنیاییەوە بە خەسارم نادا..

پیاوەکە چووەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەیفی خۆتە..

پێغەمبەری خودا ﷺ ئافرەتەکەی لە جلیبیب مارە کردو دۆعای بۆ کردن‌و لە خودا پاڕایەوە کە خێریان بە سەردا بڕژێت‌و ژیانیان بە دوور بێت لە نارەحەتی‌و زەحمەت..

چەند ڕۆژێکی کەم بە سەر هاوسەرگیریەکەیاندا تێنەپەڕی، پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا بۆ یەکێك لە غەزاکان دەرچوو.. جلیبیبی تازە زاواش لەگەڵیان کەوتەڕێ.. کاتێك جەنگ کۆتایی هات‌و خەڵکی بە دوای یەکتردا دەگەڕان، بۆ ئەوەی بزانن کێ ماوەو کێ شەهید بووە.. پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری لێکردن‌و فەرمووی: ئایا کەسێکتان لێوون بووە؟! یان ئایا کەسێکتان لە دەست داوە؟!

وتیان: بەڵێ.. فلان‌و فلان..

پێغەمبەری خودا ﷺ تا سێ جار ئەم پرسیارەی دووبارە کردەوەو هاوەڵانیش وەڵامیان دەدایەوەو دەیان فەرموو: بەڵێ ئەم کەسانەمان لێ شەهید بووە..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بەڵام جلیبیب دیار نیە!! هەستان‌و بەدواییدا گەڕان.. زۆر گەڕان.. لە مەیدانی جەنگیشدا نەیان بینیەوە.. پاشان لە شوێنێکی نزیکدا بینیانەوە.. لە تەنیشتیەوە لاشەی حەوت بێباوەڕ کەوت بوو..

بەڵێ.. حەوت کەسی لە بێباوەڕان کوشت بوو، پاشان شەهید کرا بوو..

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری لاشەکەی دەکرد.. پاشان فەرمووی: حەوت کەسی کوشتووەو پاشان شەهیدیان کردووە.. جلیبیب خۆشەویستی منەو لە منە.. منیش لە ئەوم.. پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەر دەستەکانی هەڵیگرتو فەرمانی کرد کە گۆڕی بۆ هەڵکەنن..

ئەنەس ﷺ دەڵێت: هەتا گۆڕەکەمان هەڵکەندو تەواو بووین، دەستە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ لە ژێر سەری جلیبیب دا بوو.. پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ بە دەستە پیرۆزەکانی لە ناو گۆڕەکەدا داینا.. ئەنەس ﷺ دەفەرمویێت: سوێند بە خودا لە ناو شاری مەدینەدا هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە.. ئەوەندە کەس داخوازی بکەن وەك هاوسەرەکەی جلیبیب دوای شەهید بوونی جلیبیب خەڵکی پێشبڕکێیان دەکرد بۆئەوەی داخوازی بکەن..

خودای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ النور/٥٢ واتە: (جا ئەوەی فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەرەکەی بکاتو لە خودا بترسێتو لە سەرپێچیو نافەرمانی خۆی بپارێزێت، ئا ئەوانە سەرفرازو بە ئاوات گەیشتوون)..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: (كل أمتي يدخلون الجنة، إلا من أبى، قالوا يا رسول الله ومن يأبى؟ قال: من أطاعني دخل الجنة، ومن عصاني فقد أبى). متفق عليه. واتە: (هەموو ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشت، تەنها ئەوانە نەبێت کە نایانەوێت، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا کێ نایەوێت بچێتە بەهەشت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەوەی گوێڕایەڵم بێت ئەچێتە بەهەشت؟ ئەوەش کە لێم یاخی بێت، ئەوا نایەوێت بچێتە بەهەشت)..

## لە گۆڕەپانی پێشبڕکێدا..!!

ئافرەتانی چاکەکار، بۆ ئەنجامدانی کاری چاك پێشبڕکێ دەکەن.. گەورەو بچوکیان.. لە هەموو بوارێکیشدا جێگەی دەستیان دیارە..

★ خوشکی بەڕێز: تۆ نازانی بەهۆی چ کردارێکتەوە دەچیتە بەهەشت!! لەوانەیە بەهۆی نامیلکەیەك یان کتێبێك یان کاسێتێکی باشەوە، کە لە خوێندنگە یان لە زانکۆ یان لە فەرمانگە دەیبەخشیتو دەیکەیت بە دیاری، خودای گەورە لێت خۆش بێتو بتبەخشێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵمان دەداتێ بەوەی کە ئافرەتێکی بەدڕەوشت لە بەنی

ئیسرائیلدا هەبوو، ڕۆژێك بە چۆڵەوانیو بیابانێکدا دەڕوات.. لە نزیك بیرێکەوە سەگێك دەبینێ کە بە دەوری بیرەکەدا دەسوڕێتەوە.. ڕۆژەکەش زۆر گەرم بوو.. سەگەکە لە تاو تینویەتی زمانی دەرهێنا بوو.. خەریك بوو دەخنکا.. ئەم ئافرەتەی کە بەردەوام سەرپێچی خودای دەکردو خەڵکی گومڕا دەکردو گەنجو لاوەکانی تووشی تاوانی زیناو داوێن پیسی دەکردو ماڵی حەرامی دەخوارد.. کاتێك سەگەکەی بەم شێوەیە بینی.. پیلاوەکانی داناو بە جلو بەرگو سەرپۆشەکەی بەستیەوەو شۆڕی کردەوە بۆ ناو بیرەکەو ئاوی دەرهێناو سەگەکەی تێر ئاو کرد.. خودای گەورە بەهۆی ئەم کارمیەوە لێی خۆش بوو..

بەڵێ.. خودای گەورە لێی خۆش بوو!! بە چی؟! ئایا بە شەو هەر خەریکی شەونوێژ بوو؟! ئەی بە ڕۆژ هەر بەرۆژوو بوو؟! ئایا لە پێناوی خوادا کوشتاری کرد؟!

نەخێر تەنها سەگێکی لە تینویەتی ڕزگار کرد.. خوداش لێی خۆش بوو..

دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) باسی ئافرەتێکی هەژارمان بۆ دەکاتو دەفەرموێت: ئافرەتێك هات بۆ لامو دوو کچی بچوکی لە باوەشدا بوو، پێی وتم: ئەی دایکی ئیمانداران سوێند بە خودای تاكو تەنها سێ ڕۆژە هیچ خواردنێك نەچۆتە سکمانەوە!! دایکی ئیماندارانیش بە ماڵە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ گەڕاو لە سێ دەنك خورما زیاتر هیچی نەدۆزیەوە.. هەر سێ دەنکە خورماکەی دا بە ئافرەتەکە، ئافرەتە هەژارەکەش زۆر دڵخۆش بوو.. یەکی دەنکێك خورمای دا بە کچەکانیو دەنکە خورماکەی تریشی بۆ دەمی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بیخوات، بەڵام دوو کچە بچوکەکەی بە زوویی خورماکەی خۆیان تەواو کردو لە برسانا دەستیان برد بۆ خورماکەی دایکیانو داوای دەنکە خورماکەی دەستی دایکیان کرد.. دایکەکە سەیری دوو کچە بچوکەکەی کرد.. دەنکە خورماکەی لە دەمی گێڕایەوەو کردی بە دوو بەشەوەو لە نێوانیاندا بەشی کرد!!

دایکی ئیمانداران دەفەرموێت: لە سۆزو بەزەیی ئەو ئافرەتە سەرم سوڕما!! پاشان ڕووداوەکەم بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ باس کرد.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: خودای گەورە بەهۆی ئەو کارەوە بەهەشتی پێ بەخشی.. یان لە ئاگری دۆزەخ ئازادی کرد..

بەڵێ.. زۆرێك لە ئافرەتان پێشبڕکێ دەکەن بۆ ئەنجامدانی کاری چاکەو بەخشینو بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خودا.. ئەگەر چاکەکانیشیان بچوكو ئاساییو ئاسانیش بێت گرنگ نیە، گرنگ ئەومیە خۆیان بە دوور بگرنو دوور بکەونەوە لە تاوانو سەرپێچی.. نابێت تاوانو سەرپێچی بە کەم بزانرێت.. خودای گەورە باسی قەومێکمان بۆ دەکات،

که تاوان‌و گوناهیان لەلا بچوك بوو، هەروەك دەفەرمویت: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ﴾ النور/١٥ واتە: (ئێوەوا دەزانن ئەو بوختانە شتێکی سادەو ئاسانە؟ لە کاتێکدا ئەوە لە لای خودا زۆر گەورەو ناقۆلایە)..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویت: ئافرەتێکم بینی لە ئاگردا سزا دەدرا.. چی‌وای لەو ئافرەتە کرد کەبچێتە ئاگرەوە؟! ئایا بت پەرست بوو؟! پێغەمبەرێکی شەهید کرد بوو؟! ماڵ‌و سامانی خەڵکی دزی بوو؟!

نەخێر.. لە سەر پشیلەیەك خرایە ئاگرەوە!! ئەم ئافرەتە پشیلەیەکی بەند کردو نە خۆی خواردنی پێداو نە بەرەڵای کرد تا خۆی خواردن پەیدا بکات.. هەتا پشیلەکە مردارەوە بوو.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویت: بە دڵنیاییەوە ئەو ئافرەتەم بینی لە ئاگردا بوو، پشیلەکەش چرنوکی لێدەگرت..

هەروەها پرسیار کرا لە پێغەمبەری خودا ﷺ و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا فلانە ئافرەت بە شەو شەونوێژ دەکات‌و بە ڕۆژیش بەرۆژوو دەبێت‌و ماڵ‌و سامانیش دەبەخشێت، بەڵام بە زمانی ئازاری دراوسێکانی دەدات.. دراوسێکانی لە زمانی دڵنیا نین..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەو ئافرەتە هیچ خێرو چاکەیەکی دەستگیر نابێت‌و دۆزەخیە..

وتیان: فلانە ئافرەتیش تەنها نوێژە فەرزەکانی ئەنجام دەدات، کەمیش خواردن دەبەخشێت، بەڵام کەس ئازار نادات..

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەو ئافرەتە بەهەشتیە..

## جەنگ..!!

★ خوشکی ئازیز: دەزانیت ئەو جەنگ‌و شەڕەی ڕووبەڕووت دەبێتەوە، جەنگی ئەو کەسانەیە کە کەڵبەکانیان جیڕ کردۆتەوەو دەیانەوێت بتکەن بە کۆیلە.. دەیانەوێت شەرەف‌و ئابڕووو پاکێتیەکەت، بە ناوی ئازادی‌و یەکسانیەوە لەکەدار بکەن..

مانای ئازادی لای ئەو کەسانە چی دەگەیەنێت؟! ئەی بۆ داوای ئازادی‌و خۆشگوزەرانی بۆ فەرمانبەرو کارگوزارانی ستەم لێکراو ناکەن؟! بۆ داوای خۆشگوزەرانی بۆ کرێکاران ناکەن‌و هەوڵی چارەسەری کێشەکانیان نادەن؟! یان بۆ ئەو کەسانەی کە بێ نەواو بی جێگەو ڕێگەن؟! بۆچی سورن لە سەر داواکردنی بە ناو ئازادی بۆ ئافرەتانی داوێن پاك؟! داوای ئازادی بۆ ئەو ئافرەتە بەڕێزانەی کە لە لای باوك‌و براو مێردەکانیان بە ڕووسوری دەژین؟!

ئەو ئافرەتە پاك داوێنانەی کە ئەگەر دەستی خیانەتیان بۆ درێژ بکرێت، نایەڵن ئەو دەستە ناپاکانە بە ساغی بگەڕێنەوە..

ئایا پابەندبوونی ئافرەتان بە باڵاپۆشیو سەرپۆشەوە، بۆئەوەی ئابرووی خۆیان بپارێزن، پێویستی بە ئازاد کردن هەیە؟!

ئایا ئەم ئافرەتانە کۆیلەو دەسبەسەرن تا پێویستیان بە رزگاربوون هەبێت؟!

ئەگەر ئافرەتان شوێنی تایبەتیان بۆ دیاری بکرێتو تێکەڵی پیاوان نەبن لە ئیشو کارەکانیاندا، ئایا ئەمە بریتیە لە بەندایەتیو زەلیلی؟!

ئایا کاتێك ئافرەتان دەبن بە پەروەردەکار بۆ منداڵەکانیان..وە کاتێك سۆزو خۆشەویستیو نەرمو نیانی بۆ کچەکانیان دەردەبڕن..وە کاتێك خاوەن هەموو بڕیارێکن لە ماڵەکانیاندا..

ئایا لەم حاڵەتانەدا ئەم ئافرەتانە بەندەو کۆیلەن، هەتا پێویستیان بە ڕزگاربوون هەبێت؟!

پاشان دەبینین زۆربەی ئەو کەسانەی کە باسی ئازادیو ڕزگاربوونی ئافرەتان دەکەنو داوای ئەوە دەکەن کە ئافرەتان دوورکەونەوە لە باڵاپۆشی، کەسانی زاناو شارەزاو تێگەیشتوو نین!! کەسانی چاکەخوازو چاکساز نین!! بەڵکو زۆربەی زۆریان کەسانی داوێن پیسن.. کەسانی مەی خۆرن.. خاوەن ئارەزووی گڵاون..

ئا ئەمانە بۆچی داوای ئازادی ئافرەتان دەکەن؟! بۆچی داوای هاتنە دەرەوەی ئافرەتانی ڕەوشت بەرز دەکەن لە ماڵەکانیان؟!

وەڵامەکە ڕوونو ئاشکرایە.. حەز دەکەن بە ڕووتو قوتی بیان بینن.. حەز دەکەن لە کاتی سەماو گۆرانیدا بیان بینن.. کاتێکیش ئافرەتان جلو بەرگی شەرمو حەیا فڕێ دەدەن.. کاتێك لە سەر شانۆ سەمایان پێدەکەن.. کاتێك ئارەزووەکانیان پێ تێر دەکەن.. پاشان هاوار دەکەنو دەڵێن: ئازادمان کردن.. ڕزگارمان کردن.. هەر بۆیە تێکەڵی پیاوو ئافرەتیان لە لا جوان دەکەن.. ئەیانەوێت هەر کاتێك ئارەزوویان لێبوو، ئافرەتان بەکاربهێنن.. لە سەر جێگەکانیان.. لە باخچەکان.. لە مەیخانەکان.. کاتێك ئابرووی ئافرەتانیان تکاند، پڕ بە دەمیان هاوار دەکەن: بە دڵنیاییەوە ئازادمان کردن..

خدعوها بقولهم حسناء      والغواني يغرهن الثناء..

هەروەها ئەیانەوێت بە ناپۆشتەیی لە کەنار دەریاکان بیان بینن و مەیان بۆ بگێڕن.. لە ناو فڕۆکەشدا خزمەتکارییان پێبکەن.. کاتێك ئافرەتانی داوێن پاك ئەکەونە

داویانەوەو تووشی تاوانو خراپە دێن.. ئەوسا پێیان پێدەکەننو لە نێوان خۆیاندا دەڵێن: ئەمەیە ئافرەتی ئازادکراو.. لە چی ئازاد کراوە؟!

سەیرە!! ئایا لە بەندیخانە ئازاد کراون؟!

ئایا لەبەرکردنی جلو بەرگی کورتو تەسك ئازادیە؟!

ئایاوازهێنانو دوورکەوتنەوە لە باڵاپۆشی ئازادیە؟!

ئایا بە تەنها مانەوە لەگەڵ کۆمەڵە گەنجێکی گورگ ئاسا، ئازادیە؟!

ئەی نازانی ئازادی ڕاستەقینە بریتیە لەوەی داپۆشراوو بە ئابڕوو بیت؟!

کاتێك باوکت زۆر بە سۆزو میهرەبان دەبێت بۆت..

هاوسەرەکەت زۆر هەڵسو کەوتی جوان دەبێت لەگەڵت..

براکەت پارێزگاریت لێدەکات..

منداڵەکانت لەبەر پێتدا دەکەونو خزمەتت دەکەن..

ئا ئەمەیە ڕێزو شکۆی گەورە، کە خودای گەورە بۆی داناویت..

## نوێنەری ئافرەتان..!!

کۆمەڵگە بریتیە لە دوو بەش.. ناوخۆو دەرەکی..

پیاوان هەڵدەستن بە جێبەجێ کردنو ڕاپەڕاندنی کاروباری دەرەکیو کار دەکەنو بژێوی پەیدا دەکەن.. خانووو ماڵ دروست دەکەن.. نەخۆش چارەسەر دەکەن.. برسی تێر دەکەن.. ئەکڕنو ئەفرۆشن..

ئافرەتانیش منداڵان پەروەردە دەکەن.. پێویستیەکانی ماڵ ڕادەپەڕێنن.. شتێکی باش نیە، تێکەڵی لە نێوان کاروباری ئەم دووانەدا بکرێت..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لە ناو هاوەڵانیدا دەبێت، ئەسمائی کچی یەزید دێت بۆ لای پێغەمبەری خوداو پێی دەڵێت: بە دایکمو باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من بە نوێنەری هەموو ئافرەتان هاتوومەتە خزمەتت.. هەموو ئافرەتان چ لە ڕۆژهەڵات بن چ لە ڕۆژئاوا.. ئەم هاتنەی منیان بیستبێت یان نا.. هەمان بۆچوونی منیان هەیە.. خودای پەروەردگار تۆی بۆ ڕەوانە کردین.. بۆ ئافرەتانو پیاوان.. باوەڕمان پێ هێنایت.. باوەڕمان بەو خودایەش هێنا کە تۆی بۆ ناردین.. بەڵام ئێمەی ئافرەتان لە ماڵەوە گەمارۆ دراوین.. لە ماڵەکانتاندا دانیشتووین.. ئارەزووو پێویستەکانتان جێبەجێ دەکەین.. هەڵگرو پەروەردەکاری منداڵەکانتانین.. ئێوەی

پیاوانیش بەهۆی نوێژی هەینیو نوێژە بە کۆمەڵەکانتانەوە پلەوپایەتان لە ئێمەی ئافرەتان بەرزترە..

سەردانی نەخۆش دەکەن.. هەروەها بەشداری بە ڕێکردنی مردوو دەکەن بۆ گۆڕستان.. زۆر حەج ئەنجام دەدەن.. لە هەموو ئەمانەش باشترو گەورەتر، بەشداری کردنتانە لە تێکۆشانو جیهاد کردن لەڕێگەی خودای پەروەردگار..

کاتێك پیاوێك لە ئێوە دەڕوات بۆ حەج یان بۆ عومرە یان بۆ جیهادو تێکۆشان،ماڵو سامانتان دەپارێزین.. منداڵەکانتان پەروەردە دەکەین..

ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا ئێمە بەشداری ئەو هەموو خێرو چاکانە نین؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ بە لای هاوەڵانیدا لایکردەوەو سەیری هەموویانی کردو پاشان فەرمووی: ئایا هەرگیز گوێتان لە قسەی ئافرەتێك بووە، کە لە بارەی ئاینەکەیەوە بدوێت باشترو چاکتر بێت لە قسەی ئەم ئافرەتە؟!

وتیان: نەخێر..

پاشان پێغەمبەری نازدار ﷺ ڕووی کردە ئافرەتەکەو پێی فەرموو: بچۆ بە هەموو ئەو ئافرەتانە بڵێ کە چاوەڕێت دەکەنو مژدەیان پێبدە بەوەی کە: جوان هەڵسو کەوت کردن لەگەڵ هاوسەرەکانیانداو جێبەجێ کردنی داوا ڕەواکانیان، بەرامبەرو یەکسانە بە هەموو ئەو چاکانەی کە پیاوان ئەنجامی دەدەن.. ئافرەتەکە ڕۆیشتو لە خۆشیدا هەر (لا إله إلا الله و الله أكبر)ی دەکرد..

بەڵێ.. ئافرەت فەرمانڕەوای ماڵەکەیەتی.. هەر خۆشی شاژنی ئەو ماڵەیە.. هاوسارەکەشی پادشایەو لە منداڵەکانیشیان بەرپرسن.. بەڵام بەپێی پێویستی ئەم یاسایە دەتوانرێت بگۆڕدرێت، هەروەك لە جەنگی ئوحوددا (نوسەیبەی کچی کەعب) لە ڕیزی جەنگاوەرە موسڵمانەکاندا، لە دژی بێباوەڕان، دەجەنگاو پارێزگاری لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد..

## چەندە لە لامان بەنرخیت..!!

بەڵێ.. لەبەرئەوەی لە لامان بەڕێزیت.. بەرزیت.. پیرۆزیت.. خودای پەروەردگار ڕاسپاردەی باوكو دایكت دەكات، كە هەڵسو كەوتیان لەگەڵت جوان بێت.. پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرمویت: (من عال جاريتين حتى تبلغا.. جاء يوم القيامة أنا وهو.. وضم أصابعَهُ).رواه مسلم.واتە: (هەر كەسێك دوو كچ یان دوو ئافرەت بەخێو بكات، هەتا گەورە دەبنو دەگەنە تەمەنی باڵغ بوون، لە ڕۆژی دواییدا منو ئەو كەسە وەك ئەم

پەنجانەی دەست لێك نزیكین)..

هەروەها كاتێك پیاوێك پرسیار لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەكات‌و دەڵێت: كێ زۆر شایستەی ئەوەیە هەڵسوكەوتم لەگەڵیدا چاك بێت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دایكت.. پیاوەكەوتی: ئەی دوای ئەو؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دایكت.. پاشان هەر دایكت.. بۆ جاری چوارەم فەرمووی: پاشان باوكت..

هەروەها فەرمان دەكات كە پیاوان هەڵسوكەوتیان لەگەڵ ئافرەتان جوان بێت‌و ئەو پیاوانە بە خراپ ناودەبات كە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ خێزانەكانیاندا باش نیە.. لە كاتی حەجی ماڵئاوایشدا.. لە نێوان گەورەو بچوك‌و دەوڵەمەندو هەژاردا.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: لەگەڵ ئافرەتاندا هەڵسوكەوتتان جوان بێت‌و بە چاكی مامەڵەیان لەگەڵ بكەن..

ڕۆژێك كۆمەڵێك لە ئافرەتان سكاڵای خراپ هەڵسوكەوت كردنی مێدەكانیان لە لای خێزانەكانی پێغەمبەری خودا ﷺ دەكەن..

كاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ بەمەی زانی، بە خەڵكەكەی فەرموو: زۆرێك لە ئافرەتان سكاڵای خراپی هەڵسوكەوتی مێردەكانیان دەكەن!! ئا ئەو پیاوانە كەسە چاكەكانی ئێوە نین.. هەروەها فەرمووی: (خيركم خيركم لأهله، وأنا خيركم لأهلي).رواه ابن ماجة والترمذي. واتە: (باشترینی ئێوە ئەوانەن كە لەگەڵ خێزان‌و ماڵ‌و منداڵیان باشن، وە من باشترینی ئێوەم بۆ خێزان‌و ماڵ‌و منداڵم)..

## لە پێناوی تۆدا كاسەی سەرمان دانا..!!

لە پێناوی ڕێزگرتنی ئافرەتدا.. چەندەها جەنگ ڕوویداوە.. كاسەی سەرووردو خاش بووە..

بەڵێ.. لە پێناو ئابرووی تەنها یەك ئافرەتدا.. موسڵمانان خوێن‌و جەستەی خۆیان كرد بە قوربانی..

جولەكەكان لەگەڵ موسڵماناندا لە شاری مەدینە نیشتەجێ بوون.. كاتێك كە فەرمانی باڵاپۆشی لە لایەن پەروەردگارەوە دابەزی بۆ ئافرەتان.. جولەكەكان توورە بوون‌و لە لایان ناخۆش بوو..

حەزیان نەئەكرد ئافرەتانی موسڵمان خۆیان داپۆشن.. زۆر هەوڵیان دەدا تۆوی ناكۆكی‌و دووبەرەكی لە نێوان ئافرەتانی موسڵماندا بچێنن.. بەڵام نەیانتوانی..

لە یەکێك لە ڕۆژەکاندا ئافرەتێکی داوێن پاك لە ئافرەتانی موسڵمان چوو بۆ بازاڕی جولەکەکانو لە دوکانی یەکێك لە زەڕەنگەرە جولەکەکاندا دانیشت.. زەڕەنگەرە جولەکەکە بەم باڵاپۆشیو داپۆشراویەی ئافرەتە موسڵمانەکە نارەحەتو تووڕە بوو.. دەیویست سەیری ڕوخساری ئافرەتەکە بکاتو گاڵتەی پێبکات وەك پێش هاتنی ئاینی ئیسلام ئەم کارانەیان لە دژی ئافرەتان ئەنجام دەدا..

داوایان لە ئافرەتەکە کرد ڕوخساری دەربخات..ویستیان بەهۆی پارەو سامانەوە لە خشتەی بەرن.. بەڵام ئەم ئافرەتە باوەڕدارە ڕازی نەبوو.. زەڕەنگەرەکە ئافرەتەکەی خافڵاند.. لە کاتێکدا ئافرەتەکە دانیشتبوو، لای خوارەوەی کراسی ئافرەتەکەی بەست بە لای سەرپۆشەکەیەوە کە شۆڕ ببوەوە بە سەر پشتیدا..

کاتێك ئافرەتەکە هەڵسا، کراسەکەی لە دواوە بەرزبووەوەو لاشەی دەرکەوتو جولەکەکە پێی پێکەنی.. ئافرەتەکە هاواری کردو خۆزگەی بە مەرگ دەخواست نەك دەرکەوتنی جەستەی..

پیاوێك لە موسڵمانان ئافرەتەکەی بینی.. شمشێرەکەی هەڵکێشاو زەڕەنگەرە جولەکەکەی کوشت.. جولەکەکانیش لە موسڵمانەکە کۆبوونەوەو شەهیدیان کرد..

کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ زانی کە جولەکە پەیمانیان شکاندووەو سوکایەتی بە ئافرەتانی موسڵمان دەکەن.. گەمارۆی جولەکەکانیانداو ویستیان تۆڵەی ئەو ئافرەتە پاكو بەرەوشتە بسەننەوە.. ئا لەم کاتەدا یەکێك لە سەربازەکانی شەیتان.. لەو کەسانەی کە گرنگی بە ئابرووی ئافرەتانی موسڵمان نادەن.. یەکێك لەو کەسانەی کە هەر خەمی تێرکردنی داوێنو سکیانن.. سەرۆکی دووڕووەکان (عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) هەڵساو وتی: ئەی موحەممەد هەڵسوکەوتت لەگەڵ جولەکەکاندا باش بێت..

لە پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا جولەکەکان لایەنگرو پاڵپشتی ئەم دووڕووە بوون.. پێغەمبەری خودا ﷺ بەرپەچیدایەوەو ڕازی نەبوو.. جارێکی تر ئەم دووڕووە قسەکانی دوبارە کردەوە.. هەمدیسان پێغەمبەری خودا ﷺ پشتی تێکردو ڕووی لێوەرگێڕا.. داوای لێبوردنو لێخۆشبوون بۆ کۆمەڵە کەسێك دەکات، کەدەیانەوێت خراپە لە نێوان ئیمانداراندا بڵاوبکەنەوە.. ئەم دووڕووە تووڕە بوو.. دەستی کرد بە پشتێنی زرێکەی پێغەمبەری خوادا ﷺو هەر دوبارەی دەکردەوەو دەیوت: لەگەڵیاندا باش بە.. لەگەڵیاندا باش بە..



پێغەمبەری خودا ﷺ لایکردەوە بە لایداو فەرمووی:وازم لێبێنە.. بەڵام ئەم دووروو‌ە هەر ڕازی نەبوو.. داوای لە پێغەمبەری خودا کرد دەست لە کوشتنیان هەڵگرێت..

پێغەمبەری خودا ﷺ لایکردەوە بە لایداو فەرموی: ئەوانە بۆ تۆ..وازی لە کوشتنیان هێنا، بەڵام لە شاری مەدینە دەریکردن..

## تەنانەت لەسەر دارەمەیتیش..!!

* (إبن عبدالبر) لە کتێبی (الأستيعاب)دا باسی ئەوە دەکات، کەفاطمەی کچی پێغەمبەری خودا ﷺ بەردەوام داپۆشراو بووەو جلو بەرگی باڵاپۆشو پۆشتە بووە.. کاتێك مردنی نزیك بۆوە، بیری لە ئەو کاتە کردەوە کە لاشەکەی لە سەر دارە مەیتێك دادەنێنو بە پەڕۆیەك دایدەپۆشن.. سەیری (ئەسمائی کچی عمیس)ی کردو پێی وت: ئەی ئەسماء، من زۆر ئەوەم لە لا ناشیرینە کاتێك ئافرەتێك دەمرێتو دەیخەنە سەر دارە مەیتو دایدەپۆشنو شێوەی جەستەی دەردەکەوێت بۆ هەموو کەسانەی کە دەیبینن..

ئەسماء وتی: ئەی کچی پێغەمبەری خودا ﷺ من لە حەبەشە شتێکم بینی!!

فاطمە فەرمووی: چیت بینی؟! ئەسماء پەلکە دار خورمایەکی تەڕی هێناو چەماندیەوە، هەتاوەکو کەوانێکی لێهات.. یان هەتاوەکو گومەزێکی لێهات..پاشهن پەڕۆیەکی دا بە سەریداو وتی: ئەی فاطمە ئایا ئەمە باشترو جوانتر نیە؟! لاشەی ئافرەتەکە لە ژێریدا دەرناکەوێتو دەشزانرێت مردووەکە پیاوە یان ئافرەت..

کاتێك فاطمە گیانی سپارد.. بەو شێوەیان لێکرد.. فاطمەی خۆشەویستی پێغەمبەری خودا ﷺ بە مردوویش خەمی داپۆشینی جەستەو لاشەی بوو!! ئەی دەبێت بە زیندوویی چۆن بووبێت؟! پاکیو بێگەردی بۆ خودا!!

ئەی ئەو ئافرەتە موسڵمانانە لە کوێن؟ ئەوانەی کە خوداو پێغەمبەرەکەیان خۆش دەوێت.. دڵیان شەیدای بەهەشتە.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتیوا هەیە ئەچێت بۆ ئارایشتگاو جەستەو لەشو لاری دەردەخاتو زۆر بە ملکەچیەوەو بە ئارەزووی خۆی دەچێتە بەر دەست ئافرەتێکی تر بۆئەوەی سەرو قژو دەمو چاوی بۆ چاك بکات.. لەمەش زۆر ناشیرینترو ئابرووبەرتر ئەوەیە، کە ئێستا لە زۆر شوێن پیاوان هەڵدەستن بەو کارەو ئافرەتانیش زۆر بە گوێڕایەڵیەوە لەبەر دەستیاندا دادەنیشن!!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (ما من إمرأة تضع ثيابها، في غير بيت زوجها، إلا هتكت الستر بينها وبين ربها). رواه الترمذي. واتە: (هەر ئافرەتێك لە غەیری ماڵی مێردەکەی

جل‌و بەرگەکانی دابنێت، ئەوا پەردەی شەرم‌و حەیای نێوان خۆی‌و خودای دراندووە)..

هەروەها دەفەرموێت: ( شرّ نساءكم المتبرجات، المتخيلات، وهن المنافقات، لا يدخل الجنة منهن إلا مثل الغراب الأعصم).رواه البيهقي. واتە: (خراپترینی ئافرەتەکانتان ئەوانەن کە ڕووت‌و قوت‌و سفورن،ئەوانەی بەلارو لەنجەوە دەڕۆن، ئەوانە دووڕوو و گوناهبارن، چەندێك قەلە ڕەشی سپی هەیە، ئەوانە ئەوەندەیان لێدەچێتە بەهەشت)..

ئەی ئەو ئافرەتە موسڵمانانە لە کوێن، کە هیوای ئەوەمان پێیانە ئاینی ئیسلام سەر بخەن؟! گیانیان بە قوربانی ئەم ئاینە بکەن.. بەڵام سەیرەکەی یەکێکیان جل‌و بەرگی پیاوان لەبەر دەکات.. یان پێڵاوی پاژنە بەرز لە پێ دەکات.. پاشان دەچێت بۆ بازارو باخچەکان‌و فەرمانگەکان‌و دەڵێت: خۆ کەس نامبینێ تەنها براو کەس‌وکارم نەبێت.. یان دەڵێت: من لە ناو ئافرەتاندا بەم شێوەیە دەردەکەوم‌و خۆم دەگۆڕم.. هەندێك لە ئافرەتان هەر بەمەوازناهێنن کە خۆیان تاوان‌و سەرپێچی ئەنجام بدەن، بەڵکو ئافرەتانی تریش بەرەو گوناهو تاوان پەلکێش دەکەن..وێنەی خراپ‌و ناشایستە بڵاو دەکەنەوە، یان ژمارەی مۆبایل‌و تەلەفۆن‌و ئەو گۆڤارانە بڵاودەکەنەوە کە لێوان لێوە لە خراپەو بێ ئابڕوویی، پەنا بە خودا!!

خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النور/١٩ واتە: (بە ڕاستی ئەو کەسانەی حەز دەکەن زیناو تاوان‌و گوناه لە ناو ئەوانەدا بڵاوبێتەوە کە باوەڕیان هێناوە، سزای پڕ ئێش‌و ئازار لەم جیهان‌و لەو جیهان بۆیان ئامادەیە‌و خودا خۆی چاك دەزانێت (سەرەنجامی زیناو داوێن پیسی بەرەو کوێ دەچێت) ئێوە نایزانن)..

## ئافرەتی هەژار..!!

ئەگەر ئافرەتێك‌واز لە باڵاپۆشی‌و پۆشتەیی بهێنێت‌و بەرەو جل‌و بەرگی سفوری‌و ڕووت‌و قوتی بچێت، ئەوا ژیانی بەرەو داڕوخان دەچێت‌و لە لای خەڵکیش دەبێتە کەسێکی بێزراوو ناشیرین..

پرسیارم لە کۆمەڵێك لاو کرد، ئەو لاوانەی بەردەوام شوێنی ئافرەتان دەکەون‌و لە بازارو خوێندنگەو زانکۆکاندا چاودێریان دەکەن‌و ڕێگە بە ئافرەتان دەگرن، پێم‌وتن: چۆن دەڕوانن بۆ ئەو ئافرەتانەی کە بەدەم داواکاریەکانتانەوە دێن؟

هەموویان وتیان: سوێند بە خودا ڕقمان لێیان دەبێتەوەو گاڵتە بە عەقڵیان دەکەین‌و

کاتێکیش ئارەزووەکانمانیان پێ تێر دەکەین، بە قاچەکانمان شەقیان لێدەدەین و فڕێیان دەدەین!!

یەکێکیان وتی: کاتێك دەچم بۆ بازاڕو ئافرەتێکی داپۆشراوی ڕێك و پێك دەبینم.. زۆر لە لام گەورەو بەڕێزەو بە هیچ شێوەیەك ناوێرم نزیکی بکەوم.. ئەگەر کەسێکیش ببینم کە لێی نزیك دەبێتەوە، ئەوا دەچم بە گژیدا..

★ خوشکی بەڕێزم: سەیری ئەوە بکە لەو وڵاتانەدا چی ڕوودەدات کە بانگەشەی ئازادی بۆ ئافرەتان دەکەن..

ڕۆژانە لەوڵاتێکی وەك ئەمریکادا (١٩٠٠) کچ بە زۆر داوێن پیسیان لەگەڵ دەکرێت!! (٢٠٪)یان لە لایەن باوکیانەوە دەست درێژیان دەکرێتە سەر..

ساڵانە لە ئەمریکادا ملیۆنێك منداڵ دەکوژرێت، ئەمەش یان بەهۆی لەباربردنی بە ئەنقەست، یان کوشتنیان یەکسەر لە دوای لە دایك بوون..

ڕێژەی تەڵاق و جیابوونەوە لە ئەمریکادا گەیشتووەتە (٦٠٪)..

لە بەریتانیا لە هەموو هەفتەیەکدا (١٧٠) کچی گەنج بە شێوەی ناشەرعی دووگیان دەبن..

★ خوشکی ئازیز: زۆر ئافرەت هەیە شوێن ئارەزووەکانی دەکەوێت، نەك شوێن بەرنامەکەی خودا.. شوێن ئارەزووەکانی دەکەوێت لە جل و بەرگ لەبەرکردنیدا.. لە خاڵ کوتانیدا.. لە گوێگرتن بۆ گۆرانی و سەیرکردنی فیلمدا.. لە خوێندنەوەی گۆڤاری بێ سوودو بێ نرخدا.. ئەو کاتە لە خودا یاخی دەبێت.. ئاگریش بۆ سزای یاخی بووان دروست کراوە..

ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: ڕۆژێك لە خزمەت پێغەمبەری خودادا بووین و گوێمان لە دەنگێك بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەزانن ئەو دەنگە چی بوو؟ وتمان.. خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانێت، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەوە بەردێك بوو ماوەی حەفتا پایزە یان حەفتا ساڵە نێردراوە بۆ دۆزەخ، ئا ئێستا گەیشتە جێگەو قوڵایی خۆی..

ئەمە حاڵی ئەو کەسەیە کە لە خودا یاخی بێت.. ئەو کەسەی کە دوارۆژی پشت گوێ بخات.. ئەگەر کەسێك بخرێتە ئاگری دۆزەخەوەو پاشان دەری بهێنن و بیهێننە سەر زەوی، ئەوا هەموو خەڵکانی سەر زەوی لەبەر ناخۆشی بۆنەکەی و لەبەر ناشیرینی و تێکچوونی شێوەی، گیانیان دەردەچێت و دەمرن!! پەنا بە خودا..

## خەمی گەورە..!!

★ خوشکی بەڕێز: تەنها بۆ خۆت مەژی.. بەڵکو خەمی ئەم ئاینە هەڵبگرەو کەمێك لە نارەحەتیەکانی بخەرە سەر شانت.. تەنها بیر لە جل‌و بەرگ‌و پێڵاو مەکەرەوە.. بە دڵنیاییـــەوە خەمی زۆر گەورەو گرنگ، ئەوەیە کـــە چۆن خزمەتی ئەم ئاینە بکەیت.. کاتێـــك ئافرەتێکی یاخی‌و ســـەرکەش دەبینی، چۆن ئامۆژگـــاری بکەیت‌و بۆ لای ئاینی پەروەردگـــار بانگی بکەیت.. تۆ لە هەر کوێ بیـــت زۆر بەرزو پیرۆزیت.. کاتێك لەگەڵ ئافرەتاندا دادەنیشیت، هەوڵبدە سوودیان پێبگەیەنیت.. کاسێت‌و نامیلکەی بەسوودیان بە ســـەردا دابەش بکەو ئامۆژگاریان بکە.. خودای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ فصلـت/٣٣ واتە: (کێ لەو کەســـە جوان گوفتارترو قســـەی بەجێ‌ترە کە بانگەوازی کـــردووە بۆ لای خوداو کارو کردەوەی چاکیشی ئەنجامداوەووتوشیەتی بە ڕاستی من لە ڕیزی موسڵمانانندام)..

ئێمەش باوەڕمان‌وایە، کە تۆش ئافرەتی چاکەکار بیت.. ئەو ئافرەتانەی کەچاویان لە ئاســـت پیاواندا دادەخەن.. بەڵکو چاویان لە ئاســـتی ئەو ئافرەتانەشدا دادەخەن کە ســـەرپێچیکەرن‌و جل‌و بەرگیان پۆشـــتە نیە.. هەر ئافرەتێکیش سەیرکردنی حەرامی لـــە لا ئاســـایی بوو.. هەروەهـــا ڕێگەی بە خۆیدا کـــە لەگەڵ پیاوی بێگانـــەدا بە تەنها پێکەوەبن.. ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەم کارانەی بەرەو زیناو داوێن پیســـی ڕای دەکێشـــن.. خـــودای پەروەردگاریـــش دەفەرموێـــت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ الإســـراء/٣٢ واتە: (هەرگیز نەکـــەن توخنی زینا بکەون‌و لێی نزیـــك ببنەوە، چونکە بە ڕاستی زینا هەڵەو گوناهو تاوان‌و ڕێچکەیەکی زۆر خراپ‌و ناقۆڵایە)..

پێغەمبەری خودا ﷺ لە شـــوێنێکی‌وەك تەنوردا، کە ژێرەوەی فراوان‌و ســـەرەوەی تەسك بووە، ئافرەتان‌و پیاوانی ڕووت‌و قوتی بینیوەو لە تاو بڵێسەو گەرمی ئاگرەکەی ناوی هاواریان دەکرد.. پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: بە جوبرائیلم فەرموو: ئەمانە کێن؟! فەرمـــووی: ئەمانە ئافرەتان‌و پیاوانی زیناکارن.. لەم ســـزاو نارەحەتیەدا دەبن هەتا ڕۆژی دوایی‌و سزای دوا ڕۆژیشیان زۆر بە ئێش‌و ئازارو بەهێزترو نەبڕاوەترە..

داوا لە خودای پەروەردگار دەکەین کە بمان پارێزێت.. هەر کەسیش لەبەر خوداواز لە کارێك بهێنێت، خودای گەورە بە شتێکی باشتر پاداشتی دەداتەوە..

## چیرۆک..

★ دیمەشقی لە کتێبی (مطالع البدور)دا دەڵێت: ئەمیری ئەو کاتەی قاهیرە (شجاع الدین الشرزی)وتویەتی: ئێمە لە شاری (صعید) لە لای پیاوێك بووین.. پیاوەکە پیاوێکی بە تەمەن بوو.. زۆریش ڕەش بوو.. بەڵام منداڵەکانی زۆر سپی‌و جوان بوون.. دەربارەی منداڵەکانی پرسیارمان لێکرد..وتی: ئەم مندالانە دایکیان فەرەنگیە (إفرنجی)، من‌و دایکی ئەم منداڵانە چیرۆك‌و بەسەرهاتێکمان هەیە..وتی: لە کاتی جەنگی داگیرکاری خاچ پەرستەکاندا چووم بۆ شام.. لەو کاتەدا گەنج بووم.. دوکانێکم بە کرێ گرت‌و قوماشی کەتانم تێیدا دەفرۆشت.. ڕۆژێك لە دوکانەکەمدا بووم، ژنێکی فەرەنگی کە خێزانی یەکێك لە سەرکردەی خاچ پەرستان بوو، هات بۆ لام.. جوانیەکەی سەرسامی کردم.. شتم پێ فرۆشت‌و زۆریشم خاتر گرت.. پاشان ڕۆیی‌و پاش چەند ڕۆژێك هاتەوەو بەهەمان شێوەی پێشوو زۆر خاترم گرت‌و بەردەوام ئەهاتەوە بۆ لام‌و ئەشیزانی کە شەیدای بووم.. تا گەیشتە ئەوەی حاڵەتەکەمم بۆ ئەو پیرەژنە باس کرد، کە لەگەڵیدا بوو.. پێم‌وت: شەیدای ئەو ئافرەتە بووم.. بە چ ڕێگەیەك دەتوانم کە پێی بگەم؟! پیرەژنەکەوتی: ئەم ئافرەتە هاوسەری یەکێك لە سەرکردەی خاچ پەرستەکانە‌و ئەگەر پێمان بزانێ هەر سێکمان دەکوژێت.. هەر بەردەوام بووم لەگەڵیدا، هەتا داوای پەنجا دیناری لێکردم‌و لەبری ئەوە ئافرەتەکەم بۆ بهێنێت بۆ ماڵەوە.. زۆر تێکۆشام تا پەنجا دینارەکەم کۆکردەوەو دام پێی..

## شەوی یەکەم..

لەو شەوەداو لە ماڵەکەمدا چاوەڕێیم دەکرد.. کاتێك هات بۆ لام، بەیەکەوە نانمان خوارد.. بەشێك لە شەو تێپەڕی.. بە خۆمم‌وت: ئایا شەرم لە خودای پەروەردگار ناکەی؟! تۆ لێرەدا ڕێبوارو نامۆیت.. لەبەردەم هێزو دەسەڵاتی خودای گەورەدایت.. لەگەڵ ئافرەتێکی گاوردا سەرپێچی خودای پەروەردگار دەکەیت..

چاوەکانم بۆ ئاسمان بەرزکردەوەووتم: خودایە بە شایەدبە لەبەرخاتری تۆ لەگەڵ ئەم ئافرەتە گاورەدا داوێن پاك دەبم.. لەبەر شەرمی تۆ.. لە ترسی سزای تۆ.. پاشان لە جێگەکەم هەڵسام‌و چووم بۆ جێگەیەکی تر.. کاتێك ئافرەتەکە ئەمەی لێبینیم زۆر تووڕە بوو.. هەڵساو ڕۆیشت.. بۆ بەیانی چووم بۆ دوکانەکەم‌و نزیك چێشتەنگاو هاتەوە بۆ لام‌و زۆر تووڕە بوو.. سوێند بە خودا ڕوخساری‌وەك مانگ‌وابوو.. کاتێك بینیم، لە دڵی خۆمداوتم: تۆ کێیت تا لە بەرامبەر ئەم ئافرەتە جوانەدا بە شەرم‌و

حەیا بێت؟! تۆ ئەبوبەکریت؟! یان عومەریت؟! یان جونەیدی خودا پەرستیت؟! یان حەسەنی دونیا نەویستیت؟! زۆر خەمو خەفەتم خواردو حەسرەتم بۆ هەڵکێشا..
کاتێك رۆی، پەیوەندیم بە پیرەژنەکەوە کردو پێموت: شەوێکی تر بۆم بهێنەوە..
پیرێژنەکەوتی: سوێند بە خودا بۆت ناهێنم بە سەد دینار نەبێت..
وتم: باشە.. هەوڵو کۆششێکی زۆرمدا هەتا پارەکەم کۆکردەوەو دام پێی..

## شەوی دووەم..

کاتێك شەو داهات.. لە ماڵەوە چاوەڕێم دەکرد.. هات..وەکو مانگی چواردە وابوو.. کاتێك لە لام دانیشت.. ترسی خودا دایگرتم.. چۆن لەگەڵ گاورێکی بێباوەڕدا سەرپێچی خودا بکەم.. لە ترسی خوداوازم لێهێنا..
بۆ بەیانی چووم بۆ دوکانو بیرو هۆشو دڵو دەروونم هەر لە لای ئەو بوو.. لە چێشتەنگاودا بە لامدا تێپەڕیو زۆر تووڕە بوو.. کاتێك بینیم، زۆر سەرزەنشتی خۆمم کرد، کەوازم لەم ئافرەتە جوانە هێناوە.. زۆر بە داخ بووم بۆی..
هەمدیسان داوام لە پیرەژنەکە کردەوەو ئەویش‌وتی: یان بە پێنج سەد دینار بۆت دەهێنم، یان دەبێت بە داخو حەسرەتیەوە بمریت..
وتم: باشە، ویستم دوکانو شتومەکەکانم بفرۆشمو پێنج سەد دینارەکەی بدەمێ.. کاتێك من لەم حاڵەتەدا بووم بانگکەرێك لە خاچ پەرستەکان لە بازاردا هاواری دەکردو دەیوت: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئەو ئاگربەستەی لە نێوان ئێمەو ئێوەدا هەبوو هەڵوەشایەوەو تەواو بوو.. بازرگانە موسڵمانەکانیش ماوەی یەك هەفتەیان مۆڵەتە لێرە.. ئەو کەلو پەلانەی کە مابووم، کۆم کردەوەو بە ئاخو حەسرەتەوە شامم بەجێ هێشت.. پاشان دەستم کرد بە کڕینو فرۆشتنی کەنیزەك، بەو هیوایەی خۆشەویستی ئەو ئافرەتە لە دڵم دەرچێتو بیرم بچێتەوە..
سێ ساڵ تێپەڕیو پاشان شەڕی (حطين) روویداو موسڵمانان زەویە داگیرکراوەکانیان گێرایەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆیان.. ڕۆژێك داوای کەنیزەکێکیان لێکردم بۆ ناصر پاشا.. منیش کەنیزەکێکی زۆر جوانم لە لابوو.. بە سەد دینار لێیان کڕیم.. نەوەد دیناریان پێدامو دە دیناریان لا مایەوە.. پادشاوتی: بیبەن بۆ ئەو خانووەی ئافرەتە فەرەنگیەکانی لێیەو با یەکێکیان هەڵبژێرێت لە باتی ئەو دە دینارە..

## خەڵات..

کاتێك دەرگایان لێکردمەوە.. ئافرەتە فەرەنگیەکەی شامم بینیو ئەوم هەڵبژارد.. کاتێك چووینەوە بۆماڵەوە پێم‌وت: ئایا دەمناسیت؟!

وتی: نەخێر!!

وتم من بازرگانە کەتانە فرۆشەکە بووم.. ئەو کەسەی کە سەدو پەنجا دینارت لێسەندمو پاشان‌وتت: بە پێنج سەد دینار نەبێت، پێم دڵخۆش نابیت.. ئەوە تا ئێستا تۆم دەستکەوت بە دە دینار.. ئافرەتەکەوتی: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله).. زۆر بە باشی موسڵمان بوو.. پاشان مارەم کرد.. پاشان دایکی سندوقێکی بۆ نارد.. کاتێك کردمانەوە، دوو پەڕۆی پێچراوەی تێدا بوو.. یەکەمیان پەنجا دینارو دووەمیان سەد دیناری تێدا بوو.. هەروەها ئەو جلو بەرگانەشی تێدا بوو کە لەبەریدا بینی بووم.. ئەو ئافرەتە دایکی ئەم منداڵە سپی پێستانەیە.. هەر ئەویش بوو نانو خواردنی ئێوارەی بۆ لێنابوون..

بەڵێ.. هەر کەسێك لەبەر خاتری خوداواز لە شتێك بهێنێت.. خودای گەورە بە شتێکی باشتر پاداشتی دەداتەوە.. هەندێك جار مرۆڤ دەتوانێت خۆی لە خەڵکی بشارێتەوە.. بەڵام چۆن دەتوانێت خۆی لە خودای پەروەردگار بشارێتەوە، کە هیچ کارێکی نهێنیو ئاشکرای لێوون نابێت..

## ئەو ئافرەتەی لە رووباردا نوقم بوو..!!

ئافرەتی پاك داوێن.. ئابرووی خۆی لەکەدار ناکات.. ئەگەر پاراستنی ئەو ئابرووەش ببێتە هۆی لە دەست دانی گیانیشیو بشکوژرێت..

★ (محمود شیت خطاب) لە کتێبی (عدالة السماء) دا باسی ئەم رووداوە دەکاتو دەفەرموێت: نزیکەی پێش چل ساڵ لەمەوپێش لە شاری بەغداد پیاوێك قەسابی دەکردو گۆشتی دەفرۆشت.. لە پێش نوێژی بەیانیدا دەچوو بەرەو دوکانەکەیو مەڕەکانی سەردەبڕیو پاشان دەگەڕایەوە بەرەو ماڵەوە.. پاشان دوای ڕۆژهەڵاتن دوکانەکەی دەکردەوە بۆئەوەی گۆشتەکان بفرۆشێت..

شەوێك لە شەوەکان دوای ئەوەی ئاژەڵەکانی سەربڕیو لە تاریکی شەودا گەڕایەوە بەرەو ماڵەوە..جلو بەرگەکانی خوێناوی ببوون.. لە نێوان ڕێگەکەداو لە یەکێك لە کۆڵانەکاندا گوێی لە هاوار هاوار بوو.. ئەمیش بە پەلە بەرەو لای هاوارەکە چوو.. لەپڕ کەوت بە سەر لاشەی پیاوێکدا، کە چەندان لێدانی چەقۆی پێوە بوو.. خوێنی

لەبەر دەرۆی.. چەقۆی ئەم پیاوە کەوتە سەر لاشەکە.. چەقۆکەی هەڵگرتەوەو هەوڵیدا پیاوە بریندارەکە هەڵبگرێتو یارمەتی بدات.. بەڵام بریندارەکە مردو جلو بەرگی گۆشت فرۆشەکەش بە خوێنی بریندارەکە سور بوو.. لەپڕ خەڵکی کۆبوونەوە.. کاتێك چەقۆکەیان بە دەستەوە بینیو بینیان جلو بەرگەکانی خوێنیان پێوەیە.. ئەم پیاوە زۆر ترساو شڵەژا.. تۆمەتباریان کرد بە کوشتنی کوژراوەکە..

پاشان بڕیاری کوشتنی بە سەردا درا.. کاتێك ئامادە کرا لە گۆڕەپانێکدا بۆئەوەی بیکوژنەوەو دڵنیا بوو کە دەیکوژنەوە، هاواری بۆ خەڵکەکە کردووتی: ئەی خەڵکینە.. سوێند بە خودا من ئەو پیاوەم نەکوشتووە.. بەڵام بیست ساڵ پێش ئێستا کەسێکی ترم کوشتووە.. ئەوەتا ئێستا لە تۆڵەیدا دەکوژرێمەوە.. پاشانوتی: ئەو کاتە من گەنج بووم.. لەمبەرو ئەوبەری روباری دیجلەدا خەڵکم دەپەڕاندەوە..

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئافرەتێکی دەوڵەمەند لەگەڵ دایکیدا هاتو منیش پەڕاندمنەوە.. پاشان بۆ ڕۆژی دوایی هاتنەوەو لە نزیکمەوە سواربوون.. لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاردا دڵموابەستەو شەیدای ئەو کچە بوو.. ئەویش بە هەمان شێوە.. داخوازیم لە باوکی کرد.. بەڵام لەبەر هەژاریم ڕازی نەبوو.. دوای ئەوە پەیوەندیمان پێکەوە پچڕا.. نە خۆیو نە دایکیم نەبینیەوە.. بەڵام من هەر دڵم لە لای ئەو کچە بوو..

دوای دوو سێ ساڵ لە بەلەمەکەمدا چاوەڕێی نەفەرم دەکرد.. ئافرەتێك لەگەڵ منداڵە ساواکەیدا هاتن بۆ لام.. دوای لێکردم کە بیانپەڕێنمەوە.. کاتێك سەرکەوتنو گەیشتینە ناوەڕاستی ڕوبارەکە، سەیریم کرد.. زانیم کە کچەکەی پێشووە.. ئەو کچەی کە باوکی لەیەکی جیاکردینەوە.. بە بینینەوەی زۆر دڵخۆش بووم..

سەرەتا باسی ئەو پەیمانەم بۆ کرد، کە بەیەکمان دابوو.. هەروەها باسی خۆشەویستی خۆمم بۆ کرد.. بەڵام ئەو زۆر بەڕێزو شەرمەوە دەدواو هەواڵی پێدام، کە شووی کردووەو ئەمەش منداڵی خۆیەتی..

پاشان شەیتان تاوانو گوناهو دەست درێژی کردنە سەر ئەو ئافرەتە بەستەزمانەی بۆ ڕازاندمەوە.. لێی نزیك بوومەوە.. هاواری لێکردمو خودای بیرخستمەوە.. بەڵام من گوێم لێنەگرت.. ئەو بەستەزمانە بە پێی توانا پارێزگاری لە خۆی دەکرد.. منداڵەکەش هەر هاواری دەکرد.. منداڵەکەم لە دەست سەندو لە ئاوەکەم نزیك کردەوەو پێموت: ئەگەر ملکەچم نەبیت، منداڵەکەت لە ئاوەکەدا نقوم دەکەم.. زۆر گریاو لێم پاڕایەوە.. بەڵام من زۆر بە دڵڕەقی گوێم لێنەگرتو ئاوڕیشم لێنەدەدایەوە.. سەری منداڵەکەم دەخستە



ئاوەکەوە، تا بە تەواوی لە مردن نزیك دەبۆوەو پاشان دەرم دەهێنا، ئافرەتەکەش سەیری دەکردمو هەر دەگریاو داوای یارمەتی لێدەکردم.. بەڵام سور بوو لە سەر ڕەدکرنەوەی داواکەم.. ئەمجارەش سەری منداڵەکەم لە ئاوەکەدا نقوم کردەوەو خەریك بوو بە تەواوی بخنکێت.. دایکیشی هەر سەیری دەکردو لە تاو منداڵەکەی چاوی دادەخست.. منداڵەکەش هەر دەستو قاچی دەجوڵاند.. هەتا هێزی تێدا نەماو لە جوڵە کەوتو خنکا.. بە مردوویی لە ئاوەکە دەرم هێناو پاشان فڕێم دایە ناو ئاوەکەوە..

لە ئافرەتەکە نزیك بوومەوەو لێی چوومە پێشەوە.. بە هەموو هێزو توانایەوە بەرەنگارم بۆوەو پاڵی پێوەنام.. بەڵام من بە قژی ڕامکێشاو لە ئاوەکەم نزیك کردەوەو سەریم خستە ئاوەکەوەو پاشان دەرم هێنا.. بەڵام ئەو ئافرەتە سور بوو لە سەر ئەنجام نەدانی کاری ناشایستە.. کاتێك دەستەکانم هیلاك بوون.. سەریم لە ئاوەکەدا نقوم کرد.. هەتا جوڵەی تێدا نەماو گیانی سپارد.. ئەویشم فڕێدایە ئاوەکەوەو پاشان گەڕامەوەو هیچ کەسیش بە تاوانە چەپەڵەکەمی نەزانی.. پاكو بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە مۆڵەت دەدات، بەڵام کەس پشت گوێ ناخات..

کاتێك خەڵکەکە گوێیان لەم ڕووداوە بوو هەموو دەستیان کرد بە گریانو پاشان لە ملیاندا.. ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعۡمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ إبراهيم/٤٢ واتە: (وا مەزانە خودا بێ ئاگایە، لەوەی کە ستەمکاران دەیکەن)..

دەی با لە حاڵی ئەو ئافرەتە پاك داوێنو ڕەوشت بەرزەوردبینەوە.. ئەو ئافرەتەی لەبەر چاوی جگەرگۆشەکەی کوژرا.. پاشان خۆشیان کوشت.. بەڵام ئامادە نەبوو ئابرووی خۆی لەکەدار بکات.. ئەمەش بەشێکە لە هەواڵی کەسانی ڕەوشت بەرزو بە ئابروو..

## فرۆشیارێکی دەسگێڕی داوێنپاك..

* (إبن جوزي) لە کتێبی (المواعظ)دا باسی ئەم ڕووداوە دەکاتو دەفەرموێت: گەنجێکی هەژار لە ڕێگەوبانەکاندا دەستگێڕی دەکردو شمەکی دەفرۆشت.. ڕۆژێك بە بەردەم ماڵێکدا تێپەڕی.. ئافرەتێك وەستاندیو پرسیاری شمەکەکانی لێکرد.. گەنجەکەش وەڵامی دایەوە.. ئافرەتەکە داوای لێکرد بچێتە ژوورەوە تا بە تەواوی شمەکەکان ببینێت..

کاتێك گەنجەکە چووە ژوورەوە، ئافرەتەکە دەرگاکەی لە سەر داخست.. پاشان داوای کاری خراپو داوێن پیسی لێکردو بە سەر گەنجەکەدا هاواری کردووتی: سوێند بە خودا ئەوەی دەمەوێت ئەنجامی نەدەیت، هاوار دەکەم.. ئەوسا خەڵکی کۆدەبنەوەو

پێیان دەڵێم: ئەو گەنجە هاتووەتەماڵەکەمو دەست درێژیم دەکاتە سەر.. ئەوسا ئەوەی چاوەڕێت دەکات بریتیە لە کوشتن یان بەند کردن..

گەنجەکە ویستی ترسی خودای بیربهێنێتەوە، بەڵام دڵی نەجوڵاو سودی نەبوو.. کاتێك بینی ئافرەتەکە سورە لە سەر داواکەی، پێی وت: ئەمەوێت بچم بۆ سەرئاو.. کاتێك چووە سەر ئاو، دەستی کرد بە سەرئاوەکەداو هێنای بە جلو بەرگو لاشەیدا.. پاشان چوو بۆ لای ئافرەتەکە.. کاتێك ئافرەتەکە بەم شێوەیە بینی هاواری کردو شمەکەکانی فرێداو لە ماڵەکەی دەریکرد.. گەنجەکە ڕۆی..

بەڵێ ڕۆیشت.. لە ڕێگە منداڵ بە دوایدا هاواریان دەکرد: شێتە.. شێتە.. هەتا گەیشتەوە ماڵەوەو خۆی شۆری.. لە دوای ئەم ڕووداوەوە هەتا ئەو کاتەی گیانی سپارد، بۆنی میسکی لێدەهات..

## فرمێسکی تۆبەکاران.. !!

★ (إبن قدامة) لە کتێبی (التوابین)دا دەگێڕێتەوە، کە چەند کەسێکی لادەرو خراپ داوا لە ئافرەتێکی زۆر جوان دەکەن، کە خۆی بخاتە بەردەست (ربیعی کوری خیثم) بەڵکو بیخاتە داویەوە.. هەزار درهەمیشیان بۆ دیاری کرد ئەگەر ئەو کارە بکات..

ئافرەتەکە جوانترین جلو بەرگی لەبەرکرد.. خۆشترین بۆنی لە خۆیدا، پاشان چوو بۆ لایو لە کاتی هاتنە دەرەوەی لە مزگەوت خۆی نیشاندا.. کاتێك ئەم پیاو چاکە ئافرەتەکەی بینی، لەم کارەی ئافرەتەکە ترسا.. ئافرەتەکە بە جلو بەرگێکی ناشایستەوە لێیهاتە پێشەوە..

(ربیع) پێی وت: حاڵت چۆن ئەبێت ئەگەر تایەکت تووش بێت، کە ڕەنگو جوانیەکەت بگۆڕێتو ناشیرینت بکات؟!

ئەی ئەگەر ئێستا فریشتەی گیان کێشان بێتو گیانت بکێشێت؟!

ئەی ئەو کاتەی کە نەکیرو مونکیر پرسیارت لێدەکەن، چیان وەڵام دەدەیتەوە؟!

ئافرەتەکە هاواری کردو گریا.. پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.. لە دوای ئەو ئامۆژگاریانە، ئافرەتەکە هەر خەریکی خوداپەرستی بوو.. هەتا ئەو کاتەی لە دونیا دەرچوو..

★ هەروەها (العجلي) لە کتێبی مێژووەکەیدا دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێکی زۆر جوان هەبوو لە شاری مەککە.. ئەم ئافرەتە شووی کرد بوو.. ڕۆژێك ئەم ئافرەتە لە ئاوێنەدا سەیری ڕوخساری خۆی کردو بە هاوسەرەکەیوت: ئایا کەسێك هەیە ئەم ڕوخسارەی من ببینێو سەرگەردانو شەیدام نەبێت؟!

هاوسەرەکەی وتی: بەڵێ..

ئافرەتەکە وتی: ئەو کەسە کێیە؟!

هاوسەرەکەی وتی: (عوبەیدی کوڕی عومەیر)ـە.. ئەو پیاوە خوداپەرستو دونیانەویستەی کە لە حەرەمی مەککەدایە..

ئافرەتەکە وتی: ئەی ئەگەر ڕوخسارم بۆ دەرخستو خستمە داوی خۆمەوە؟!

هاوسەرەکەی وتی: دەی ئەوا مۆڵەتم دای..

ئافرەتەکە چوو بۆ لای بە شێوەی پرسیارکەرو بە تەنها لە گۆشەیەکی مزگەوتی حەرەمی مەککەدا مانەوە.. ڕوخساری بۆ دەرخست..وەك بەشێکی مانگ ئەدرەوشایەوە..

پیاوە خوداناسەکە پێی وت: ئەی بەندەی خودا.. ڕوخسارت داپۆشەو لە خودا بترسە..

ئافرەتەکەوتی: من شێتو شەیدای تۆم!!

پیاوەکە وتی: هەندێك پرسیارت لێدەکەم، ئەگەر ڕاستم پێ بڵێیت ئەوا منیش گوێ لە داواکاریەکەت دەگرم..

ئافرەتەکە وتی: هەر پرسیارێکم لێبکەیت بە ڕاستیوەڵامت دەدەمەوە..

پیاوەکە وتی: کاتێك فریشتەی گیان کێشان بێتو گیانت بکێشێت، ئەگەر داواکاریەکەتم جێبەجێ کرد، ئایا دڵخۆش دەبیت؟!

ئافرەتەکە وتی: نە بەخودا..

پیاوەکە وتی: کاتێك بتخەنە گۆڕەوەو دانیشی بۆئەوەی پرسیارت لێبکەن، ئەگەر داواکاریەکەتم جێبەجێ کرد، ئایا دڵخۆش دەبیت؟!

ئافرەتەکە وتی: نە بەخودا..

پیاوەکەوتی: ئەو کاتەی کە خەڵکی نامەی کردارەکانیان وەردەگرنو تۆش نەزانی بە دەستی ڕاستت یان چەپتوەریدەگری، ئایا دڵخۆش دەبیت، ئەگەر داواکاریەکەت جێبەجێ بکەم؟!

ئافرەتەکە وتی: نە بەخودا..

پیاوەکە وتی: ئەی ئەگەر بتەوێت بە سەر پردی (صراط)دا بپەڕیتەوەو نەزانی ڕزگارت دەبێت یان نا، ئایا دڵخۆش دەبیت ئەگەر داواکاریەکەت بۆ جێبەجێ بکەم؟!

ئافرەتەکە وتی: نە بەخودا..

پیاوەکە وتی: ئەی ئەو کاتەی لە ڕۆژی دواییدا کردارەکانت دەکێشن‌و تۆش نازانی تەرازووی کردارە چاکەکانت قورسە یان سوك، ئایا دڵخۆش دەبیت، کە ئەم داواکاریەت جێبەجێ بکەم؟!

ئافرەتەکە وتی: نە بەخودا..

پیاوەکە وتی: ئەی ئەو کاتەی لەبەر دەست خودای پەروەرگاردا ڕادەوەستێنرێیت بۆ لێپرسینەوە، ئایا دڵخۆش دەبیت ئەگەر داواکاریەکەتم جێبەجێ کردبێت؟!

ئافرەتەکە وتی: نە بەخودا..

پیاوەکە وتی: ئەی بەندەی خودا لە خودا بترسە.. خودای گەورە نازو نیعمەتی زۆری بە سەردا ڕژاندویت‌و چاکەی زۆری لەگەڵ کردوویت..

ئافرەتەکە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.. هاوسەرەکەی لێی پرسی: چیت کرد؟

ئافرەتەکە وتی: منیش‌و تۆش لە سەر ڕێگەو کاری خراپ‌و پروپوچین.. ئێمە دەست بەتاڵ‌و بێکارین، خەڵکی خوداپەرستی دەکەن‌و خۆیان بۆ ڕۆژی دوایی ئامادە دەکەن، من‌و تۆش خەریکی چین؟! لە دوای ئەمە ئیتر ئەم ئافرەتە ڕووی کردە نوێژو ڕۆژووو خوداپەرستی هەتا ماڵئاوایی لە دونیا کرد..

## خۆشبەختی بۆ ئەو..!!

هەر کاتێك ئافرەت زیاتر خودای خۆی ناسی، ئەوا زیاتر ترسی خودای لە دڵدا دروست دەبێت‌و لێی نزیك دەبێتەوە.. ئەگەر گوناهێك یان سەرپێچیەکیشی ئەنجامدا، ئەوا بە پەشیمانی‌و چاوی پڕ ئەسرینەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خودای پەروەردگار.. لە تاوان‌و گوناه دەترسێت‌وواز لە چێژو خۆشی ژیان دەهێنێت، لەبەرئەوەی کاتێك بە دیداری خودا شاد دەبێت، خودا لێی ڕازی بێت‌و لە گوناهەکانی خۆش بێت‌و کەم‌و کوریەکانی داپۆشێت.. خودای گەورەش گەڕانەوەو پەشیمانی بەندەکانی زۆر لە لا خۆشە..

لە صەحیحی موسلیم‌و بوخاریدا هاتووە: کە ئافرەتێکی خەڵکی مەدینە لە هاوەڵان، شووی کرد بوو ، تووشی‌وەسوەسەی شەیتان دێت‌و لەگەڵ پیاوێکداو دوور لە چاوی خەڵکی بەیەکەوە کۆدەبنەوەو شەیتانیش دەبێتە سێیەمیان.. شەیتان‌وازی لێنەهێنان هەتا زیناو داوێن پیسی لە لا جوان کردن‌و تاوان‌و سەرپێچی بۆ ڕازاندنەوەو تووشی ئەو گوناهە گەورەیەی کردن..

کاتێك تەواو بوون.. شەیتانوازی لێهێنان.. ئافرەتەکە گریاو سەرزەنشتی خۆی کردو ژیانی لە لا تەنگو تاریك بوو.. تاوانەکەی لە هەر چوارلاوە دەوریدا.. هەتا گەیشتە ئەوەی گوناهەکە دڵی هەڵقرچاند..

ئەم ئافرەتە خۆی بۆ نەگیراو هات بۆ لای پزیشکی دڵەکان ﷺو لە بەردەمیدا راوەستاو پاشان لە تاو ئازاری تاوانەکەی هاواری کردووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تووشی زینا بووم‌و پاکم بکەرەوە.. پێغەمبەری نازدار ﷺ پشتی تێکرد.. ئافرەتەکە لە لایەکی ترەوە هات بۆ لایووتی: زینام کردووەو پاکم بکەرەوە.. بە هەمان شێوە پێغەمبەری خودا ﷺ پشتی تێکرد، بۆئەوەی ئافرەتەکە لە نێوان خۆیو خودادا پەشیمان بێتەوە..

ئافرەتەکە رۆیشت، بەڵام تاوانەکە دڵو دەروونی خوارد بوو.. بۆیە ئارامی لەبەر برا بوو.. بۆ رۆژی دوایی هاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پاکم بکەرەوە.. پێغەمبەری خودا ﷺ پشتی تێکردەوە.. ئافرەتەکە لە تاو گەرمیو ئازاری دڵی هاواری کردووتی: سوێند بە خودا بە هۆی زیناوە دوو گیانم..

پێغەمبەری خودا ﷺ لایکردەوە بە لایداو پێی فەرموو: ئایا نارۆی تا لە دایك دەبێت؟! ئافرەتەکە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچوو.. رۆی بەرەوماڵەوە.. خۆی پەلکێش دەکردو خەمەکەی زۆر گەورە بوو.. لاشەی لاواز ببوو.. چاوی بەردەوام بە فرمێسك تەڕ بوو.. رۆژو کاتی دەژمارد.. ئازارەکان ئازاری تریان دروست دەکرد..

کاتێك نۆ مانگ تێپەری.. ژانی منداڵ بوون گرتی..بەردەوام لە ئازاردا دەتلایەوە.. هەتا منداڵەکە لە دایك بوو، کاتێك منداڵەکەی بوو، چاوەرێی کاتی دیاریکراوی نەکرد بۆئەوەی پاك بێتەوە.. بۆئەوەی ئازارو ژانی منداڵبوونی برەوێتەوە.. بەڵکو یەکسەر لە جێگەکەی هەستاو منداڵەکەی هەڵگرتو چوو بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺو منداڵەکەی لە بەردەمیدا داناووتی: ئەوەتا منداڵەکەم بوو.. ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەی پاکم بکەرەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ سەیری ئافرەتەکەی کرد، بینی لەوپەری هیلاکیو ماندوێتیدایە.. سەیری منداڵەکەشی کرد.. منداڵێکی ساوای ناو بێشکە بوو.. لەبەر دەستی دایکیدا کەوت بوو..فەرمووی: برۆ شیری پێبدە، هەتا ئەو کاتەی لە شیر دەبرێتەوە..

ئافرەتەکە رۆیشتو ماوەی دوو ساڵ دیار نەماو لەگەڵ جگەرگۆشەکەیدا دەژیا.. لە باوەشیدا ئەمدیوو ئەودیوی پێدەکرد.. بە فرمێسکی چاوی روخساری بۆ دەشۆری.. بە

تێروانینەکانیماڵئاوایی لێدەکرد.. کاتێك لە شیر برایەوە، جلو بەرگی بۆ لەبەرکردو لەگەڵ منداڵەکەیدا لە ماڵ دەرچوو.. پارچەیەك نانیش لە دەستی منداڵەکەیدا بوو.. بەیەکەوە هاتن.. هەتا گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەتا لە شیر براوەتەوەو خواردن دەخوات.. دەی پاکم بکەرەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ منداڵەکەی دا بە پیاوێكو پاشان فەرمانی بە خەڵکەکە کرد، کە بەردبارانی بکەن..

بەڵێ.. بەردبارانیان کرد هەتا مرد.. مرد.. کفن کراو نێژرا.. پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا نوێژی لە سەر بکاتو فەرمووی: بە ڕاستی تەوبەیەکی کرد کە باشتر بوو لە تەوبە کردنی حەفتا کەسی خەڵکی مەدینە.. ئایا لەم پەشیمانیە جوانترو باشترت بینیوە؟!

مرد.. بەڵێ، گیانی خۆی بە قوربانی لێخۆشبوونی خودای پەروەردگار کرد..

مرد.. خۆشبەختیو سەربەرزی بۆ ئەو.. تووشی زینا بوو.. فریشتە بەڕێزەکان بینیان.. بەڵام کاتێك سەرابی دروێنەی خۆشی تاوانەکە بەسەرچوو.. تەنها ئازارو ئاهو حەسرەتەکەی مایەوە.. بیری لەو کاتە دەکردەوە، کە ئەندامەکانی لاشەی شایەدی لە سەر دەدەن.. شایەدی ئەنجامدانی زینای لە سەر دەدەن.. شایەدی ئەو قاچانەی کە هەنگاوی بەرەو تاوانو خراپەو گوناه پێنان.. شایەدی دەستەکانی.. شایەدی ئەو زمانەی کە لەو کاتەدا قسەی پێکرد بوو..

بەڵێ.. هەموو ئەندامەکانی لاشەی شایەدی لە سەر دەدەن.. بیری گەرمی ئاگری کەوتەوە.. بیری ئەو ڕۆژەی کەوتەوە، کە ئافرەتە زیناکارەکان لە ناو ئاگردا بە دەماری پاژنەی پێیان هەڵدەواسرێنو بە قامچی ئاسنین لێیان دەدرێت.. کاتێکیش لە تاو ئازارو لێدان هاوار دەکەن، فریشتەیەك پێیان دەڵێت: ئەو کاتەی پێدەکەنیت، دەنگی هاواروناڵەتان لە کوێ بوو؟! دڵخۆش بوویتو گاڵتەت بە چاودێری خودا دەهاتو شەرمت لێنەدەکرد!!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (يا أمة محمد والله إِنَّهُ لا أحد أغير من الله، أن تزنيٍ عبده، أو تزني أمته، يا أمة محمد، والله لو تعلمون ما أعلم، لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً). متفق عليه. واتە: (ئەی ئوممەتی موحەممەد سوێند بە خودا هیچ کەسێك وەکو خودای پەروەردگار، خاوەن غیرە نیە، کاتێك پیاوێك یان ئافرەتێك زینا دەکات، ئەی ئوممەتی موحەممەد سوێند بە خودا ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بیزانن، ئەوا کەم پێدەکەنینو زۆر دەگریان)..

بەڵێ.. ئەم ئافرەتە تەوبەیەکی کرد، ئەگەر بە سەر نەتەوەیەکدا بەش بکرایە



بەشی دەکردن..

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەم ئافرەتە شوویشی کردووەو کەسیش نەیتوانیووە ئازاری بدات‌و بیکوژێت.. خۆی بە ئارەزووی خۆی دانیناوە بە تاوانەکەیداو نەیویستووە بە گوناهەوە بچێتە خزمەت پەروەردگار.. بە پێچەوانەی ئێستاوە، کە هەر تاوانێك بەرامبەر بە ئافرەتان بکرێت پەنجەی تاوان ئاڕاستەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکرێت، لە کاتێکدا کەوانیەو ئەمەش باشترین نموونە بوو، کە باسمان کرد..

## لە کۆتاییدا، ئەی گەوهەرو مرواری..

* خوشکی ئازیز، چەندوشەیەك بە گوێتدا دەچرپێنم.. هیوادارم پێش ئەوەی بگات بە گوێت، لە دەرگای دڵە پاکەکەت بدات..

* خوشکی ئازیز، زۆری کەسانی تاوانکار لە خشتەت نەبەن.. ئەوانەی کەمتەرخەمی دەکەن لە باڵاپۆشیدا فریوت نەدەن.. یان ئەو ئافرەتانەی کە لەگەڵ لاواندا تێکەڵ دەبن.. یان پەیوەست بوون بە خەیاڵ‌و عیشق‌و ئەوینی درۆینە، تەفرەت نەدەن..

ئەوانە مەکە بە پێشەنگ کە هەموو خۆزگەو ئاواتیان بریتیە لە شانۆو فیلم.. ئەوانەی ئەژین بەبێ هیچ ئامانج‌و هیوایەك.. بە ڕاشکاوی پێت دەڵێم: ئێمە لە کات‌و ساتێکدا دەژین، کە خراپە زۆر زۆر بووە.. ئازارو نارەحەتیەکان جۆراوجۆرن.. هەندێك تاوان چاو گیرۆدە دەکات.. هەندێکی تر گوێ سەرگەردان دەکات.. هەندێکی تر خراپەو تاوانت لە لا ئاسان دەکەن.. هەندێکی تر بەرەو ماڵ‌و سامانی حەرامت دەبەن.. هەتا نزیکە حاڵمان‌وەك ئەو حاڵەی لێبێت، کە پێغەمبەری خودا ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرموێت: (فإن وراءكم أيام الصبر، الصبر فيهنّ كبقض على الجمر، للعامل فيهنّ أجر خمسين منكم، يعمل مثل عمله، قالوا: يا رسول الله أومنهم؟ قال: بل منكم). رواه الترمذي.واتە: (لە دوای ئێوە ڕۆژانی ئارام گرتن هەیە، کە ئارام گرتن لەو ڕۆژانەداوەك ئەوەوایە، کە پشکۆ بە لەپی دەستیان بگرن، پاداشتی کەسی چاکەکارو باوەڕدار لەو ڕۆژەدا، بەقەد پاداشتی پەنجا کەسە لە ئێوە، کرداری ئەو کەسە هەروەك کرداری ئێوەوایە، هاوەڵان فەرموویان: پاداشتیان بەقەد پەنجا کەسە لە خۆیان؟! پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: نەخێر پاداشتی پەنجا کەسی هەیە لە ئێوە)..

پاداشتی چاکەکاران لە کۆتایی ژیاندا ئاوا گەورەیە، چونکە چاکەکاران لەو ڕۆژەدا

نامۆو غەریبن لە نێوان خراپەکاراندا..

بەڵێ.. نامۆو غەریبن.. خەڵکی گوێ لە گۆرانی دەگرن، ئەم گوێ ناگرێتو دووردەکەوێتەوە.. خەڵکی سەیری کاری نارەواو حەرام دەکەن، ئەم چاوی دادەخات.. خەڵکی دەکەونە ناو بێباوەڕیو جادوگەریەوە، ئەمیش بەردەوامە لە سەر یەکتاپەرستی..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (بدأ الإسلام غريباً.. وسيعود غريباً كما بدأ). رواه مسلم. واتە: (ئیسلام سەرەتا بە نامۆیی دەستی پێکردو بڵاوبووەوە.. لە ڕۆژانی دوایشدا وەکو سەرەتا نامۆو غەریب دەبێتەوە)..

خۆزگەمان بەو کەسە نامۆو غەریبانە.. بەڵێ.. خۆزگەمان پێیان..

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (إنه لا يأتي عليكم زمان إلا الذي بعده شرّ منه حتى تلقوا ربكم). رواه البخاري.واتە: (هیچ کاتو زەمانێك نایەت، هەتاوای لێدێت ئەو کاتو زەمانەی لەوەی پێش خۆی خراپتر دەبێت، هەتا ئەو ڕۆژەی دەگەنەوە بە پەروەردگارتان)..

هەروەها دەفەرموێت: خودای گەورە فەرموویەتی: (و عزتي لا أجمع على عبدي خوفين، وأجمع له أمنين، إذا أمنني في الدنيا، أخفته يوم القيامة، وإذا خافني في الدنيا، أمنته يوم القيامة).رواه البزار. واتە: (سوێند بە گەورەیی خۆم، دوو ترس لە سەر هیچ بەندەیەك کۆناکەمەوە، هەروەها دوو ئارامیشی لە سەر کۆناکەمەوە، ئەگەر لە دونیادا لێم دڵنیا بێت، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا دەیترسێنم، وە ئەگەر لە دونیادا لێم ترساو ترسی منی لە دڵدا هەبوو، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا ئارامی پێدەبەخشمو لە ترس دەیپارێزم)..

بەڵێ.. ئەوەی لە دونیادا ترسی خودای لە دڵدا بێت، لە ڕۆژی دواییدا خودا ئارامیو دڵنیایی پێدەبەخشێتو دڵخۆشو شادومان دەبێت بە دیداری خودای میهرەبانو بەهەشتی پێدەبەخشرێتو خودای پەروەردگاریش لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ★ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ★ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ★ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الطور/٢٥-٢٨ واتە: (بەهەشتیەکان ڕوو دەکەنە یەکتریو پرسیار لە یەکتری دەکەن★ ئەڵێن: بە ڕاستی ئێمە پێشتر لە ناو کەسو کارماندا لە خواترس بووین★ ئەوەتا خودا منەتی نا بە سەرماندا، وە لە سزای دۆزەخ پاراستینی★ بە ڕاستی ئێمە لەمەوپێش خودامان پەرستو هاوارمان لێدەکرد،

به ڕاستی ئەو چاکەکارێکی میهرەبانە)..

بەڵام ئەو کەسەی هەر خەریکی تاوان‌و گوناه بووە..

ئەو کەسەی هەموو ئاواتێکی هەر تێرکردنی سك‌و داوێنی بووە..

لە دونیادا هەرگیز ترسی خودای لە دڵدا نەبووە.. ئەوا بە دڵنیاییەوە لە ڕۆژی دواییدا لە ترس‌و دڵە ڕاوکێدا دەبێت.. هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴾ الشورى/٢٢ واتە: (تۆ ستەمکاران دەبینی زۆر دەترسن لە تاو ئەوەی کردوویانە، بێگومان ئەو سزایە هەر دوچاریان دەبێت،وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، لە ناو باخچەکانی بەهەشتێکدان، لە لایەن پەروەردگاریانەوە هەرچیان بوێ بۆیان ئامادەیە، ئەوەیە چاکەو بەخششی زۆر گەورە)..

★ دەی خوشکی بەڕێز تەنها خودا پشتیوانت بێت‌و هەر پشتیش بەو ببەستە.. بە زۆری شکستخواردووان خۆت فریو مەدە.. زۆری خراپەکاران‌و کەمی ئافرەتانی خۆڕاگرو چاکەخواز ساردت نەکەنەوە هەرگیز بێ هیوا مەبە.. داوامان‌وایە خودای گەورە بتپارێزێت‌و لە ئافرەتانی ئیماندارت بگێڕێت‌و بتکات بەو ئافرەتانەی کە بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ ئاینی خودا..

★ تۆی بەڕێز هەر خوشکی ئێمەی، ئەگەر ئامۆژگاریەکانیشمان‌وەرنەگریت.. ئێمە خۆشی‌و بەختەوەریمان بۆ تۆی بەڕێز دەوێت‌و پشت بە خودا بە درێژایی شەوو ڕۆژ دۆعای خێرت بۆ دەکەین‌و لە خودا دەپاڕێینەوە بۆت‌و هەرگیز هیوا براویش نابین لێت، هیواشمان‌وایە خودای گەورە ئەم هەوڵەمان بەزایە نەدات، کە لەگەڵ تۆی بەڕێزدا داومانەو هیچ پشتیوانێکیشمان نیە، تەنها خودای پەروەردگار نەبێت..

## ناوەڕۆك

# شەیدا

* چل قوتابی دەبوون.. لە قۆناغی دووەمی زانكۆدا بوون.. پرسیارم لێكردنو پێم وتن: خێزانەكانی پێغەمبەری خوداﷺ ناویان چی بوو؟ یەكێكیان وتی: ئامینە..
یەكێكی تریان وتی فاطمە..
لەم كاتەدا دڵم پڕ بوو.. فرمێسكو ئەسرین لە چاوەكانمدا قەتیس مان..بیری ئەم ئایەتەی پەروەردگارم كەوتەوە كە دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾..

* بەشێك لەم پەرتووكەی بەردەستت، پەیامێكە بۆ خوشكو برا لاوەكان.. بۆ ئەوەی پێغەمبەرەكەیان باشتر بناسن..

* ئەو پێغەمبەرەی كە پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾..

* بە هەڵەداوان ڕایان دەكردو پەشۆكا بوونو دەیان وت: كوا پزیشك؟! نەشتەرەكان بێنن.. خێراكەن بەنجەكە بێنن..

* هەموو دەیان وت: مەترسە، نەشتەرگەرییەكی سوكو ئاسانە..

* ئێستا دڵی شەیدایەك لەت دەكەن، كە ئارەزوو یاری بە شادەمارەكانی كردووەو دونیا لە كونو قوژبنی دڵیدا ڕەگی داكوتاوە.. گەورەترین تارماییش كە لێی دەترسێت، دێوەزمەو تارمایی مەرگە..

* دڵێكی تریش لەت دەكرێت، بەڵام ئەم دڵەیان بە خودای پەروەردگارەوە پەیوەستە.. ناخو دەروونی لێوانلێوە لە خۆشەویستی پەروەردگار.. ڕووی داواكارییەكانی تەنها دەكاتە پەروەردگار، بە هەموو قەزاو قەدەرێكیشی ڕازییە..

* لە بەریتانیا: خەریكی خوێندن بووم.. پیرێژنێك دراوسێمان بوو.. تەمەنی حەفتا ساڵێك دەبوو.. پشتی بە تەواوی چەمی بۆوە، لەگەڵ ئەمانەشدا بە تەنها دەژیا.. كەسێك نەبوو، سۆزێكی بۆ دەرببڕێت..

* لە ئەفەریقا: لە خێوەتگەی ئاوارەكان، بۆ بەیانییەكەی چووم بۆ لای بیرێك.. لە ناویاندا، ئافرەتێكی سپی پێستی قژزەردی گەنجم بینی!!!

* خوشكی ئازیز: ئەو كەسانەی، كە باسی مافو ئازادی ئافرەتان دەكەن، بۆ ڕۆژێك گوێمان لێ نەبوو، باسی ئافرەتە بێوەژنەكان بكەن؟! بۆ داوای مافی ئافرەتە نەخۆشو كەم ئەندامەكان ناكەن؟! بۆ داوا لە كوڕو كچە لاوەكان ناكەن، بۆ ئەوەی ڕێزی دایكو پورو نەنكەكانیان بگرن؟!

ئەمانەو چەندان ئامۆژگاری و ڕووداوی ڕاستەقینە، لە پەرتووكی (**شەیدا**)دا بخوێنەرەوە..

د.محەمەد عەریفی
Arefe5@yahoo.com